# ژیانی کوردەواری

کورتە باسێکی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و رۆشنبیری و فۆلکلۆری نەتەوەی کوردە .

( تۆما بوا ) نووسیویەتی

ئاواز زەنگەنە ، لە فەرەنسی یەوە کردوویەتی بە عەرەبی .

حەمە سەعید حەمە کریم ، لە عەرەبی یەوە کردوویەتی بە کوردی .

## تێبینی :

١ ـ ئەو پەراوێزانەی ژمارەیان بۆ دانراوە پەراوێزی وەرگێڕی عەرەبین و ئەوانەشی نیشانەی ئەستێرەیان بۆ دانراوە پەراوێزی خۆمن .

٢ـ ئەو وێنانەی لە کتێبەکەدان بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ژیانی کوردەواری ئەو سەردەمەی نووسەر باسی ئەکاو ئەم سەردەمەی خۆمان خۆم دامناوون .

حمه سعید حمه كريم

# پێشەکی

وەرگێڕان لەخۆیدا هونەرەو گرنگیەکی شیاوی پڕ بە پێستی خۆی پێ ئەدرێتو بەشێکی یەکجار گرنگی ئەدەبە چونکە ڕۆشنبیری نوسەرانو ئەدەبەکەیان بە موتوربەکردنی ڕۆشنبیری جیهانو ئەدەبی گەلانی جیهان ئەبێت پەرەئاسێنێو ناگاتە ئەو ڕادەیەی کە ئەدەبی وڵاتانی پێشکەوتووی گەیشتۆتێ ٠

مرۆڤ لەسەرەتای ژیانیەوە تێکەڵ خوازبووەو پێ بەپێی گەشەسەندنو گۆرانی قۆناغەکانی کۆمەڵەکەش شارستانیەتی گۆڕاوەو گەشەی سەندوە ، ئاشکراشە کە ئەدەبیش لقێکی ئەم شارستانێتی یەیەو ، بۆ سود وەرگرتنیش لەشارستانێتیو کەلەپوری نەتەوایەتی کۆمەڵانی تر وەرگێڕان بووە کاری گرنگو پێویستی سەردەم ٠ کوردیش وەکو زۆربەی زۆری نەتەوەکانی تری سەر ڕوی زەمین چونکە مێژوەکەی لەتەمومژدایە ئەدەبەکەشی هەروایەو بەشی زۆری ئەدەبی نوسراوی کەوتۆتە بەر لێشاوی بیرچونەوەو فەوتاندنو ، ئەوەشی هەندێ جار بەدەستیەوە مابێ نوسینی ڕۆژهەڵات ناسەکانە ٠

ئەم کتێبەی کەوا لەبەردەستی خوێنەرانی بەڕێزدایە ئاشکرایە پاش ڕەنجێکی تەواو هاتۆتە کایەوە ، پاش ئەوەی کە لە زمـانی فەرەنسی‌یەوە وەرگێڕاوەتە سەرزمانی‌عەرەبی لەوانەشە زۆربەی ڕۆشنبیران بڵێن : پێویستی نەئەکرد ئەم ئەرکە لەگەڵ ئەم کتێبەدا بکێشرێت‌و وەربگێڕرێتە سەر زمانی کوردی ، چونکـە زۆربەی زۆری ڕۆشـنبیرانی کـورد سەرچاوەی ڕۆشـنبیرێتی‌یان لـەو کتێبانەوەیە کە بەزمانی عەرەبی نوسراونەتەوە ، لەگەڵ زانینی ئەو ڕاستیەشدا ڕۆشنبیرانی دڵسۆز ئەبێ بزانن کە بەچاپکردنی کتێبێکی کوردی کەلەبەرێکی بچوکی کتێبخانەی کوردی ئەگیرێت‌و وەرگێڕان‌و چاپکردنی ئەم کتێبەش بەزمانی کوردی هەروایەو ئەم ڕۆژهەڵاتناسە فەرەنسیەش بە خوێنەرانی کورد ئەناسێنێت ، دیسان وا لەو ڕۆشنبیرانەش ئەکات کە زمانی بێگانە ئەزانن ، قۆڵی لێ‌هەڵماڵن‌و بەپێی توانـای خۆیان هەندێ شـتی بەسـود وەربگێڕنە سەر زمانە خۆشەویستەکەمان ، بەتایبەتی ئەوانەی کە ئێمە دەربارەیان شارەزاییمان نیە •

کاری ئەم ڕۆژهەڵاتناسانەش تا بڵێی شایانی بایەخ پێدانە ، چونکە لەپێناوی بەدیهێنانی باسـەکانیاندا ئـەرکێکی زۆریان کێشاوە،هەرچەندە نوسینی زۆر بەشیان بەئاشکرا ڕەگەزپەرستی تیا دەرئـەکەوێت ، لەگەڵ ئەرەشـداو هەرچۆنێکیش بێت هـەر سوودبەخشـە چونکـە لەهەنـدێ لایەنەوە نەتەوەکەمانیـان بە نەتەوەکانی تری جیهان ناساندوەو کوردیشیان بە گەلێك داناوە وەکو هەموو گەلەکانی تری سەر ڕوی زەمین •

ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسیش «تۆماپوا» ئەم کتێبەی نوسیوەو، ناوەرۆکی کتێبـەکەشی دەربـارەی کوردستان‌و چـۆنێتی ژیانی کوردەواری‌و باری ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و ڕژێمی کۆمەڵایەتی •••

هتد ، باس ئـەکات ، گەر تەماشای ناوەرۆکی ئەم کتێبـە بکەین هەندێ شت ڕەچاو ئەکەین کە لەوانەیە لای کۆمەڵی گەنجانی ئەم سەردەمەمان زۆر دەرکەوتوو نەبێت ، هەروەها هەندێ شتیشی وای تیا باسکراوە ، تەنانەت لە کوێرە لادێکانی سـەر سنووریشـدا ناویان نەماوە ، ئینجا نەخوازە لەو شارانەدا کە ئێستا بوونەتە مەڵبەندی ڕۆشنبیری ، هەر بۆ ئەوەشە کە وەرگێڕی ئەم کتێبە بۆ زمانی کوردی ڕەنجێکی زۆری داوە بۆ دروستکردنی پەراوێز بۆ کتێبەکە ئەویش بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ شت کە ئێستا لەناودا نیە یاخود زۆر دەمێکە لەناو چووە ، هەروەها لە ڕاستکردنەوەی هەندێ باسیشدا درێغی نەکردووە •

وتمان لـەم کتێبەدا زۆر لایەنی دواکەوتـوویی کوردستانو گەلی کوردی تیا لـە قەڵەم دراوە ، بـەڵام ئەبێ ئەوەشـمان لەبیر نەچێت ، ئەگـەر لە چاوێکی ڕەگەزپەرستیەوە سـەیری نەتەوەی کورد نەکرایێتو بەڕاستی ئەم شتانە نووسرابن ئەوا جیاوازیەکی یەکجار گەورە بەدی ئەکەینو ئەو گەشە سەندنو پێشکەوتنەی کە نەتەوەی کورد لە نێوان چەند ساڵێکی کەمدا بەدیی‌هێناوە ئاشکرا ئەبێت ، کە ئەوەش جێی شانازیی نەتەوەکەمانە کە لە ماوەیەکی کەمدا هـەوڵو تەقەلایەکی چـاکی داوە لە پێنـاوی پێشکەوتنو گەشەکردنی سەردەمدا •

ئەمیرە محەممەد ئەمین
مامۆستای زمـانو ئەدەبی کوردی
لە ناوەندیی نەورۆزی کچان
لە سلێمانی
١٩٧٩

# کوردستان

کوردستان ئەو وڵاتە بێسنوورەیە کە کوردەکانی تیا ئەژی ، ئەم ناوە لە چەند سەدەیەکدا بە ناوچەیەکی فراوان ئەوترا کە تا رادەیەك لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمانەدا گۆڕاوە • ئەمڕۆش کوردستان بەشێوەی رەسمی لەسەر نەخشە چاپکراوەکانی تورکیا لابراوە ، لەکاتێکدا کە لەسەردەمی عوسمانیدا دەرکەوتووبووە ، بەڵام لە ئێران کوردستان* ناوی شارێکە لە ڕۆژئاوای تهراندا کە تەنها کوردەکانی ئێران خۆیشیانی تیا جێنایێتەوە ، وە بەتەواوی ئەکەوێتە ناوجەرگەی ئاسیای بچووکەوە،وە بریتیە لەبڕبڕە پشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست•لەلایەکەوە بەشی زۆری ناوچەی شاخاوی نێوان دەریای ڕەشو بەری (نێوان دوو ڕووبار) (بين النهرين) ئەگرێتەوە ، لەلایەکیتریشەوە ئەنتی تۆرۆسو بەرزاییەکانی ئێران ئەگرێتەوە ، وە ئەم ناوچەیە بەگوێرەی بیرکردنەوەو خەیاڵ لە مانگ یان لە داس ئەچێت ، ڕووبەرەکەی بەقەدەر نزیکەی ڕووبەری فەرەنسا ئەبێت ، وە ئەچێتە ناو بەشێکی زۆر لە خاکی تورکیاو عێراقو ئێران ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گەلەی کە لەم ناوچەیەدا ئەژی بەناوی خۆیەوە ناوئەبرێتو بە شانازیەوە ڕەگەزو زمانو مێژووی خۆی جیایە لەگەڵ تورکو فارسو عەرەبدا •

---

★ مەبەست لە شاری سنەی ئێستایە کە لە ئێران بە کوردستان ناوئەبرێ •

## ١ ـ سروشتی کوردستان :

زنجیره چیــای تۆرۆس‌و زاگرۆس نزیکه‌ی بڕبــڕه پشتی ئه‌م وولاته ئه‌گرێته‌وه ، که بریتیه له خاکێکی به‌رزی جوان‌و ئه‌توانرێ له‌سه‌ر هه‌ندێ له لوتکه به‌رزه‌کانیه‌وه بڕوانرێ به‌سه‌ر ناوچه‌کانی ده‌وروپشتیدا ، ئاراراتی گه‌وره‌ش که که‌شتی‌یه‌که‌ی نوحی له‌سه‌ر ره‌ستا به‌رزی‌یه‌که‌ی لــه ٥٠٠٠ هه‌زارمه‌تر زیاتــره ، هه‌روه‌ها به‌رزی چیای جودی که داوای هه‌مان شه‌ره‌ف ئه‌کات ٢٠٠٠ مه‌تره وه ئه‌مرووداغ ٣٠٠٠ مه‌تــر به‌رزه ، بــه‌لام سپیان که لــه زۆر گۆرانیی کوردیدا ناوی ئه‌برێت به‌رزی‌یه‌که‌ی ئه‌گاته ٣٥٠٠مه‌تر له عێراقیشدا به‌رزی پیره‌مه‌گــروون ئه‌گاته ٣٠٠٠ مه‌تر ده زۆربه‌ی ڕۆژانی سال سه‌ر لوتکه‌کانی به‌فر دای‌پۆشیون ٠

له ناوه‌ڕاستی کوردستانه‌وه هه‌ردوو ڕوباری دیجله‌و فورات سه‌رچاوه‌و په‌له بلاوه‌کانیان وه‌رئه‌گرن ٠ چه‌می مرادصو ، خابور. هه‌ردوو زێ ، دیالی (ســیروان) که به نێوان چیــاکاندا تێ‌ئه‌په‌ڕن جوانیه‌کی یه‌کجــار زۆر ئه‌ده‌ن به ناوچه‌که‌و هه‌روه‌ها گــه‌لێ له دۆڵه به‌پیته‌کانی ئاوئه‌ده‌ن ٠ ئه‌م په‌لانه به‌رانبه‌ر قه‌مچوپێچه‌کانی فورات ئه‌بنه‌وه ، هه‌روه‌کو له ده‌شتی تۆرفه‌دا به‌دی ئه‌که‌ین یان له دیجله له‌ناوچه‌ی دیاربه‌کرو جه‌زیره ئه‌ی‌بینین ، وه له دۆڵی مۆش‌و له دۆڵه‌کانی هه‌ردوو زێ به‌ده‌وری هه‌ولێردا دیارن ، که‌وابوو ئه‌م ولاته له جوانیدا هیچی که‌متر نیه له‌جوانی سروشتی ده‌وروپشتی ئه‌گه‌ر به‌راورد کــرا له‌گه‌ڵیدا به‌جۆرێکی‌وا منــالانیش گۆرانی هه‌ڵئه‌ده‌ن به‌جــوانی‌ی ولاته‌که‌یاندا : گوڵــه‌کانی (ئه‌خماخان) ، سێوی (مه‌لاتیه) ، تــرێی (سنجار)و وێنه‌ی زۆر له‌مانــه قه‌دپاڵی دارستان‌و به‌رداوی‌یه‌کانی چیای ( سپیان ــ خه‌لات )یان دروست کردووه ٠



سروشتی کوردستان له زستاندا

ئەو کانیانەی کەلە(بینگول)(۱) هەڵئەقوڵێن‌و هەوای بەفراوی چیاکان‌و باخچەکانی مەریوان‌و ئەو چەمانەی کە بەناو دێیەکاندا تێئەپەڕن‌و ئەو هەموو میوە زۆرە لە هەموو ناوچەکانداو لوتکەی چیای قەندیل کە بەفر دای‌پۆشیوە ، لەناوچەکاندا خاڵی بەراورد کردن جۆراوجۆر ئەکەن بەجۆرێك کە لەوانەیە سەرسام بیت لەو جوانیە ئەگەر گۆرانی‌بێژ لەنیگای لادێیەکەوە زۆر بەپەرۆشەوە باسی جوانی خۆشەویستەکەی بکات ، وەکو ئەڵێت :

**ئامۆزا چاوەکانت تیشك‌و ئاگرن**

**لەسەرچاوەکانی ئەخماخان ئەچن**

**ئەڵێی ئاسکیت**

**لەنێوان گونەکانی ئەخماخاندا**

**تۆ ئەو گونە شاخاویە جوانەیت کە خاوەنی گوڵاوی بێ‌پایانی**

**لەژێر تیشکی قژە ئاڵتوونیەکەتدا خۆت‌شاردۆتەوە ٠**

**پەلکەکانی قژت ئەچێت بەم‌لاولادا**

**هەروەکو شنە فێنکەکەی ئەخماخان ٠**

بەڵام هەموو شتێك لەم وڵاتەدا شاعیرانە نیە هەوا زۆرسەختە، کاتێك بەفر سەر لوتکەکان دائەپۆشێت لەگەڵ سەرمایەکی زۆراو ئەو شەپۆلە گەرما توندەی کە هەڵئەکاتە سەر ناوچەکانی خوارو، هەروەها بارانیش هەر بەردەوامە لەمانگی تشرینی دووەمەوە هەتا نیسان‌و هۆ سروشتیەکانی‌تر ، وایان لەم کوردە شاخاویانە کردوە کە ببنە پیاوانی خاوەن هێزو بازوو ٠

---

(۱) بینگوڵ : وشـەیەکی تورکییە ، مانـای (هەزار گۆم) یان (هـەزار گوڵ) ئەگرێتەوە ٠

## ٢ ـ سەرچاوەی ئابووری کوردستان :

هەتا ئێستاش هەندێ لە هۆزەکان دەوارنشینن ، لە وەرزی هاویندا کوردەکان ئەو دەشتانە بەجێ ئەهێڵن کە وشك ئەکەن، سەر ئەکەونە سەر ئەو گردۆلکانەی کە لەوەڕگان [کوێستان] ، یان ئەچن بۆ لەوەڕگای سەر چیاکان کە لەوێ گیای تەڕو زۆریان دەست ئەکەوێت‌و ئیشتیهای ئاژەڵەکانیان ئەکاتەوە •

هەندێ لە مەڕەکانیان نزیکەی (٨٠سم) بەرزە کە (١٥سم) بەرزترە لە باشترین ئاژەڵی ناوچەکانی فەرەنسا لە (بری)و (بوس) Brie ' Beauce • کوردەکان هەمیشە خەریکی شوانین‌و بە یەکێك لە ئیشە چاکەکانیانی دائەنێن ، چونکە ڕێگەیان ئەدات لەژێر ئاسمانە فراوانەکانی خوادا بەسەربەستی بژین •

چەندەها نموونەی خۆش خۆش گفتوگۆکانیان ئەڕازێنێتەوە، کە ڕاستی تێڕوانین‌و تێبینیەکانیان دەربارەی ئاژەڵەکانیان دەرئەخات ، وە هەر لەو کاتەیشدا بەرانبەر بوونەوەیەکە بۆژیانی کۆمەڵایەتیان ، وەکو لە هەندێ لەپەندەکانیاندا ئەڵێن :

**بەرانی چاك هەر لە بەردەرگای گەوڕەکەیدا ئەناسرێت •**

**حەقی بەرانی بێ‌شاخ بەسەر بەرانی شاخدارەوە نامێنێ* •**

**سەد مەڕ ئەچنە ژێر سێبەری درەختێك •**

**مەڕی لەڕان دواکەوتوو گورگ ئەیخوات* •**

**کاتێ باوی بزن نامێنێت ، گیسك ئەیێتە شوانی ڕان •**

---

★ لە کوردەواریا ئەڵێن «خوا حەقی بزنی بێ‌شاخ بەسەر بزنی شاخدارەوە نامێڵێت» •



هەندێك لە هونەری نیشە دەستی‌یەکانی
کوردەواری

کـورد گرنـگیەکی زۆری داوە بـە ڕاو ، لەنـاو هەسـتیا

پاراستوویەتی ، چونکە چیاکانی پڕن لە ورچو گورگ‌و بەرازی کێوی‌و نێچیری‌تر کە پەڕو مووی وردیان هەیە وەکو کەوو مراوی دەشتی کە لەو ناوچەیەدا زۆرن‌و قەوارەشیان بچووکە •

لە ڕاسـتیدا ئەمڕۆ بـەشی زۆری کـوردەکان وازیـان لە کۆچەری‌یەتی‌و بەخێوکردنی مەڕو مالآت هێناوە ، وە بەشی زۆری هۆزەکانیان لە دێ بچووکەکاندا ئەژین •

دیهاتی کوردستان دلگیرو ئاسۆ فراوانن ، ماڵەکانی‌یان یەك لە پەنای یەکداو بەبێ شەقام ڕێك‌خراون ، وان لەپاڵ چەمێکدا کە بە درەختی چنارو بی گەورە یان درەختی گوێزی جوان سێبەریان کراوە ، ماسی‌ی چاکیش لەناو چەمەکەدایە ، وە منالآنیش بەوپەڕی خۆشیەوە لەچەمـەکەدا مەلە ئەکەن ، لەکاتێکدا ژنانیش بـە جلە ڕەنگاوڕەنگ‌و ئالآو والآکانیانەوە کەلوپەلەکانیان ئەشۆرن •

دێ دەورە دراوە بەچـەند کێلگەیەك کە لە باشـترین شێوەدا کشتوکاڵی تیا بەدی ئەکرێ • چونکە کورد زەوی‌ی خۆش‌ئەوێت ، وە لە کاتێکدا زەوی بەش نەکات‌و کەم‌بێت ، ئیتر جوتیاری کورد هونەر بـەکار ئەهێنێ لە دروست‌کردنی تەلآندا* ، کـە ئەتوانێ زەرات‌و گاڵ‌و تۆوکەتانی تیابچێنێت •

چاندنی برنج سەرکەوتووەو تورتن بە سامانەکانی ئەم ولآتە

---

★ لە کوردەواریا ئەڵێن «مەڕی ناوەکی گورگ ئەیخوات» •

★ تەلآن : بەو پارچە زەوییانە ئەوترێ کە جوتیاری کورد لەقەدپاڵی چیاکاندا لە بەردو دار پاکیان ئەکاتەوەو لەکشتوکاڵدا بەکاریان ئەهێنێ •

دائەنرێت ، مێـویش باشترین تـرێ ئەگرێو بەرهەمێـکی باشی هەیەو چەشنی وای هەیە کە شەرابی لێدەرئەهێنرێت •

لە زۆر کاتداو لەسەر جێگایەکی سەختی چیاکان پاشماوەی گەورە گەورەی قەڵاکان بەدی ئەکرێت کە لە سەدەکانی پێشوو لە سەردەمی ئاغـا سەربەخۆکاندا دروست کراون ، وە هەنـدێ لەم قەڵایانەش لەمێژوودا دەوری گرنگی خۆیان بینیوەو داستانەکانیان تێکەڵاو بوون بە سەرگورشتە ڕاسـتەقینەکانو لەمانەوە چیرۆکو هۆنراوەی سواری وەرگیراون کە ئەمڕۆ گۆرانی بێژان لە ئاهەنگی شەوانیاندا ئەیانڵێنـەوە ، وەکو چـیرۆکی بەناوبـانگی (قەڵای دمدم) •

کەواتە وڵاتەکە لەوپەڕی جوانیدایەو ئایا لەڕاستیشدا وەکو هۆنراوەکانی دەوڵەمەندە •

وەکو وتمـان زۆربەی ناوچەکانی کوردسـتان شاخاوییە ، وڵاتی شاخاویش چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت کە زۆر دەوڵەمەند بێت ، لەگـەڵ ئەوەشدا ئەبینین کە چاندنی گەنمو جـۆو برنجو توتن لە دۆڵەکاندا گەلێ بایەخی پێ دراوەو درەختی بەرداریشی زۆرە وەکو سێو هەرمێو هەڵوژەو قۆخو قەیسیو مێوی جۆراو جۆر •

بە شـێوەیەکی گشـتی مـەڕ بەخێوکـردن بـە یـەکێ لـە سەرچاوە گرنگە ئابووریـیـەکانی کوردستان دائەنرێت ، چونکە سوودێـکی زۆر وەرئەگـرن لە خـوریو پێستو شـیرو کەرەو پەنیرەکەی •

چیاکانیش بەدارستانێکی‌چڕ لەداربەڕووی سەوز داپۆشراون کە بەرهەمی گزگلیان هەیە* ، یان لە خەڵوز دروستکردندا بەکار

---

* گزگل لەبەرهەمی داربەڕوو نیە ، بەلکو لەبەرهەمی دارێکی‌ترە کە پێی‌ئەڵێن مازوار (دارمازوو) •

ئەهێنرێت • هەروەها سەروو و سنەوبەریشی هەر تیایە ، بەڵام لە ڕاستیدا هەتا ئێستاش بەکار نەهێنراون •

لە ناوچەی زاخۆ چەندەها کانی دەرهێنانی خەڵووزی بەردین هەیە ، وە لە ئەرگانی (Ergani) مس دەرئەهێنرێت ، وە لە پالو لەسـەر لێـوارەکانی (وان)و (عەقـرە)یش هـەر لێی دۆزراوەتەوە •

هەروەها ئاسنی پاك لە نزیك (مادن) لە (گیچی)و لە ناوچەی (ئامێدی) هەیـە ، قورقوشمیش لە نزیك (مادن)و لـە ناوچەکانی (وان)و (کیمیاه) (Kemah) هەیە •

هەروەها کـانی پاکی ئاڵتوون‌و زیو لە نزیـك دیاربەکرەوە دۆزراوەتەوە ، بەڵام یەکێ لە سامانە گەورەکانی کوردستان ئەو سامانە نێوەیە کەهەیەتی ، وەلەتورکیا نەوتی گارزان (Garzan) هەیە کە لە (بەتمان)و بیرەکانی (رامانداغ) لە ناوچەی (سعرت) (siirt) دەرئەهێنـرێت ، وە لە خوارووی ڕۆژئـاوای ئێرانیش کورد نەوتێکی‌تـری هەیە • دوای ئەمانـە ئایا ئەبێ بپرسـین کە کوردستان دەوڵەمەندە یان نا ؟!

## ٣ ـ شارەکانی کوردستان :

١ لە کوردستاندا شـار کەمە بەتایبەتی شاری گـەورە ، بەڵام بەشی زۆریان لە شوێنی جوانا دروستکـراون ، وەکو لە تورکیا (ئەرزروم) هەیە کە لە گۆشەیەکی گرنـگی ڕۆژهەڵاتی ئەنازۆڵ دایە وە (٩٠ر٠٠٠) کەسی تیا دائەنیشێت کە پیرۆزی خووڕەوشت‌و بیروباوەڕی ئـاینی پێشـوویان پاراسـتووە ، وە (بـەتلیس) کە بەهۆی مێژووەکەیەوە ئەتوانین ناوی بنێین چەقی کوردستان ، وە لە بـەرزایی (١٥٠٠) مەترەوە لەسـەر ڕووی دەریاو لـە بەردی

بومەلەرزە بنیاتنـراوە وە (١٠٠٠٠) سـەربازی یۆنـانی بە سەرۆکایەتی‌ی زەینەفوون بەوێدا تێپەڕبوون ، هەروەها دیاربەکر لەسەر دیجلەو قەلآ کۆنەکانی ڕۆمـان ، وە (وان) لەسەر لێواری دەریاچەیەکی خوێیاوی کە لە دەریای مردوو ئەچێت‌و نیشتمانی (سەمیر ئەمیس) بووە ، [ئیلازک‌و(٢) مەلاتیەو ماردین‌و جەزیرە] •

لەئێرانیش (ساوج‌بولاق)(٣) ئەوشارەیە کە کوردەکان ناویان نا (مەهاباد) کە مانای مانگە ، یان شاری میدیەکان ، وە سەنەندەج (سنەو سەقزو کرماشان) مەڵبەنـدی سەرەکی کۆبوونەوەی بەشی زۆری دانیشتوانن •

شاری [سلێمانی]ش لە عێـراقدا ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە (٥٠٠٠٠) کەس‌و بە گرنگترین مەڵبەندی ڕۆشنبیری‌و پیشەسازی دائەنرێت • (هەولێر)یش خاوەنی قەلآیەکی جوانەو ئەسکەندەری زوالقەرنەینی تیا سەرکەوتووە بەسەر داریوش‌دا • ئەمەش وەکو شوێن‌و جێـگای ئاشێـدی‌و عەقرە وایە کـە هەردووکیان لـە قەلآ ئەچن •

(ڕەواندز) لە ڕووی دانیشتووانەوە گرنگییەکی وای نیە ، بەڵام لە ڕووی چیاکانیەوە دەرکەوتووە •

هەروەها زاخۆو دهۆک کە بێستانی زۆریان لێ‌یەو نیشانەن بۆ چالاکی ئیشوکاری دانیشتوانیان ، وە سەرسەنگ‌و صلاح‌الدین کە هەردووکیان بە مەڵبەندی هاوینەهەوار دائەنرێن‌و لەجوانیدا بەرانبەر جوانترین شوێنی لوبنان ڕائەوەستن •

دانیشتوانی ئەم شارانە هەموویان لەسەر بازرگانی‌ی بچووك یان ئیشی دەست وەکو چنین‌و دروستکردنی قاڵی‌و نەوگ ئەژین، وە زۆر لـە کوردەکان لـە ئیشـوکاری بەربەسـتی دوکـان یان

(٢) ئیلازك ناوی شارێکی تورکییەو مانای خۆشەویستە •
(٣) سابڵاغی ئێستا •

کارگەکانی پاڵاوتنی نەوتی کەرکوکدا نیشیان کردووە ٠
زۆر جار پرسیار ئەکرێت کە ئایا کوردەکان زۆرن ؟ ئیتر وەڵامی ئـەم پرسیارە بەرێك‌وپێکی شتێکی ئاسان نیـە ، ئەویش بەهۆی ئەو سەرژمێریانەوەیە کەمیرییە دەسەڵاتدارەکان ئەیکەن‌و بەڕاستی باسی جیاوازی نەتەوایەتی تیاناکەن ٠
هەندێ لە لایەنە ڕۆژئاواییـەکان چەند ژمارەیەکی کۆنیان دیاری کردووە کە ئەگەڕێتەوە بۆ پێش نیو سەدە یان زیاتر ، کە کوردەکان دائەنێت بە ٢ تا ٣ ملیۆن کەس ، ئەمیش بەتەواوی بڕوا پێکراو نیە ٠ هەروەها کـوردە نەتەوەییەکان ژمارەی خۆیانیان داناوە بە ١٢ ملیـۆن کەس کە ئەمیش نیشانەی ڕاسـتی تەواوی نیە ، وە ئەتوانین بێ دوودڵی نزیك‌ببینەوە لەو هەڵەیە کە زۆری پێوە نـراوە ئەگەر هاتوو وتمان سەرجەمی ژمـارەی کوردەکان ئەگاتە ٩ تا ١٠ ملیۆن کەس ، کە بەلای کەمەوە ٦ ملیۆنیان وان لە تورکیا ٠
دەربارەی ئەو ژمارەی دوایی کەس ناتوانێ بڵێ لە سنوور چۆتە دەرەوە چونکە خوێندنەوەی سەرژمێری دانیشتوانی ژمارە (٤٤٤)ی ساڵی ١٩٦٠ وەکو نیشانەیەك وایە بۆ ئەمە ٠ کورتەی باسەکە ئەوەیە کە سەرجەمی ژمارەی کوردەکان ئەگاتە سەرجەمی ژمارەی دانیشتوانی عێراق‌و لوبنان‌و ئەردەن‌و کوەیت بەیەکەوە ٠
دوای ئەم کورتە باسە دەربـارەی ڕەگەزو بنەڕەت ئامانجی لاپەڕەکانی داهاتوو ئەوەیە کە باسی گەلی ئەم وڵاتە جوانە بکات، کە لەوانەیە لە شێوە ڕاستیەکەیا بەدی نەکرابێت یان نەناسرابێت، وەباسی سروشتی کوردەکان ئەکەین لەتێو ئیشوکاری ڕۆژانەیاندا، وەکو ئیشـوکاری خێـزانی‌و پیشـەیی‌و بـیروڕای ئابـووری‌و کۆمەلایەتی‌و ئاینی‌و ڕۆشنبیرییان ٠



دێیەکی کوردەواری

## لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی گەلی کورد

نەژادی گەلی کورد بە یەکێك لەو تەنگوچەڵەمانە ئەژمێررێت کە مێــژوو نووسەکان لـە پێش ئێستــەدا پێویستیــان پێ داوە ، وە لەم ڕووەوە چەند ڕایەك دانراوەو هاتۆتەکایەوە .

لەڕاستیشدا باسەکە هەتا بڵێی ئاڵۆزە ، وە چەند نووسەرێك لە ڕووســیا تێکۆشــاون بۆ ئـەوەی ڕووناکییەکی بخـەنە سەر بەتایبەتی مینۆرسکیو نیکیتینو فیلچیفسکی ، وە هەندێکی تریش هەستیان کردووە کە پاڵیان پێوە ئەنرێت بۆ ڕووناك کردنەوەی ئەم باسە . ئێمەش هەوڵ ئەدەین بەیارمەتی باسە زانیارییەکانی ئەوان بچــین بە دوایاناو مەسەلەکە ڕوون بکەینەوە ، بــە خستنە ڕووی ئـەو بەڵگانەی کە لــە مێژوو و زانـــستی کەلەپوورەکانو زانستی زمــانو زانستی نەتــەوەکانەوە وەرگــیراون ، ئەمەیش ڕێگای ئەوەمان لێناگرێت کە بیر بکەینەوە بۆ ئەوەی بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەڵێت کوردەکانی ئەمــڕۆ لە چەند ڕەگەزێك پێك هاتوون لەنێوان چەند سەدەیەکدا یەکیان گرتووە ، وە مێژوو و ژیانی کۆمەڵایــەتی وایان لەم گەلە ڕۆژهەڵاتیە کــردووە کە بە ئاشکرا ببنە ڕەگەزێکو نەتەوەیەکی جیاواز .

### ١ ــ لە ئەفسانەوە بۆ مێژوو :

هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دانیشتوانی (دەماوەند)

ئاهەنگیان ئەگێـڕا ــ گومانیشی تێدا نیە کە هەتا ئێستاش هەر ئاهەنگ ئەگێـڕن بەبۆنەی جەژنێکەوە کە پێی ئەڵێن جەژنی کورد* • ئـەم جەژنە یادی سەرکەوتنی (فەرەیـدون)* ئەکاتەوە بەسەر زوحـاکی زۆردارا یان (ئەژ ـد ەهاك) کە مانـای پیاوی خاوەن [گەنە ڕەوشتە] •

زوحاکیش ئـەو پیاوە بووە کە لە سوریاوە هاتـووەو شەڕی لەگەڵ شای ئێرانی ئەفسانەیی بەناوبانگ (جمشیدا) (Djamchid) کردووە ، کە جمشید مانای ڕوناککەرەوەیە ، وە لە جێگاکەی چۆتە سەرتەخت • بەڵام زوحاك تووشی برینێکی پیس بووە لەسـەر هەردوو شانی کـە وەکو ئەژدەهـا وابوون ، گومانیشی تێدانەبووە کە ئەمە پاداشتی ناڕەسەنی خۆی بووە ، وە بۆ ئـەوەی ئەم ناپیاوە چـاك ببێتەوە بـەشی زۆری پزیشـکەکان شارەزاییو توانای خۆیان خـستۆتە کار • لێرەدا شەیتان خۆی تێهەڵقورتـاندووە بۆ ئەوەی ئێشـەکەی دابمرکێنێتـەوە ، وای ڕاسپاردووە کە هەموو ڕۆژێ مێشکی گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بخاتە سەر برینەکانی شانی بۆ ئەوە یئەژدەهاکانی پێبلەوەڕێن • بەم شـێوە ژمارەیەك قوربانیدرا ، هەتا ئەوڕۆژەی کـە هەردوو چێشتکەرەکەی (ئەرمایل)و (کورمایل) کە زامی ئەم دڕندەیەیان تیمار ئەکرد ، هەستیان کرد کە پێویستە لەسەریان یارمەتی ئەم بێتاوانانە بـدەن ، ئەویش بـە گۆڕینی مێشکی گەنجـەکانە بە مێشکی مەڕ ، ئیتر ئەوەی تۆبەی ئەهات ئەبووایە هەڵبهاتایە بۆ سەر چیاکان ، وە لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمانەدا ئەم ڕاکردووانە لەناو خۆیاندا ژنو ژنخوازیان کردووەو بوون بە باووباپیری ئەو

---

★ نووسەر لێرەدا مەبەستی لە جەژنی نەورۆزە •

★ ئێرەشدا نووسەر مەبەستی لە کاوەی ئاسنگەرە •

کوردانەی کە هەر بەشاخاوی ماونەتەوەو ڕاهاتوون لەسەر ژیانی کشتوکاڵیو بەخێوکردنی ئاژەڵ ، وە ئەوانە هیچ ژیانێکی ئامەزراوی چەسپاویان نەزانیوە ، چونکە ئەبینی خانووەکانیان دەوارن • دوای ئەوەی فەرەیدون سەرکەوت بەسەر زوحاکدا لەسەر لوتکەی دەماوەندو لەسەر ئاگرێکی بچووک بەزنجیر بەستیانەوە هەتا مرد ، هەروەکو مردنەکەی ( برۆمیثوس ) (Promethee)لەسەر چیای قەفقاس • ئەمە ئەو داستانەیە کە فیردەوسی لە شانامە [مێژووی پادشاکانی فارس]دا باسی کردووە • بەلام ئەم داستانە لەوانەیە ئەو کەسانە ڕازی نەکات کە ئەڵێن نەژادی کوردەکان شتێکی سادەیە • لەڕاستیا ئەم کەلە زۆر بەئازا ناسراونو هەندێ لە نووسەرە کۆنەکانی عەرەب کەیشتوونەتە ئەوەی کە بڵێن (کوردەکان لەڕەگەزی جنۆکەن)* • کە نەژادیشیان زۆر بەباشی ناسراوە • ئەوەتا سلێمان پاشای گەورە لە کەلەپووری ڕۆژهەڵاتدا یادگاری هەر ماوە ، وەکو ئەڵێن لە کوردستاندا گەلێك ئاساوەی بەجێ هێشتووە ، ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم پاشایە ویستویەتی ژمارەی ژنەکانی زۆربکات ، فەرمانی داوە بگەڕێن بە ڕۆژئاوادا و (٥٠٠) کچی جوانی بۆ پەیدا بکەن ، بەلام بۆ بەدبەختی ئەوەر لەڕێگای گەڕانەوەیاندا تووشی جنۆکە ئەبنو شەیتان هاتنی جنۆکە ئەدات دەستدرێژی‌یان لێ بکەن ، کاتێك سلێمان پاشا هەواڵی ئەم دەستدرێژی‌یەی بیست بۆسەر شەرەفی،

---

* ئەم وتەیە بەگوێرەی تیۆرەکانی دروستبوونی بوونەوەرو ئادەمیزاد لەسەر ڕووی زەوی هەرکاتێکیان سەیر بکەیت چ ئاینی‌و چ زانیاری هەر ڕاست نیە چونکە ئێستا بەتەواوی دەرکەوتووە کە هەموو بوونەوەرو ئادەمیزاد چۆن دروست بووە ، ئیتر چۆن بڕوا بەو واتایە ئەکرێت کە بڵێ ڕەگەزی گەلێك جنۆکە بێت کە لەوانەیە جنۆکە هەر لە ڕیزی ژیانی ئادەمیزادا نەبێت •

ئیتر ئەو ژنانەی کە زۆر گرنگیی پێنەدابوون دەریکردن ، بەڵام دوای تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ جنۆکەدا چەند منداڵێکی جوانیان بوو ٠ ئەمانەش بوون بە ڕەگەزی کورد* ٠

گەڕان بەدوای شێوەو دەستووری ناودا هەندێك لەنووسەرانی گەیاندۆتە چەنـد ئەنجامێکی سەیر سەیر ٠ کوردەکان بـوون بە پاڵەوان بە گوێرەی وشەی (کورد) کە وشەیەکی فارسیەو مانای پاڵەوانە ، یان بوون بە گورگ ئەگـەر ناوەکەیان لەگەڵ وشەی (گورگ)دا بەرانبەر بکرێت کە وشەیەکی کوردیو فارسیەو مانای گورگە ٠

ئەمانە هەمـووی زیان بەکەس ناگەیەنێ ، بـەڵام ئەکادیمی سۆڤیەتی [ مارت ] جڵـەوی خەیاڵی شل کردووە ناوی کـوردی لە ناوی (کورت)ی ئەرمەنیەوە نزیك کردۆتەوە ، لەمەشەوە تیورێکی دەربـارەی ڕژێـمی دایـکایەتی(١) دانـا ، ئەمـەش ڕژێمێـکی کۆمەڵایەتیەو لەناو کوردەکانیشا باوە ٠

---

★ ئەم سەرگوزشتەیە لەناخی داستانە پڕوپووچەکانەوە هەڵقوڵاوە ، چونکە هەر لە دروستبوونی بوونەوەرەوە هەتا ئەمڕۆ بەگوێرەی هەموو ڕاو تیورەکانی دروستبوونی ئادەمیـزاد نەبیـنـراوە کە جنۆکە لەگەڵ ئافرەتـدا تێکەڵاو بیێو منالی بیێو شتیوا بەهیچ جۆرێ ناگونجێ لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی ئەمڕۆدا ٠

(١) پرۆگرامی دایکایەتی لەناو هەندێك گەلدا ڕەوشتێکە کە بە گوێرەی ئەوە دایك ناوی خۆی ئەدات بە منالەکانیو دەسەڵاتی ناومالیش ئەدرێ بە دایك ٠ بۆ نموونەیش لە کوردستانی عێراقو ئێران تیرەیەك هەیە بە ناوی «مەنگوڕ» کە پەلوپۆی زۆری لێبۆتەوەو پیاوەکانیان بە ناوی دایکیانەوە ناوئەنرێنو بەوەوە ئەناسرێنو شانازیشی پێوەئەکەن وەکو «برایمی فاتە ، حەمەی ئایشێ، سوارەی ئاسکێ ، خولەی ئامە ، ئەحەی پوورە ئایشێ ، عەزەی فاتە کەچەڵ ٠٠٠٠ هتد» ٠

هەرچۆنێك بێت زۆری پێوە ئەنرێت ، ئەگەر بڵێن کوردەکان شانازی بەوەوە ئەکەن کە پاڵەوانن ، یان ڕازیبین بەوەی کە بە گورگیان دابنێن ، ئەم کوردانە لــە زۆر کاتدا بەدبەختن • وەکو جگەرخوێنی شاعیر ئەڵێت • کورد ڕازی‌نابن بەوەی کە بە پیاوی بێ‌ورەیـــان تێ بـــگەن ، نەبـــوون‌و ناش‌بـــن‌و هەرگیـــز وایشیان لێ‌نایەت •

بەڵام ئەگەر داستانە ئەفسانەییەکانی ناو جەماوەرو زانستی وەرگرتنی وشەکان زیادوکەم مانایان نەیێتو ڕێگا بدەن بەوەی کە هەندێ جیاوازی کەسایەتی تایبەتی کورد دیاری بکرێت ، ئەوە ئیتر تێپەڕ نەبێت بەبێ ئەوەی دان بنێت بەو ناتەواوییانەدا کە لە ڕەگەزی ڕاستەقینەی کوردا ڕوو ئەدەن •

## ٢ ـ لەنێوان مێژوو و کەلەپوردا :

شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە کە ئەو ناوچەیەی ئەمڕۆ کوردی تیا ئەژی پێی ئەڵێن کوردستان‌و لەسەردەمی چەندەها نەوەی کۆنەوە ئاوەدان بووە ، ئەویش لەو پشکنینەدا دەرئەکەوێت کە دەستەیەك لە زانکۆی شیکاغۆ لە ساڵی ١٩٦١دا کردوویانە •

ئەشکەوتی [ بەردەپـــلکە و هەزارمێرد] کە لـــە سلێمانی‌یەوە نزیکن‌و پاشماوەی سەردەمی مەستیرین ، یان (شانەدەر) لە نزیك ڕەواندزەوە ، کـــە یەکەمین پەیکەری ئێسکی ئادەمیـــزادی چاخی بەردینی لە عێراقدا تیا دۆزرایەوە ، ئەیچەسپێنێ کە ئەم وڵاتە لە پێش هەزارەها ساڵەوە ئاوەدان بووە •

لەسەر خاکی (هەزارمێرد) پاشماوەی خواردەمەنی‌ی کۆنترین ئادەمیزاد دۆزرایەوە ، ئەویش بە دۆزینەوەی ئێسکی کەروێشك‌و کەڵەکێوی‌و ئاسك‌و بزن‌و پەسامەو کەوو هەموو ئەوگیان‌لەبەرانەی

که ڕاویـان کردوون ، هـەروەها سـەدەفی گرگراگەیی کـە بۆ خواردەمەنی ڕۆژانەیان کۆیان ئەکردنەوە ٠

(چەرمۆ) دێیەکە لە دۆڵی چەمچـەماڵداو کۆنترین دێیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەویش بۆتە هۆی ئەوەی کەببێتە یەکێك لەو مەڵبەندانەی کە بۆ یەکەمجار ئادەمیزاد چەند جۆرێك گەنمو جۆو ، هەروەهـا نۆكو نیسكو تۆوی کەتانیش کـە پێش لەدایك بوون (زاینی) بە ۲ هەزار ساڵ لـە گردەکانی کوردستاندا سەوز بووە تیا بچێنرێت ٠ هەروەها بەرهەمی زەیتوونو بادەمو بستەو هەنجیرو ترێیش لەپێش کشتوکاڵکردندا هەر هەبوون ٠

هەروەها بەخێوکردنی ئاژەڵیش باوبووە ، وا دەرئەکەوێت کە لەپێش ۲۵۰۰ سـالا پێش زاینی مانگاو بەراز لـە ناوچەکەدا ماڵینەبوون ، بەلام هەر لەبەر گۆشتەکەی بەخێو ئەکران ، ئیتر خوریەکەیان لا گرنگ نەبوو ٠

بزنیش هەر لەزووەوەو پێش ٤٠٠٠ساڵ لەمەوبەر ناسراوە٠ لەپێشانا سـەگیش هەبووە بـەلام نەخـوراوە ، بەڵکو ئـەو گیان لەبەرانە خـوراوون کە لەشێوەی ئەمدا بوون ، وەکـو گورگو ڕێوی لە دێی (گوندۆك) لەنزیك عەقرە لەعێراق ٠

لەناو ئەشکەوتی قەشەجاندا کە گاورەکان بە گوێرەی قسەی (لایارد) (Layard) ئەشکەوتی (ماریۆحەننا)ی پێ ئەڵێن گەلێك هەڵکەنـراوی سـەر بەردیـان دۆزیوەتەوە کـە ئەگەڕێتـەوە بۆ سەردەمێك کە لەوانەیە دانیشتووانی ئـەو ناوچەیە کشتوکاڵیان نەزانیبێ ، لەکاتێکـدا کە ئاژەڵی ماڵیش کەمبووە ، هـەر لەوێدا دیمەنی ڕاوێـك ئەبینین کە گرنگیەکی سەیری هەیە بـە گوێرەی

ڕای تۆفیق وەهبی(٥) هەر وەکو ئەو وێنەو هەڵکەنراوانەی پێش مێژوو وان کە لە ئەشکەوتەکانی فەرەنسادا هەن ، لەلایەکی ترەوە گەلێك پەیکەری گەورە گەورە هەیە کە بەزۆری ئەدرێنە پاڵ پاڵەوانەکان یا جنۆکەکان ٠

لە هەر چوار لای کوردستانی ئێستادا پاشماوەی قەڵاکان لە سەر بەردە سەختەکان بەدی ئەکرێن ، کۆنی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە ناوچەی (ئورامار)ەوە هەتا ئەگاتە چیای جودی کە کەشتی یەکەی نوحی لەسەر وەستا دەرئەکەوێت ٠ شارستانێتی ئەکەدی لە نازۆ(٦) لەیۆرغان تەپە لەسەر چیای ئەزین لە پیرەمەگرون کە کەشتی یەکەی گلگامشی لێ وەستا دیارە ٠

ساڵی ٢٠٠٠ پێش زاینی (نارام ــ سین)ی پاشای ئەکەد لە دەربەند گاوردا سەرکەوت بەسەر (ساتۆنی) پاشای لۆلۆدا ٠ ئەم لۆلۆیانە کە لە زاگرۆس دائەنیشن باوباپیری کوردەکانن ، هەروەها ئەو گۆتیانەش کە لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی زێی بچوك لە نزیك ڕوبـاری دیالەوە دائەنیشن بە باوباپیری کوردەکان دائەنرێن ٠

سەرجۆنی ئەکەدی هەوڵی ئەوەی داوە کە خۆی بپارێزێت لە هێرشی ئەوود اگیرکەرە تاڵانکەرانەی کە جارجار سەرکردەی لەشکرەکانیان ژن بوون ٠ کاشیەکانیش بە دەوری خۆیان بەرەنگاری کوڕەکەی حامورابی بوونەوەو بەسەلامەتی چوونە بابل ، خۆیان تەرخان کردبوو وەکو کرێکارو کاروانچی هەوڵیان

---

(٥) تۆفیق وەهبی : مامۆستاو زمانەوانێکی کوردە ، چەند بیروڕایەکی دامەزراوی هەیە کە هەموو زاناکانی جیهان لایان پەسەندبووەو ئێستا لە لەندەن دائەنیشێ ٠

(٦) یاخود (نوزی) ٠

ئەدا هەتا لە سەدەی حەڤدەهەمی پێش زاینیدا گەیشتنە ئەوپەڕی بەهێزی‌یان‌و توانیــان ئــەو ناوچەیــە داگــیر بکەن کــە ئەمڕۆ (لوڕستان)ی پێ ئەڵێــن‌و بەدرێژایی ماوەی شەش ســەدە فەرمان ڕەوایی بابلیــان کردووە • ئــەم داگیرکەرانە هێــزو توانایەکی نائاساییان هەبووە • ئەو ئەسپەی کە لەگەڵ خۆیان هێنابویان بۆ شارەکە لایان بوبو بە نیشانەیەکی خوایی‌و (سوریاش)واتا (ڕۆژ) خوایان بووە ، سەرۆکەکانیان لەگەڵ میتالی‌یەکاندا لەدەوروبەری ســاڵی ٤٥٠دا کچەکانیــان بەژن‌و ژنخــواز شــویان کــردوە بە فیرعەونەکان •

لەگــۆرە بڕۆنزیەکانی لورســتاندا گەلێ قاپ‌و قاچــاغیان دۆزیەوە کە کاشیەکان لەگەڵ خۆیان هێنابوویان•کاتێك پاشــکانی عیلام لەسەدەی دوانزەهەمدا وازیان لەدورخســتنەوەی ئەمــانە هێنا ئیتر دەوریان هەبوو لەپێك‌هێنانی گەلی کوردا ، چونکە وا ئەزانرێ کە ئەمانە هۆزێکی میدی بوون ، دوای ئەوە ئاشوریەکان هەر کە لەگەڵ میدیەکاندا تێك‌چوون ئیتر یەکسەر لەکوردستاندا هاتنە سەر دەور •

ئەرشاکــسافراستیان‌ی ئەرمەنی دانەری(کوردو کوردستان) لە ساڵی ١٩٤٨دا نەبوونی میدیەکانی دوپات کردۆتەوەو وتەیەتی ئەمانــە هەرگیــز نەبــوون ، تەنها لەچەنــد ووتــەیەکی کەمی هێرۆدوتدا نەبێ • بەگوێرەی وتەی دانەر،میدیەکان بۆ یەکەمجار بەهۆی نوسینێکەوە لەمێژوودا دەرکەوتون کە یادی سەرکەوتنی شەلمنەسەری یەکەمی بەسەر (یانگۆ)ی لایەنگریدا کردۆتەوە کە فەرمانڕەوای نامــر ــ کوردستانی ئەمڕۆ بووەو لەوکاتــەدا لێی باخی بووە •

لەدەوروبەری ساڵی (١١٠٠)دا (تکلات ــ فلاسەر)ی یەکەم

شەڕی لەگەڵدا کردنو (شەمس ئەدەد) بەزۆر سەرانەی لێ‌سەندون هەر لەو کاتـــەدا (ئەدەدنیراری) ســێیەم مێردی سەمیر ئەمیســی ئەفسانە سەرکردایەتی گەلێــك هێرشی کــردوە لەدژی ئەمان • بەڵام (تکلات فلاسەر)ی چوارەم کە لەسەدەی هەشــتەمدا (٧٤٤) کەلکی لەتێکچونی هۆزەکان وەرگرت،لەکۆتاییدا دێتو(٠٠٠ ٦٠) کەس بەدیل ئەگرێو تاڵانیەکی گەورەیشی لەمەڕو ماڵات دەست ئەکەوێتو هەتا بچوکترین گۆشەی چیاو دۆڵەکان داگیر ئەکات • دیلەکانی لەدروستکردنی پــرۆژەی ئاوەدانیو ئاشــتیدا بەکار هێناوە •

دوای پانزە ساڵ ، سەرجۆنی دووەم کە شاری خورســابادی بنیات نــاوە ، دەستی گرت بەســەر سامەڕەداو بــە دیلو بێگاری سەرکردایەتی ئەو گەلەی کردوو بەسەر لێوارەکانی خابوردا کە یەکێکە لەلقەکانی فورات بردنی بەرەو شاری میدیەکانو ئەمە لە ئینجیلیشا هەیە ، ئەوەی شایانی باسە هەتا ئەم ساڵانەی دوایش لە کوردستانی عێراقدا گــەلێك دێی جولەکە هەبــووە • (ئەســەر حەدۆنیش) بەدەوری خۆی سەری بەپاشای میدیەکان دانەواندوە لەوانەی کە لە نەینەوادا ئەهاتن بۆلایو بەردی بەنرخو ئەسپیان بۆئەهێنالەجیاتی سەرانە، لەم‌هێرشانەشدا بۆسەر خاکی‌کوردستان ئاشوریەکان گەلێك پاشماوەیان بەجێ‌هێشتوە کە بە توانایی‌و بە هێزیان دەرئەخات لە هەڵکەنراوو نەخشونیگاری (مالاتای) کە لە دهۆکەوە نزیکــە • لەباتاس لەنێوان شــەقلاوەو ڕەوانــدزداو لە دەربەندی وامەکان لەسەر زێو لەدەربەندێکی سروشتیدا لەسەر ڕێگای نێوان نەینەواو وڵاتی فارسدا ئەم پاشماوانە هەر بەرچاو ئەکەون • بــەڵام لەدواییــدا میــدیەکان توانیان لەژێر دەســتی ئاشــوریەکان ڕزگاریــان ببێت ، لەکــاتێکدا کە ســەنحاریب بە

سەرکردایەتی یەکێك لەسەرکردە خراپەکانی کە ناوی (دیوکس) بووە خەریك بوو بەرێکخستنی ناوچەکانی بابل‌و عیلامەوەو هەر لەو کاتەیشدا میدیەکان پیاوی سەر چیای زاگرۆس نەبوون ٠

بێجگە لەچەند هۆزێك نەبێت کە ژیانی کۆچەری‌و دانیشتوی دێهاتی ناخۆشیان لا خۆشبوە ، وە لە دواییدا توانیان خۆیان ڕێك بخەن ـ بە گوێرەی قسەی هیرۆدۆت ئەو سەرۆکەی کە بۆ نمونەی دادپەروەری ئەهێنرایەوە ، ڕۆژێك لەڕۆژان وازی هێنا لەوەی کە کاتی خۆی بە مەحکەمەکردنی یاریدەرەکانیەوە لەسەر ئیشوکاری تایبەتی خۆی بەفیرۆ بدات، بەڵام ئەنجامیش وا چاوەڕوان نەئەکرا کە سەرلەنوێ‌هەموو شێوەکانی گێرەوکێشەو هێرش‌سەرهەڵبدەنەوە بەجۆرێك کە میدیەکان گەیشتنە بیری ئەوەی کە پاشا هەڵبژێرن‌و ئیتر دیوکس‌یان هەڵبژارد ٠

دیۆکس بە پاسەوانی دڵسۆز دەوری خۆی گرت‌و بڕیاری‌دا کە پایتەختەکەی لە هەمەدان دابمەزرێنێ‌و پەنجاوسێ ساڵ فەرمان ڕەوایی کرد ، دوای ئەوە (فراورتیس)ی کوڕی هاتە جێگای ،

ئەم کوڕەی پاشایەتیە بچوکەکانی دەوروپشتی خستە سەر ناوچەکەی‌و لەگەڵ پاشای فارسەکانیشدا شەڕی کرد بەڵام ئاشوریەکان بەرگریان کرد ٠ کوڕەکەیشی تەنها ئەو ئەشکەوتە ئەفسانەییەی کوڕو کچی هەبوو کەلەنزیك دێی (شورتاخە)وە بو (سیکرازی)کوڕی کە یەکێك بوو لەو سەرکردانەی جارجار لەکاتی ئاشتیدا لەسەرکردایەتی شەڕو بەڕێوەبردنی ئیداریدا دەرئەکەوت هاتە سەر دەور ٠ لەجیاتی ئەوەی ئەو سوپایانە کۆبکاتەوە کە سەربەخۆ لەناو هۆزەکاندا شەڕیان ئەکرد ویستی سوپایەکی ڕێك‌و پێك دابمەزرێنێ لەسەر شێوەی سوپای ئاشوریەکان،سەربازەکانی بەتیروکەوان‌و شیر پڕ چەك کردو بەشێوەیەکی تایبەتی گرنگی‌دا

بەسواری‌و لەم دواییەدا سوارەکانی وەکو بارسیەکانیان لێ‌هاتبو، لەسەر بەکارهێنانی کەوان بەباشی ڕای‌هێنابوون‌و ئەیانتـوانی دوژمنەکانیان بە کۆمەڵ تیرباران بـکەن‌و لەو کاتانەدا کە وایان دەرئەخست شکاون‌و ڕایانکردوە ، ئەمەیش ورەی ئەوانی تـری بەرز ئەکردەوە٠ بێ‌گومان ئاگری میدیەکان ترسناك بوو لەدواییدا بەئاگری (جرەیجوری)ناو ئەبراو مانای ئەوەیە ئەو تیرە ئاگرینە لەسەر ئاویش هەر ئەگرێ ٠ وە لە ڕاستیشا میدیەکان تیرەکانیان بەڕۆن‌و نەوتی کولاّو ئاو ئەدا (هەر تیرێك بەم شلەیە ئاو بدرێت بەر هـەرچی شتێك بکەوێ ئەیسـووتێنێ ، بە مـەرجێ لەخاویی شلەکەدا بهاوێژرێ‌و بە کەوانێکی چەرمی خاو بهاوێژرێ ، چونکە هاویشتنی توند سیناتی ئەم شلەیە ناهێلێت ، خۆ ئەگەر ئاویشی بکەیت بەسەردا بۆ کوژاندنەوە ئەوە زیاتر هەڵی ئەگیرسێنێ ٠) میدیەکان لەسێ ناوچەی گەورەدا کۆبونەتەوە وەکو : ـ

١ ـ میدی گەورە ، عێراق‌و عەجەمی ئەمڕۆ ٠

٢ ـ میدی ئەترۆپاتین ، ئازربایجانی تازە ٠

٣ ـ میدی دەوری تارانی ئێستا ، کە ژێردەستەو داگیرکراوەکانی جوولەکەی تیا دروستکرا کە ڕۆفائێل سەرکردایەتیی پاشای (تۆبی‌گەنجی) تیاکردووە ٠

سیکراز ( Cyaxare )هەوڵی داگیرکـردنی نەینەوای دا٠ چونکە گۆڕی ناحوم پێغەمبەر وا لە ئەلقۆش‌و لەماوەی ٥٠ کیلۆ مەترەوە خەڵك ئەم هێرشەی بینیوەو داگیرکەرانیان وەکو گڵپەی ئاگر یان سون‌و گوللە سەیرکردووە ٠ بەلاّم لەم کاتەدا سیسیەکان کوتوپڕ لـەدواوە بەرەنگاری میدیـەکان بوونـەوەو سیکرازیان ناچار کرد کە دەست لە ئابلۆوقەی نەینەوا هەڵبگرێ‌و لەسەرووی دەریاچەی ئورمیەوە بەرگری لـە ناوچەکەی خۆی بکات ٠ لێرەدا

دەستێکی کەوتە ئەملاو دەستێکی کەوتە ئەولا ، لەگەڵ ئەوەشدا لە دواییدا پاشای سیسیەکان (مادیز)و سەرکردە گەورەکانی بانگ کرد بۆ دەعوەتێـكو سەرخۆشیکـردنو سـەریبڕین · چونکە لە دەوروبەری ساڵی ٦٢٦دا ئاشور بانیپاڵ مردبوو ، سیکراز چو بۆ لای (نیوپولاسەر) فەرمـانڕەوای بابلو سوپا میدیـەکەی لەسەر شاخ هێنایـە خوارەوەو لە سـاڵی ٦١٢دا نەینـەوای کاولکرد ، کە هێشتا ئیمپراتۆری ئاشوری زیندوو بوو، ئەم مێژووە بەڵگەدارە بە یەکەم ساڵی مێژووی کورد دائەنرێ ، هەروەکو کوردە نیشتمان پەروەرەکانی ئەمـڕۆ ئەیدەنـە قەڵـەم ، سـاڵی ١٩٦٥ی زاینی بەرانبەر ساڵی (٢٥٧٧) لەڕۆژنامەی کوردیدا · بەڵام ساڵی ٥٤٩ سیرۆسی گـەورە سەرکەوت بەسەر (ئەستیاگث)دا کـە دوا پاشای سەربەخۆی میدیەکان بوو ، هەروەها بەسەر کورە بچووکەکەیدا کە هەمەدانیان (ئەکباتان)ی کرد بەپایتەختی ئێرانی یەکگرتوو · لەڕاستیا لەگەڵ سەرکەوتنی سیروسدا (سەردەمێکی تازە کرایەوە بۆ گەلی فارسی بە یەکگرتنیان لەگەڵ میدیەکاندا) ·

گیرشمان ئەڵێ : (Ghirshman

با ئێسـتاش بەگوێرەی قسەی گیرشمانو بەکـورتی چی لە بارەی میدیەکانەوە ئەزانین باسی بکەین ·

ئەگەر هاتو ویستمان وای دابنێین کە : ڕژێمی سیاسی فەرمان ڕەوایی میدیەکان لە ڕۆشنبیری گیانیو مادییا تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕژێمی سیاسی فەرمانڕەوایی ئاشوریەکان ئەچێت ، ئیتر لەوانەیە لە بەرانبەر ئەمەدا هەموو شتێکمان لێ ونببێت · بەڵام لە ڕووی کاروباری هونەریشەوە میدیەکان هەروەکو خەڵکی وڵاتی یاجوجو ماجوج [السیسین]و سیمیریەکان وان کە بە وردیو شارەزاییەوە گرنگیان داوە بە ڕازانەوەی چـەكو لە دروست کردنی کەلوپەلی

ئەمپدا هونەریان نواندووە ، هەروەها لە دروست کردنی قاپو قاچاغی خواردن لە کانە بەنرخەکانو دوورینی جلوبەرگی چنراوی ڕەنگاوڕەنگ • ڕەنگو ڕوخساری خەڵکی لە نیگارو نەخشەکانی ئاشوریدا دیارن کە پیاوەکانیان ڕیشو سمێڵیان هەیەو جلو بەرگیشیان بەپێستی ئاژەڵ داپۆشراوەو پێڵاوی بەرزو گرێگرێ کە لەدواوە چەماوەتەوە لەپێ ئەکەنو ئەسپ ئەبەن بۆ داگیرکەرانیان •

لەبەر ڕۆشنایی گەنجینەی [سەقز]دا ئەتوانین بیرێك لە هونەریان وەرگرینو لەمەودوا بەچەند بەڵگەیەکیتر ڕوونیان ئەکەینەوە • ئەویش لەبارەی وەرگرتنی شارستانیەتی جۆراو جۆرەوە بەگوێرەی شارستانیەتی ئەو گەلانەی کە داگیریان کردوونو لەمان پێشکەوتووتر بوونو شارستانیەتی [المغیرین]یان هەبووە •

لە هونەری ڕەسەنیان هیچی وامان پێنەگەیشتووە بێجگە لە پاشماوەیەکی کەم نەبێت ، وەکو ئەو شێرە گەورە تێکچووەی کە وا لە هەمەدانو هەندێ گۆڕی بەردین کە یەکێکیان وا لە نزیك شاری (بول)ەوە لەسەر زنجیرەی ڕۆژئاوای زاگرۆس لە (دوکان ـ داود)و لە گەلێ شوێنیتری کوردستاندا هەیە وەکو خوارووی دەریاچەی ئۆرمیە کە گۆڕستانی گەورەو هەڵکەنراو لە دامێنی چیاکان هەیەو گۆڕەکان بە وشەی ئاینی دەرکەوتوو ڕازێنراونەتەوە ، وێنەی زەلامێك کە قولێ لقوپۆپی بەدەستەوەیە کە لە ئاهەنگە ئاینیەکاندا بەکار ئەهێنرێ •

بۆیە دەربارەی میدیەکان کەمێك درێژەماندا بە قسەکانمان چونکە باوباپیری ڕاستەقینەی کوردەکانی ئەمرۆ ئەوانن •

## ٣ ـ زانستی بەراوردکردنی زمانەکانیش وتەی خۆی ئەڵێت :

لەڕاستیا دەربارەی گێرەو کێشەی نەژادی کورد واین لەنێوان دوو بــاس‌دا ، یەکەمین باســەکەی مینــۆرسکی‌یە کــە نەژادی‌یان ئەگێرێتەوە بۆ ڕەگەزی ئێرانی‌یان ـ هندو ئەورووپی‌و ڕای وایە کە لە ســەدەی حەوتــەمی پێش زاینی‌دا لــە ناوچــەی دەریاچەی ئورمیەوە بەرەو بۆتان هاتوون • دووەمیش باسەکەی ئاکادیمی سۆڤێتی ( مار )ە کــە سروشتی دانیشــتووە ڕەســەنەکانی وڵاتی کوردەواری لە ڕێگای ژن‌و ژنخوازی‌یــەوە لەگەڵ گەلەکانی‌تری ئاسیادا دەرخستووە وەکو خلدی‌و جورجی‌و ئەرمەنیەکان •

لەسەر ئــەم بنچینەیەو لەســەر دانانی مەســەلەی دەرخستنی باری زمان‌و مێــژووەوە مینۆرســکی کوردەکان ئەخاتە نێــوان نەتەوەکانی ئێرانەوە بێ‌ئەوەی بڕوانێتە ئەو باسەی تر لەدروست بوونی ڕەگەزە زنجیرییــە تێکەڵاوەکانی ناو کوردا • لەســەدەی پێنجەمــدا ، هیرۆدۆت پێمــان ئەڵێت ، ناوچــەی ســیازدەهەمی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی لەپاڵ ئەرمەنا [پاکتوێکی]یش Paktuiki ئەگرێتەوە ، کە لە ڕۆژهەڵاتدا بریتی بوو لە بوختان یان بۆتانی ئەمڕۆ [کنکریت] کە وڵاتی کاردۆك یان کاردۆخی لێ‌یەو زەینەفون ساڵی ٤٠٠ ـ ٤٠١ پێشــ زاینی لەکاتی گــەڕانەوەیا لەگەڵ ١٠ هەزار سەربازدا قسەی لێ‌کردوە •

هەر لەو کاتەوەو هەر لەو سەرچاوەیەوە ناوێك بڕا بەسەر ئەو ناوچەیەدا کە ئەکەوێتە سەر ڕۆخی چەپی ڕووباری دیجلە لــە نزیك چیای جودی‌یەوە •

وە لەنوسراوە کۆنەکانیشدا ئەم ناوچەیە هەر پێی ئەوترێ [کۆردین]و ئارامیەکانیشــ پێی ئەڵێن [بیت‌گاردو]و بەشــاری جەزیرە ئەڵێن [گازرتاگاردو] •

وە ئەرمەنیەکان هەندێ شتمان بۆ باس ئەکەن لەبارەی وڵاتی کاردۆخەوە کە تا ڕادەیەك لەگەڵ فراوانیشیدا هەر سنوردارە • بەقسەی زەینەفون ئەم کاردۆخیانە ، نە بایەخی دەسەڵاتی پاشا (ئەرتاکسیری)و نە زۆرداری پاشای ئەرمەنیان زانیوە •

هەروەها کاردۆخیەکان باوباپیری کورد نین بەڵکو ئەمانە باوباپیری [جورجیەکانو کارتلیەکانن] ، هەروەکو پرۆفیسۆر (سیی • ئێف لیمان هۆیت)( C. F. Lehmann – Hopte ) باسی ئەکات لەوێدا هەندێ نزیك بونەوە هەیە لەگەڵ خولدیەکاندا یان (توراتور ــ Ourartou )دا ، بەڵام ئەمەی دواییان خوایە نەوەك گەل ، لەلایەکی تریشەوە نە جۆرجیەکانو نە خولدیەکان بەزمانی هندۆ ئەوروپی قسە ناکەن وەکو کوردەکانی ئەمڕۆ بەڵام ئەوە گرنگ نیە ، چونکە [مار] ئەڵێ کورد زۆر بە خێرایی زمانەکەی ئەگۆڕێ •

هەروەها لە (کریتو) یان (کیرتین) باوباپیری کوردەکانمان بینی کە کۆچەری ئەترۆپاتین بوونو لە ساڵی ٢٢٠ی پێش زایینیدا بۆ یەکەمجار [پۆلیب] بە تفەنگچی سوپای فەرمانڕەوای میدیا کە لەگەڵ (سیلوسید ئەنتیکۆس)ی سێیەمدا شەڕیان کردووە ، باسی کردوون • دوای ٣٠ ساڵ چوونەتە ڕیزی خزمەتکردنی (ئەنتیکۆس) خۆیەوەو لە ساڵی ١٧١ لەلای پاشا (پیرگام) بوون بە سەربازی بەکرێگیراو •

دوایئەوە (تیگران)ی گەورە پاشایئەرمینیا (٣٦ــ٨٩) پێش زایینی سەرکردایەتی (٣٥ر٠٠٠) کوردی دیلکراوی کردووە بۆ ڕێگاو پرد دروستکردنو چەم پاككردنەوەو دارستان بڕینو جێبەجێکردنی ئیشوکاریتری شەڕکردن •

لەڕاستیا دانیشتوانی (گۆردین) لە ئەندازیاری دروست

کردنو سوپاییـــەوە گەلێ بەناوبانگ بوون بەجۆرێـــك ئەوەندە بلیمەت بوون کە وێنەیان نەبووە ٠

هەرچۆنێـــك بێت (مینۆرسـکی) وەکو (مار) بـــاسی دەوری میدیەکان ئـــەکات لـــە پێك‌هێنانی نەتـــەوەی کورداو ئـــەم گەلە گرمانجیشی پێ‌ئەوترێ کە ئەم زاراوەیە لە ٣ بەش پێك هاتووە [ Kurd — man — dj ] یان ( کورد ــ مان ــ دج ) بەشی یەکەم هەر لەخۆیـــا ئاشکراو ڕوونە ، سێیەمیش بـــەشی دروست بوونە ، هەروەها پێویـــستە بـــەشی دووەم (man) لەناوی (میـــدیەکان) ، [ ماتای ] یـــان [ مـــادا ]وە نزیك بـــکەینەوەو بێجـــگە لەوەیش میدی‌یەکان کـــاتی خۆی تێکەڵاو بوون لەگـــەڵ ( مانییەکان )و (مانایيەکان)دا کە لە سەدەی نۆهەمی پێش زاینی‌دا لە ناوچەکەدا دەرکەوتوون ٠ کاتی داگیرکردنی نەینەوا لە ساڵی ٦١٢پ.ز لە ناو هاوپەیمانەکانی میـــدیەکان‌دا تاقمێك لە (ماندا) هەبـــووە ، هەر وەکو ئاشوریەکان بەناونانی سیمریەکان‌و سیسیەکان ڕاهاتبوون٠

زاناکانی زمان بڕوایان بەو ڕاستیە چاوەڕوان کراوە هێناوە بۆ ئـــەم نـــاوە جۆراوجۆرانـــە ، وەکـــو (مانـــدا) ، میدیـــەکان‌و مانایيەکان ، مانتیەکان یان ماتیەکان ، مارتیەکان یان مارجیین ٠ لە لایەکی‌تـــرەوە دوای تێ‌پەڕبـــوونی (الکنگریت) یـــان (بۆتان) هێرش هێنرایە سەر دەهەزار سەرباز لەلایەن لەشکرێکی فارسیەوە کە لە مادی‌یەکان‌و ئەرمەن پێك‌هاتبوو ٠ ماردیەکان دراوسێ‌ی کیرتیەکان بوون‌و بوونەتە ڕەگەزی ئەڵمانیەکان ، وە مینۆرسکی بەوە وتـــەکەی کۆتـــایی ئەهێنێ کە ئـــەڵێ [لە ئەنجـــامی گەلێك ڕووداوی مێژوویی‌و جوگرافی ، زۆر لەوانەیە کە نەتەوەی کورد لە تێکەڵاو بوونی دوو هۆز کە لە یەك ڕەگەز پێك‌هاتبن دروست بووبێ کە ئـــەوانیش [ماردوی‌و کیرتـــو]ین کە هەردووکیـــان بە

شێوە زمانێك قسەئەكەن كە زۆر نزیكە لە شێوەی زمانی میدیەوە، لەلایەكی‌تریشەوە زۆر ئاشكرایە كـە لە كاتی هاتنی كوردەكانا بەرەو ڕۆژئاوا گەلێك ڕەگەزی ناوخۆییان تێكەڵاو بووە .

ئیتر زۆر بـاسی باسەكەی (مار) ناكەم كە ئـەڵێ كوردەكان دانیشتووی سەرەكی ناوچە شاخاوی‌یەكانی ئاسیای بچووكن ، سەرەڕای گەلێك نزیك بوونەوەی ئاشكرا لەبابەت تیورەكانیەوە كە لە زەماندا داینـاوون لەسـەر دەستووری ئابووری‌و هۆكانی بەگۆڕا چوونی چینایەتی . كەچی من هەر پێیان ڕازی نابم‌و بەلای منەوە ئەویش نەیتـوانیوە بـگاتە ئەو ئامانجـەی كە بەتەمـای بووە ، سـەرەڕای ئـەوەیش ئەوەی دوپـات كردۆتەوە كە گوایـا گەلێك پەیوەندی لەنێـوان كوردو میدیادا هەیە كە لەڕاسـتیا باسەكەی سنۆرسكی بەهێز ئەكات .

## ٤ ـ زانستی ڕەگەز :

سـەرەڕای ئەو سـەلماندنەی زمانەوانو مێژوو نووسەكان ئەگەر هێشتا ڕەگـەزی گەلی كـورد ئاشكرا نـەبێ ، خۆ ئـەوا زانستی ڕەگەزیش بە هیچ‌جۆرێ بەڵگەی لەوان بڕواپێكراوترمان ناداتێ .

(ئارنی كابیر) (Ariene kappers) لـە سـاڵی ١٩٣١دا دەربارەی كوردەكانی دیمەشق لێكۆڵینەوەیەكی كردووەو گەیشتۆتە ئەوەی كە بڵێ كورد ڕەگەزێكی جیاواز پێك‌ئەهێنێ بێ‌ئەوەی بەربەستی تێكەڵاویی لەگەڵ ڕەگەزەكانی‌تردا بكات .

(كابیر) تێكڕا ئەنجامەكانی ئـەو لێكۆڵینەوەیەی (هوسای) ١٨٨٧ی كۆكردۆتـەوە كە دەربـارەی كوردەكـانی وڵاتی فارس كردبووی ، هەروەهـا ئەنجـامی باسەكەی (شـانتر) ١٨٩٧ كە

دەربارەی کوردەکانی تورکیاو فەرمانڕەوای پەریشان کردبووی•
وەکو وتوویانە کوردی ژووروو بالآبەرزو لاوازن‌و بەهیچ جۆرێ
قەڵەویان نیە ، ، لووتیان درێژو باریکەو زۆرجار قۆقزە ، دەمیان
بچکۆلەیەو دەموچاویان درێژو هێلکەیی‌یە • ئاساییە کە پیاویان
سمێلیان درێژەو هەمیشە ڕیشـیان ئەتاشن • ڕوانینیان قووڵەو
زۆریان قژکاڵن‌و چاویان شینێکی ڕوونە • ئەگەر منالێکی کورد
لەناو چەند منالێکی ئینگلیزدا دانیشێ، لەیەکتری جیاناکرێنەوە،
چونکە ئەویش وەکو ئەوان پێسـتی سپی‌یە ، لەخوارووا هەندێ
جار دەموچاویان گەورەیەو لاشەشیان زۆر قورسترە •

ئەم تێبینییەی خوارەوە هینی [مێجەر سۆن]ە لەساڵی ١٩١٢دا
کە ماوە ئەدات بەوەی وای دابنێین کە کورد شێوەیەکی دامەزراوی
نیە •

لە ڕاستیشـدا باری کـوردی شـاخاوی‌و کـوردی دەشتەکی
هەرچۆن بێت دانیشتووبن یان کۆچـەر ، یان یەکێك بێ سەر بە
هۆزێکی تێکەلاو بە ڕەگەزەکانی‌تر کە بەهۆی ژن‌و ژنخوازی‌یەوە
تێکەلاو بوون ، جیاوازی‌یە دەرکەوتووەکان هەر بەتەواوی بەدی
ئەکـرێن ، هەروەکـو ڕەوشتی عـەرەب ، یەهـودی ، نەستوری‌و
تورکمانی‌و •••• هتد • هەروەکو لەپێشەوە مینۆرسکیش هەستی
پێکردبوو •

لێکۆڵینـەوەکانی [هێنری فیلـد] سـاڵی ١٩٥٢ دەربـارەی
زانستی ڕەگەز ، بەتایبەتی لەناوچەی زاخۆ، ڕەواندز، کەرکوك‌و
سلێمانی ، هەرچەندە ئەمیش هەر هەمـان ئەنجامی دەست کەوت
بەلام زیاتـر بەلای ڕاستی‌دا ئـەچێت • درێـژی‌ی مام‌ناوەندی‌ی
کورد ١٦٦سم بووە ، تا ڕادەیەکیش بالا بەرزو لاق کورت ، ناو
چەوان پان‌و سـەری گەورەو خڕ ، سـەری کورت‌و پـان ، بەلام

قژقزی دەموچــاو مامناوەندییە ، کەمتر لە چوارچێــوەیەکی ئەو زەلامانەی کە تاقی کراونەتەوە پێستیان ئەورووپی بووە ، ئەوانی تریش پێســتیان هینی ولاتی دۆلی (وادی الرافدين) بــووە ، بە زۆریش لــووت چەماوە بووەو ، کورد قژی زۆرترە لــە عەرەبو قژیشی لوولو نەختێك نەرمە ، ڕەنــگی قاوەییەکی تۆخەو چاوی ڕەشە ، قژی کاڵو چاوی شینیشیان هەیە بەتایبەتی لە ناوچەکانی ڕۆژئاوادا • ڕەنــگی پێستی ئەمــان ڕوونترە لە ڕەنــگی پێستی عەرەب . بــەلام جوانیــان کەمتــرە لــە ئاشووریــەکان ، دانیان سروشتییەو زۆر ڕێكوپێکەو بازووشیان بەهێزە ، تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی زۆر باشە بەتایبــەتی ئەوانەی کە گرنگییان پێ ئەدەن •

هێنری فێڵد وێنەی فۆتۆغــرافیو تیشکەکانی ئەوانەی ورد کردبووەوە کە تاقیکردنەوەیان لەسەر کرابوو • تیایاندا چەند جۆرێك ڕەگەزی جۆراوجۆری تیا دۆزیونەتەوە • وەکو ئەرمەن ، بلقانی ، دانیشتووانی ناوچەی گۆمی دەریای سپی ، ئەنازۆلی ، ئێرانیو ئەلبی •

بەلام سەرەڕای ئەم هەموو جیاوازیانە لە لاشەدا کە بەهۆی ئەو تێکەلاوبوونانــەوە لە چەنــد ســەدەیەکدا ڕوویــان داوە ، کوردەکان هەتــا ئێســتاش هــەر زۆرنو ئەوانیش هــەر وەکو گەلەکانیتر کــە ئەشتوانین بلێــین هەموویان ئەگــەر ڕەگەزێکی جیاواز پێك نەهێنــن ، ئەوا ئیتــر بێگومان ڕەگەزێــکی تایبەتی پێك ئەهێننو هەستێکی ڕاستو قووڵیان بە خانەدانیو ڕەسەنیەتی ڕەگەزی خۆیان هەیە •

# ژیانی کوردەواری

لەڕاستیدا کوردەکان سەرەڕای سروشتی گشتییان کە شاخاوین هێشتا بەپێی باری ئابووریان جیاوازی چینایەتییان هەر هەیە ، کە ئەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئیش‌وکارو شوێنی نیشتە جێبوون ، لەگەڵ نیشانەی تایبەتیدا لە ئەنجامی جیاوازیی ڕەگەزو مێژوویان •

## ١ ـ کۆچەرە گەڕۆکەو هۆزە نیشتەجێکان :

لەوانەیە لەناوکوردەکاندا بتوانرێ جیاوازی بکرێت لەنێوان کۆچەرو هۆزە دامەزراوەکاندا کە لادێی‌و شارستانیش ئەگرێتەوە • کۆچەرەکانی کورد تاڕاددەیەك لە کۆچەرەکانی عەرەب ئەچن ، چونکە ئەمان شاخاوین‌و پیاوی بیابان نین‌و ئیشی سەرەکییان بەخێوکردنی ئاژەڵە کەئەویش لەبزن‌و مەڕو گامێش‌و

هەندێ جار ولاخی سواریو زۆر کەمیش لە وشتر تێناپەڕێ ٠

ئەمانە وان لەسـەر بەرزاییـەکانی تورکیا ـ ئەرمـەنیو لە سەرچاوەی ( کورا ) یان لەسەر بەرزایی (ئاراکس) ، مراد صو ، فوراتو گۆمی دەریاچەی (وان ) هەروەها لەسەر دامێنی خواروی تۆرۆس ٠ بەلاّم لەڕاستیدا ئەو کوردانەی کە بەتەواوی کۆچەرن تاڕادەیەك ئەمڕۆ نەماون ، کەواتە ئەمانـە نیوە کۆچەرن چونکە هەموویان خانووی هەمیشەیی‌یان هەیە لە دەشتودۆلّەکاندا کە لە زستاندا دێنەوە ناوی ٠

فەرمانڕەواکان بە گوێرەی توانای خۆیان هەولّ ئەدەن کە کۆچەرو کۆچکـردن کەم بکەنەوە ، بێئەوەی کە هیچ کـاتێ بە ئاسانی سەربکەون بۆ نموونە هێشتا لە عێراقدا کۆچەر لە بەشی (بلباس) لە سلێمانیو (هەرکی) لە هەولێرو (سورچی) لە موصل هەرهەن ٠

بەشی زۆری هۆزەکانی ئێران نیوە کۆچەرنو هەندێ جاریش دامەزراون ، بـەلاّم هەر پارێزگاری هەندێ نـەریتو پرۆگرامی هۆزایەتیی خۆیان ئەکەن ٠

کۆچکردنی هۆزایەتی زۆر جۆراوجۆرە ، بەپێی ئەو ماوەو ڕێگایانەی کە کۆمەلّەکە سەرجەم ئەیگرنە بەر ، زۆرجار هەندێ لە ئەندامانی هۆز لەدواوە لای لەوەڕگاکان (قشلاغ) ئەمێننەوە ، ئەمە لەکاتێکدا کە کۆچکردن بەرەو هاوینە هەوارەکانی [ئیلاخ] بێت ٠ هەنـدێ کاتیتریش ئەنـدامە هەمیشـەییەکان یـان نیوە هەمیشەییەکان لە هاوینەهەوارەکاندا ژمارەیان کەمە ٠

### لامبتون ئەلّێ : Lampetoon

کوردەکانی ڕۆژئاوا بە ناوچە هاوینە هەوارەکانیان ئەلّێن

(زۆزان) یان (کوێستان) ، هۆزە دامەزراوەکان (دێمانی) بەمانای ناوەکە کە پێی بڵێی ڕۆیشتن ـ خۆیان نابەستن بەکۆچکردنەوە، ئەگەر هاتوو لـە لادێکاندا ژیان ئەوا لادێین‌و لەوانەشـە بەهۆی باری ئابووری‌و سیاسیەوە یان بەهۆی تەندروست چاکی‌یەوە بە کۆچەری کـۆن لە دەشـتەکان‌دا مابنـەوەو پێیان ئەڵێـن گامیری (Gamiri) یان بامیری (Bamiri) مانای (باوکە مردووەکان) یان (مانگای مردوو) هەروەهـا گاویستی (Gawesti) مانـــای (مانگای ماندوو) ۰ ئەوەش ئەوە ئەگەیەنێ کە هەندێ لە هۆزەکان بەشە گرنگەکانیان جیائەکەنەوە ، هەندێکیان لەچیاکان‌و هەندێکی تریان لە دەشـتەکان‌دا ۰ ئەمانەیش لە دانیشـتووانی بنەڕەتی‌و سەرەکی وڵاتەکەن ، یان (رایات)ی گاور یان موسوڵمان بوون‌و لە سەردەمـە کۆنەکان‌دا پیاوی هـۆز یان تیرەکان زاڵ بـوون بە سەریانداو سەریان پێ دانەواندوون بۆ بێگارو سەرانەدان ۰

(ئادمۆندز) ئـەڵێ ئەمە لە عێراق پێی‌ئەڵێن (مســکێن) یان (کرمانج) یان (گۆران) کە بـە هەموو مانای وشـەکە بەرانبەرە لەگەڵ ئـەو کـوردانەدا کە لـەبنەڕەتا عەشـایەرین ۰ بۆ ئـەم لادێییانەش ـ ئەگەر تـوانیت بی‌ئێیت ـ ئەبێ تاقمێکی تـازەی بخەیتە سەر کەوان لەژێر ئاڵای کۆڵخوازت‌دا لـەلای کوردەکانی سوڤیەت ۰ کۆمەڵێکی تر لەهۆزە دامەزراوەکان لەو شارستانیانە پێك‌هاتون کە هەموو پەیوەندیەکانیان لەگەڵ‌هۆزوڕەگەزەکانیان‌دا کە ژمارەو گرنگیان ماوەی پەنجا ساڵە بەرەو زیادبـوون ئەچێت دامەزراون ۰

## ٢ ـ خانوبەرەی کوردەواری : ـ

کۆچەرەکان لەژێر دەوارا ئەژین ، هەر لەخۆیانا ئەم دەوارانە نەرم‌و بچـووکن‌و بە گەلێ پـەتی کورت‌کورت بەسراونـەتەوە بە

زەوییەوە ، ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ دەواری عەرەبدا ، گەلێ جیاوازیی ئاشکرا بەدیئەکرێت •

سەرەکەی ڕایەڵی درێژ درێــژی ڕەشە لە مووی بزن دروست کراوە ، ژمــارەی مێخەکانیشی بەگوێرەی ئارەزووی خــاوەن ماڵ ئەگۆڕێ • «بەشێوەیەکی گشتی کــە (سی• جی• ڤیلبرگک) باسی ئەکات» دەواری کورد بەم شێوانەی خوارەوە جیا ئەکرێتــەوە •

سەر دەوارە ڕەشو گەورەکەی لەموی بزن چنراوەو گەلێ ســەری هەیە کە لەسەرەوە بەرەو خوار شــۆڕ ئەبنەوە بەهەر چــوارلای فراوانی دەوارەکەدا ، پەردەی بەینەکانی هەمیشە شتی چنراون وادەرئەکەوێ ژمارەی مێخوڕایەڵیمێخەکان نەزانراون داری لوتکەی نیە بێجگە لەتاقمی ڕۆژهەلات کە لەچەند کاتێکی تایبەتیدا هەیانە سەر دەوارەکە بەش بەش کراوە بەگەلێ بەشەوە کــە بە قەیتانی گوش و چیلــکەی بچووك بەیــەکەوە بەســتراوون • ڕێكخستنی ناوەوە (ڕاخەر) زۆر سادەیە : گەلێ فەرش و حەسیری تیا ڕاخراوە پەردەیەکی قامیش* بەشیژنان لەوجێگایە جیائەکاتەوە کە تەرخان کراوە بــۆ بەخێرهاتنی پیاوانو لەنــاو یەزیدییەکاندا ئەمــە لە ناوەڕاستدایە • ئاگردانی قاوەش لەزەویدا هەلکەنراوە • هەندێ دەواری سەرۆکەکان خاولی و فەرشی خوریی چاکیان تیا دانراوەو حەوانەوەو ڕابواردنیشیان هەر هەیە •

خانووی لادێ (خانی ــ Xanî) زۆر سەرەتاییە • ئەوەیان کە سادەیە ماوەیەکی گەورەی تیایە کە کراوە بە دوو بەشەوە • بەشێکی دانراوە بــۆ ئاژەڵ (ئاخوڕ)*و ئەوی تریان بــۆ خێزانی

---

★ ڕەنگە لێرەدا نووسەر مەبەستی لە چیغی کوردی بێت •

★ لێرەدا مەبەست لە گەوڕە •

مانەکەیە • بۆشاییەکی پەرژینکراویش دەوری خانووەکەیداوە ، لەتەنیشتیەوە عەمــاریکی سادە هەیــە کە بــەکاری ئــەهێنن بۆ هەلگرتنی قایمــەکاریو شتومــەکی ناومالو ســووچێکیشی بۆ چێشتلێنانە •

قایمەکاری دانەوێلە والەدەرەوەیخانووەکانیاندا کەچالی بۆ هەلکەنراوەو بە قورو کای ورد داپۆشــراوەو ناومالیش بە قورو سواخدراوە ، هەروەکو شتێکی ئاســایی لەناوەڕاستی شوێنەکەدا ئاگردانێك یــان تەنــوورێك هەیــە کە لــە شــێوەی بازنەیەکی گەورەدایە وەکــو گۆزەی ســواخدراو لــە زەویــدا چەقێنراوەو ئەمەیش نیشانەی پیرۆزی خێزانەکەیەو لە زستاندا بە کورسیەکی تایبەتی دائەپــۆشرێ کە چوارچێوەیــەکی دارینە بە لێفــەو شت دایئەپۆشنو خێزانەکە لە دەوری کۆئەبنەوە بۆ کات بەسەربردنو گفتوگۆ کردنو تەنانەت بۆ خەویش • بەدرێژایی دیواری هەردو لای دەرگاکەوە سەکۆیەکی قوڕ هەیە کە نەوکی لەسەر ڕائەخەنو بۆ دانیشتن بەکاری ئەهێنن • پەنجەرەو دووکەلکێشی نیە ، بەلام تەنها کونێــك یان دوو کــون وا لە ســەرەوەی دیــوارەکاندا • بنمیچەکانی نزمنو ڕووبەرەکەی بە دووکەلی ئاگردانەکە ڕەش بوونەتەوە • ئاسایشە کە ئەو بنمیچە بە دار چنار دارەڕا کراوەو نەبڕاونەتەوەو بە توتڕکی دڕکاوی داپۆشراوە بۆ ئەوەی لە مارو دووپشك بیانپارێزێ ، ئەمە هەمووی بە قاتێك کا دائەپۆشرێ • هەمیشە لەسەر ئــەم ســەربانانەدا باگردێنێــکی بەرد دائەنێــن بۆ کوتانەوەو گێڕانی بانەکە لە ڕۆژانی باراندا •

هەتا ئێستاش کوردەکان لە چیاکاندا ئەژینو زۆرکەم وان لە ئەشکەوتەکاندا* • هەنــدێ جار خانووەکانیان وەکــو قات قات

---

★ ئاشکرایە نووسەر بەهەلەدا چووە ، ئەگینا هەر لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە کورد لە ئەشکەوتدا نەژیاوە •



ڕەشماڵی کوردەواری

دروست کراون کەسەربانی خانوویەك ئەبێتە هەیوانو حەوشەکەی خانوویەکی‌تر لە سەروویەوە • تـا ڕاددەیەکیش دیوارەکانی بە بەردی داتاشراو دروست‌کراون• یەکێ لەسیفاتی خانووی کورد لە لادێکاندا ئـەو هەیوانەیە کـە سەری بـۆ کراوەو لەسـەر چەند کۆلەکەیەك وەستاوەو ڕووی کردۆتە ڕۆژئاوا • گومانی تیا نیە کە هەوای پاكو ئاوی شیرینو سازگار بە لای ئەو جووتیارانەوە کە لە چیاکاندا دائەنیشن لە جیاتی‌ی دەزگا تەندروستیەکانە •

شتێکی ئاسـایی‌یە خانووی شـارەکان فراوان‌تـرنو جێحەی حەوانەوەنو ژمارەشیان زۆرترەو زۆرجار بە هەیوانێکی کراوە ژووری ژنان لە هۆلی پیاوان جیا ئەکەنەوە • هەندێ لەو خانوانە جێگایـەکی تیایـە بـۆ دانیشتنو بەخێـرهاتنی میـوان • ئـەو سەرکردانەی لە کۆنا لە کۆشکی قایمدا کە لەسەر لوتکە بەرزەکان



دیمەنی خانوو بەرەی کوردەواری

کرابوون‌و ئه‌یانڕوانی به‌سه‌ر ولاتی ده‌وروو پشتیاندا دائه‌نیشتن ، ئێستا لــه شاره‌کاندا بوون به خاوه‌ن خانووی وا کــه وه‌کو ئه‌و کۆشکانه وان که پڕن له په‌ری به‌نرخ‌و به ناومالی تازه‌و جوان ڕایه‌خ کراون ٠

به‌لام له لادێکاندا که‌لوپه‌لی ناومال که‌مه ، بێجگه له هه‌ندێ ڕایه‌خی ساده نــه‌بێ ، وه له زه‌ویشــا نه‌وگ ڕائه‌خــه‌ن ، له‌گه‌ل ئه‌وه‌شا سنووقێکی گه‌وره که له دار دروستکراوه‌و وێنه‌و نیگاری ڕه‌نگاوڕه‌نگی پێــوه کێشراوه‌و جــل‌و بــه‌رگ‌و که‌ره‌ســه‌ی ژنی ماله‌که‌ی تیا هه‌ل‌ئه‌گیرێ ٠ ده‌وله‌مه‌نده‌کان به‌تایبه‌تی له شاره‌کاندا ڕاخه‌رو که‌ل‌وپــه‌لی ناومــالی باشیان هه‌یــه ، که پێــك‌هاتووه له جێگایه‌کی نووســتن ، قه‌نه‌فه‌یــه‌ك ، مێزێك ، چــه‌ند کورسیه‌ك‌و دۆلابێکیش بۆ جل‌وبه‌رگ‌ هه‌لگــرتن‌و کانتۆرێکی ئاوێنه‌داریش

له‌بنه‌ڕه‌تا که‌لــوپه‌لی ناومال بــه‌م شتانه‌ی خــواره‌وه دیاری ئه‌کرێن :

سینی‌یه‌کی مسی گه‌وره یان ته‌یکه‌ی حه‌یزه‌ران که بۆ دانانی خواردن بــه‌کاری ئــه‌هێنن ، قابله‌مه‌یــه‌ك یان قاپێــکی گه‌وره ، تاوه‌یه‌ك بۆ شت‌سوورکردنه‌وه ، که‌وگیرێك ، چه‌ند له‌گه‌نێکی مس چه‌ند ده‌وریه‌ك ، هه‌ندێ شه‌ربه‌و گۆزه ، هه‌ندێ که‌وچك‌و چه‌قۆ ، له‌نزیك ئاگردانه‌که‌شه‌وه مقاشێك‌و مرشه‌ده‌مه‌یه‌کی لێیــه‌و زۆر جاریش ســه‌ماوه‌رێکی(٧) لێ‌یه‌و چه‌نــد مه‌شــکه‌یه‌ك بۆ هه‌لگرتنی خوارده‌مه‌نی‌و چه‌ند بێژنگێك ٠

ڕوناکیان به‌هــۆی چرای نه‌وتیه‌وه‌یه ، زۆر جــار دیوارکۆ [له‌مپا] به‌کــار ئه‌هێنن‌و هه‌ندێ‌جــاریش په‌مپ‌دار [لۆکــس] ٠ له سووچێکه‌وه کــه‌کێك دانراوه که له لق‌و پــۆپی دره‌خت دروست

(٧) سه‌ماوه‌ر : له‌بنه‌ڕه‌تا خۆی وشه‌یه‌کی ڕووسییه ٠



ڕووکارێکی ڕەشماڵی کوردەواری

کراوە • بەڵام ڕوناکی کارەبا[*] زۆر کەمە ، تەنها لەشارەکاندا هەیە •

## ٣ ـ ئیشی ڕۆژانە : ـ

کۆچەرەکان بە بەخێوکردنی ئاژەڵەوە خەریکن ، کـوردیش شوانی زۆر لاخۆشە چونکە دورە لەهەموو ناخۆشیەکەوەو واهەست ئەکات کەسەرداری خۆیو سروشتیشە بێگومان بوونی ئەم شتە لە سروشتی ناوچەکەدا ئازایی دروست ئەکات ، بەهۆی ئەو شـتە ترسێنەرانەوە کە دەوری داوە ، ئەگەر بوونی ئەم شتە پێشـەکی نەبێت بۆ گۆڕانێکی گیانی [ڕۆحی] •

«ئەگەر ویستت کوڕەکەت بکەی بەپیاو ، بیکە بەشوان ، بەڵام پێش ئەوەی ببێ بە ئاژەڵ بیهێنەرەوە بۆ ماڵەوە» •
ئا ئەمە شێوەی ڕاستەقینەی ئەو ژیانە سادە بێگیروگرفتەیە کەوای لەکورد کردوە حەز لەئازادی بکاتو بتوانێ دور لەیاسا ویستەکانی جێبەجێ بکات •

سەریشمان سوڕ نامێنێ لەوەی کە کورد خۆی لەخۆیا ڕقی بێت لە یاساو لە هەموشتێك کە سەربەستیی ئەو زەوت بکات •

ئەگەر پیاوانیـان لەمەسـەلەکەدا خاوەن شـارەزاییبنو لە سەریان بێ کە گرنگی بدەن بەزۆر کردنی ئاژەڵو زاوزێی مەڕو ماڵات ، ئەوا ئیتر ژنانیشیان خەریك ئەبن بەسەرپەرشتی کردنی گاو مانگاو دروست کردنی (کەرێو پەنیرەوە) بۆ دروست کردنو ئامادەکردنی (کەرێ) شیر گەرم ئەکەن تا پلەی کوڵاندن لەپێشانا

---

★ ڕاستە لە ساڵانی ڕابوردوودا کاتێ نوسەر سەری لە کوردستان داوە کارەبا کەمبووە . بـەڵام ئێـستا بـەشی زۆری کوردستان بگرە تا دێهاتـەکانی سـەر سنووریش کارەبای هەیە •

له قابلەمەیەکی بچووکدا (قازان) ئەیکـولێنن ، کە گەیشتە پلەی گەرمایی بەپێی پێویست کەوچکێك ماستی کۆنی تێ ئەکەن و وازی لێ ئەهێنن هەتا ڕۆژی دوایی بۆ ئەوەی بگرسێت ٠ ئیتر ئەم ماستە ترشاوە ئەکرێتە مەشکەیەکەوە کە بە سێ پایەکەوە هەڵواسراوەو دوو ژن تێکی ئەدەن و ڕای ئەوەشێنن هەتا کەرەکە دروست ئەبێ ، ئیتر ئەیشۆنەوەو خوێ ئەکرێ و ئەخرێتە دەوری تایبەتی ئەو مەبەستەوە ٠

ئەوەی کە لە کەرەکە ئەمێنێتەوە (دۆ)ی پێ ئەڵێن و لە دروست کردنی پەنیری سپیدا بەکارئەهێنرێت ، کە خۆی ئەکرێت و گژو گیای بۆنخۆشی جۆراو جۆری تێ ئەکرێ و کاتێك بەچاکی بەستی ئەخرێتە ناو تورەکەوە کە لەکەتان چنراوەو قورسایی‌یەکی ئەخرێتە سەر بۆ پەستینەوەی ٠

ژەکی شیر ئەدەن بە گوێرەکە ، هەروەها دەربارەی شیری پەستێنراو خۆ ئەوە زۆر بەچاکی لەمەشکەدا ئەپاڵێورێت ، کورد هەروەکو کەرەسەیەکی سەرەکی پەنیری سپی لەخواردنەکانیا بەکار ئەهێنێت و بە ڕێگایەکی سەرەتاییش دروستی ئەکەن ٠ ژنان شیرە پاکەکە ئەکەنە قابلەمەی بچوك بچوکەوەو ئەیکوڵێنن و ئینجا ڕیخۆڵەی سپی وشك کراوەی تێ ئەکەن بۆ ئەوەی بترشێ یان بگرسێ ، زۆر بەخێرایی ئەگرسێت : شیرەکە لە ١٥ تا ٢٠ دەقیقەدا پێ ئەگات ، دوای ئەوە ئەکرێتە تورەکەی بچوك بچوکی گوشەوە کە بەتایبەتی بۆ ئەوە ئامادە کراوە ، تورەکەکە ئەبەسترێ و ئەخرێتە سەر بەردی ساف و بەردێکی قورسیشی ئەخەنە سەر بۆ پەستینەوەی پەنیرە پەستێنراوەکە لەشێوەی ئەڵقە ئەڵقەی تەنکدا لەتورەکەکان دەرئەهێنرێت و لە هەوای پاکا وشك ئەکرێتەوە ٠ لە لادێکاندا جوتیارەکان کێڵگەکانیان ئەکەن بە گەنم و جۆو برنج ٠

بەگاسنێکی(*) سەرەتایی زەوی ئەکێڵن کە لە ئاسنێکی چەقۆیی‌و گیرەیەکی دارین پێك‌هاتوەو زۆر بەنارەحەتی زەوی ئەکێڵێ‌و ئەم گاسنە پارچە پارچە ئەکرێت‌و بەسەرشانیش ئەگوێزرێتەوە ٠

لەهەوادا تۆو ئەوەشێنن‌و لەکاتی دروێنەدا هەمووان لەڕیزێکی درێژی ڕاستدا بەگۆرانی وتن هاوبەشی ئەکەن ٠ هەروەها بە داس دروێنە ئەکەن‌و درەوانەکان دەستکێشی ئاسنین ئەکەنە دەستیان بۆ پاراستنی پەنجەکانیان،کە بەتایبەتی بۆ پەنجە دروست کراوە ٠ دوای ئەوەی گەنمەکە ئەڕنرێتەوە لەهەواداو لەسەر زەوی لەنزیك دێکەوە بڵاو ئەکرێتەوەو بە پارچە تەختەیەکی(*) ئەستور کە ژێرەکەی گرنج گرنج‌و داناوێەو گا یان کەر ڕای ئەکێشێ ئەکوترێت ٠ مناڵان زۆریان لا خۆشە کە سواری ئەم عارەبانە سادەیە ئەبن‌و چەند سەعاتێك لەناو تۆزو بەر خۆرا ئەسوورێنەوە ٠ دوای ئەوە بەشەن کە دارێکی درێژە دانەکە لە کاکەی جیائەکەنەوە ، لەدواییدا گەنمەکە لە دەفری قوڕیندا بە دوومەتر یان‌نزیکەی مەترێك بەرزەلەشێوەیەکی‌خڕ یان‌لاکێشەیدا کۆئەکرێتەوەو لەناومالدا هەڵئەگیرێ* لە سەرەوە پڕئەکرێت‌و کونێکیش وا لە دامێنەکەیدا بۆ ئەوەی کاتی پێویستی گەنمی لێ دەربهێنرێت ٠ ئەم کەنووە گەورانە بە جێگا پەنجەو وێنەی دەرهێنراو لە قوڕەسوورە ڕازێنراونەتەوەو وەکو ئەڵێن ئەم وێنانە شت لە چاوی پیس ئەپارێزن ٠

لاسکە کوتراوەکە ( کا )کە کۆئەکرێتەوەو ئەیکەنە ناو کایەن‌و لەباتیی ئالیك بەکاری ئەهێنن بۆ ئاژەڵ‌و هەروەها لە خشت دروست کردنیشا بەکاری ئەهێنن ٠

---

★ لە کوردەواریا بەم گاسنە ئەڵێن هێرەق یان هەوجاڕ ٠

★ لە کوردەواریا بەم پارچە تەختەیە ئەڵێن جەنجەڕ ٠

★ لە قوڕ ئەمبارێکی بۆ دروست ئەکرێ کە پێی ئەوترێ (کەنو)



دیمەنێکی نێی ڕۆژانە [redacted] لادێکانی
کوردەواریدا

کوردەکان باخەوانی چاکن ، هەروەکو هەموو لوبنانی‌یە شاخاوییەکان ئەمانیش لە شاخەکانیاندا زەویی کشتوکاڵی چاك ئامادە ئەکەن کە درەختی بچووك لە دامێنی چیاکانداو لەبەردەم زەویەکاندا ئەنێژن‌و ئیتر ئەتوانن گەنمەشامی‌و گاڵو کەتانی تیا بچێنن ، ئەمەش لەکاتێکدا ئەکەن کە زەوی‌ی کشتوکاڵی کەم بێت ٠

سەوزەوات زۆر هەمە چەشنەیە ، پەتاتە ، لۆبیا ، نیسك ، بەزالیای سەوز . تەماتە ، باینجان ، کەلەرم ، پیاز ، گێزەر ، شێلم ، خەیار ، شەمامە ، کاڵەك ، سپێناخ ، توور ، بەشێوەیەکی یەکجار فراوانیش درەختی بەری‌یان هەیەو جوتیارەکان خۆیان سەرپەرشتی ئەکەن‌و لە بەروبوومی ئەم درەختانەش وەکو : سێو ، هەرمێ‌و قۆخ‌و هەنجیرو قەیسی‌و توو و هەنار ٠

کورد بە چاکترین جووتیاری مێو دائەنرێت ، مێوەکەی بە بلیمەتی ئەچێنێت‌و ترێیەکی چاك ئەهێنێتە بەرهەم‌و نزیکەی ٢٠ جۆر مێویان هەیە ٠ ترێ بە تەڕی ئەخۆن‌و هەروەها وشکیشی ئەکەنەوەو بە خواردنێکی باشی دائەنێن بۆ زستان‌و شەربەتی مێوژ بەکار ئەهێنن بۆ دروست کردنی هەویری کێك ، وە گاورەکان لە ترێ‌ی وشك شەراب دروست ئەکەن‌و ئارەقیشی لێ ئەپاڵێون ٠

توتن بە یەکێ لە سامانەکانی ئەم وڵاتە دائەنرێت‌و ئەو جگەرەیەی لە سلێمانی دروست ئەکرێت برەوێکی زۆری هەیە ٠

بەهۆی جۆگای بچووك بچووکەوە ئاوی باخ‌و مەرەزەکانیان ئەدەن کە یەکسەر لە کانی‌ی دێکەوە دێتە خوارەوەو لە هەندێ شوێندا بە دۆلچە ئاو لە چەمەکان هەڵئەگۆزن ٠ ئەوەمان لەبیر نەچێ کە هەندێ لەسەر دارەکانی کورد لە سەدەی دەیەمدا لۆکە چاندنیان هێناوەتە سوریاوە ٠

کورد لە چیاکاندا مازو ئەچنێ ، کە کەرەسەیەکی باشی پێستە خۆشەکردنە ، هەروەهــا کەتیرەی گەزۆ کۆئەکەنەوە کــە ئەمیش جۆرێکە لــە شیرینیی مروشتی • پیاوەکانیان دار ئەبــڕنو لەناو تەنوورێکا کۆیئەکەنەوەو ئەیسووتێننو بە خۆڵ دایئەپۆشن بۆ ئەوەی ببێ بەخەڵووز کەباشترین شتە بۆزۆپاو مقەڵی کە هەمیشە بەکاریان ئەهێنن •

لە شارە دوورەکانی ناو کوردەواریدا ، زۆربەی کوردەکان بە شــوێن ئیشا ئەگەڕێن بــە زۆرییش ئیشی قورس وەکــو خۆڵ هەلکەندنو خۆڵکێشیو کۆڵکێشیو لە ئەستەنبوڵیش بەشی زۆریان لە ئیشوکاری خانووکردندا ئیشئەکەن یان پاسەوانن چونکە زۆر جێگای باوەڕن •

بەلاَم لە شارە بچووکەکانی کوردستاندا ، شارستانیەکانیان خەریکی ئیشو کاری بازرگانــینو کەلوپەلو کەرەسەی بە کەڵك ئەنێرن بۆدوکانە بچووکەکانی ناوکۆچەرو لادێکان کە پێویستیان پێیەتی ، هەر لەو شارانەدا بازرگانی گەورەش هەیە وەکو کڕینو فرۆشــتنی مەڕو خوریو پێســتو هەشــیانە کە حەز لەبازرگانی کەرەو پەتیر ئەکەن ، یان خاوەن مازو داری سوتاندننو هەشیانە کە کەرەسەو پێویستی ئەنێرن بۆ بازاڕی شارە گەورەکانو ولاَتە دراوســێکانیان • لەئەســتەموڵدا بازرگانەکانی مــەڕو مالاَتو قەسابەکانیش هەر کــوردن ، لەبەیروت کورد زۆرەو لەبــازاڕی سەوزەو قەسابەکاندا ئیش ئەکەن ، زۆر بە ئاسانی بەهۆی کلاَوە خوریەکانیانەوە ئەناســرێنەوەو بە درێژایی چوار وەرزی ســاڵ خەریکن بە دەستگێڕی بەناو هەموو ناوچەی شارەکەداو هەر لەناو ئەمانەیشدا خاوەن کۆگا هەیەو کۆڵکێشە بەهێزەکانیانمان لەبیر نەچــێ کە ئەتوانن سەلاجــەو دۆلاَبی گەورەی ئاوێنەدار لەســەر پشتیان هەڵبگرن •



دیمەنی دێیەکی کوردەواری

پەندی (وەکو تورك بەهێزە) بەتەواوی بەسەر کـوردەکاندا ئەچەسپێت چونکە وەکو ئەزانین زۆریان لەتورکیا ئەژین •

لەعێراقدا کـوردەکانی ئەمـڕۆ لە هەربەسـتی دوکانو بیرە نەوتەکانی کەرکوكدا بوون بە کرێکاری شارەزاو لەناو خەڵکی شارەکانیشـدا پزیشكو پارێـزەریان هەیەو ژمارەیشـیان لەوە زیاتر بوە کە لە ئاساییدا ئەزانرا •

گەلێك فەرمانبەری خاوەن دەسەڵاتو جێگای باش هەیە کە شـاری سـلیمانیو شـوێنەکانی تریـان بەجێهێشتوەو ئەمانـە گەیشتونەتە ڕێو شوێنو پلەی بەرز لەسوپایان ئیدارەداو تیایانا بوە کە هاوبەشی گەلێ وەزارەتی کردوە •



دیمەنێکیتری نیشی ڕۆژانە

ئەم کوردانە بەزیرەکیو لێهاتوییو دەستپاکی بەناوبانگن و جێی سەرسوڕمانیش نیە ئەگەر بڵێین بەشی زۆری ڕۆژنامە نوسەکانی تورکیا لەڕەگەزا کوردن ٠

ژیانی کوردەکانی ئەرمینیای سۆڤیەتی بەتەنها خۆیان مافی باسکردنیان هەیەو بەشی زۆریان یەزیدین ، ئەوانەی کە لەپێش شەڕی ١٩١٤دا شوان بوونو لەدوایدا بون بە ئیشکەری بەتوانا وەکو کۆنکێشو کرێکار لە تەفلیسو یەریڤان ٠ بە کورتی کاتی خۆی لەدوای دواکەوتوەکانەوە بوونو ئەمڕۆیش هەموویان دامەزراونو چوونەتە کۆڵخۆزاتەکانەوە ٠



جووتکردن بە هەوجاڕی کوردەواری

کۆلکێشێکی کۆن لەپەڕاوێکدا کە ساڵی ۹۵۷ چاپ کرا ئەو پێشکەوتنەی دوپات کردۆتەوە لەژیانو وەرگرتنی ڕەوشتە تازەکانیاندا ڕوی داوە کە ناتوانرێ ئینکاری گۆڕانە چاکە جۆراو جۆرەکانیان بکرێت ، چی لەنیشتەجێ کردناو چی لەپرۆگرامی ژیانی ڕۆژانەیاندا ، بەشی زۆری خانوەکانیان ژێرخانن ، بەڵام خانوشیان هەیە کە لەبەردی جوان دروست کراوەو بە گلۆپ بە باشی ڕوناك کراونەتەوە • هەروەها ناوماڵیش گۆڕاوە ، ئیتر ئەوە نەماوە کە جوتیار لەسەر حەسیرو نەوگی بۆگەن بخەوێ ، بەڵکو ئێستا لەسەر فەرشی خوری باش ئەخەوێ لەگەڵ لێفەو جێگای نوستنی خوریو بە قەیفەو شاڵ خۆی دائەپۆشێت •

ئەمڕۆ لەناوماڵی کوردا ، ڕادیویەكو جێگایەکی نوستنی خۆش داپۆشراو بە نیکلو سەعاتێکی دیوار ئەبینین ، بەڵام خاوەن ملکی بوە بە هەرەوەزی ، لەجیاتی عارەبانەو گاسنی کۆن ئەمڕۆ لە دەشتەکانی کۆلخۆزاتدا بەهۆی مەکینەو دەڕاسەوە کشتوکاڵ ئەهێنرێتە بەرهەم ، کەواتە شێوەی ژیان بەهۆی کشتوکاڵی هەرەوەزیو بەخێوکردنی مریشكو جوجەڵەوە بەتەواوی گۆڕاوە• بۆنمونە باسی دێیەکی نمونەیی لە [نالەگەز] لەئەرمینیای سۆفیەتی ئەکەین • کە ساڵی ۱۹۲۹ کێڵگەیەکی هەرەوەزی تیا دامەزراوە بەناوی (کیرۆف) ، دانیشتووانی ۳۵۰ کەسەو ۱۰۰ خانووی تیایەو ۳۰ کەسیان ئەندامی پارتین ، لە دێکەدا کارگەیەکی شیرەمەنیو دایەرەیەكو قوتابخانەیەکی ئامادەییو چوار کتێبخانەی گشتیو دوو کۆمەڵی هەرەوەزیو نەخۆشخانەیەکی ۱۵ قەرەوێڵەییو دوو پزیشك هەیە کە یەکێکیان کوردەو ئەم کێڵگەیە ۱۵۰۰ سەر مەڕو ٤۰۰ سەر مانگای تیایەو پانتاییەکەی ٦۰۰

هکتاره ، ٥٠٠ هکتاری دانراوه بۆ کشتوکاڵو ١٠٠ هکتاریش بۆ لەوەڕگا • سەرەڕای ئەوانە سێ تراکتۆرو دوو دەڕاسەو سێ لۆریی تیایە • وەکو ئەبینرێو بە شێوەیەکی گشتی ئێمە دوورین لە چۆنیەتی باری سامانو کۆمەڵایەتی کوردەکانی عێراقو تورکیاوە •

دەربارەی ئافرەتی کورد بەتایبەتی لە دێکانی عێراقو تورکیادا ئەتوانین بڵێین هەموو نارەحەتی ئیشوکارە گەورەو قورسەکانی ناومال لەسەر شانی ئەوە ، بەتایبەتی ئەوانەی لە سەعات پێنجی بەیانییەوە هەتا پانزەی شەو ئیش ئەکەن • سەرەڕای ئەوەی کە دۆشینی مانگاو دروست کردنی کەرەو پەنیر ـ هەروەکو لەپێشەوە باسمان کرد هەر لەسەر شانی ئەمە • لەگەڵ



ئافرەتی کورد هەمیشە شانبەشانی پیاو ئیشی کردووە

نان كردندا ، كه به ئاردو خوێ بەبێ هەوێن هەوير ئەشێلێ كه لەناوتەشتێكی گەورەی بەردیندا ئەیشێلێو دوای‌ئەوه بەبۆریەكی تەخته* پانی ئەكاتـەوەو ئەیخاتـه سـەر مایەیـكی تایبەتیو ئەنووسێنرێ بـەدیواری نـاوەوەی تەنوورێكەوه كـه له شێوەی گۆزەدایه یان ئەخرێته سەر پارچه ئاسنێكی قۆقز* كه بەتایبەتی بۆ نـان كـردن دروستكـراوه • كاتێـك كـه بـرژا ئەخرێته قوولینەیەكی گەورەی خڕەوه •

هەروەها ئاو هێنانیش هەر لەسەر ئافرەته ، جاری وا هەیه ماوەی كانیو دێكه بەپێ نزیـكەی نیو سـەعاته ، هەروەها ئەركی كۆكردنەوەی داری وشكو تەپاڵەش كـه لەبەر خۆرو به دیواری خانووەكانەوه وشك ئەبێتەوه هەر لەسەر ئەمه •

چێشت لێنـانیش هەر بەشی ئافرەته • خـواردنی سەرەكیی دەوڵەمەندەكان برنج یان ساوەره ، هینی ئەوانی‌تریشیان ساوەرو سەوزەواته وەكو باینجانو تەماته له وەرزی خۆیانداو هەندێجار پله گۆشـتی نـەرمی بچووك بچـووك یان مریشـكێك بەتایبەتی ئەبرژێنن بۆ میوان ، بێجگه له میوه بەتایبەتی ترێو كاڵەكی قاش كراو • بەڵام له خواردنەوەدا ئاوی سروشتی بەكار ئەهێننو زۆر جاریش چای خۆماڵیو هەروەها ماستاوو دۆیش كه زۆر خۆشن هەر بـەكار ئەهێنن • بەڵام هەفتانه بەدارێك یـان چەكوشێكو* سابوونو لەسـەر كانی گشتیدا جـل ئەشۆرنو زۆر جـاریش به كۆمەڵ جل ئەشۆنو ئەم ئەركەیش هەر لەسەر كەیبانووی ناوماڵی كورده •

---

★ رەنگه مەبەست له تیرۆك بێت كه نانی پێ پانئەكرێتەوه •
★ مەبەست له ساجی نانكردنه •
★ لێرەدا مەبەست لەجل شۆرگه كه له كوردەوارێدا ژنان جلی پێ‌ئەشۆن

## ٤ ـ هونەرو پیشەکان :

لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا، ژنان زۆر بەلێهاتوویی‌و چالاکی‌یەوە خوری ئەچنن‌و لە کاتی هەموو ئیشێکی‌تریشدا وا بەدەستەوەو هەروەها هەندێکیشیان خەریکی تەون کردنن ٠

دوو جۆر تەونی چنینیان هەیە : یەکەم ستوونی‌یەو لە دوو دار پێك‌هاتووە کە نزیکەی مەترو نیوێك لەیەکەوە دوورن‌و بە پێچەوانەوە دوو داریان لەسەرە ، یەکێکیان لەسەرەوەو پێ‌ی‌ئەڵێن سەردارو ئەوی‌تریان لەژێرەوە پێ‌ی ئەڵێن ژێردارو ڕایەڵێکیش بەم دووداره لەیەك دوورەوە بەستراوە بە درێژایی ٢ر٨٠م ٠ دوو ژن لە چۆڵیەکا گلۆلە بەنەکان هەڵئەکەن ٠ لەم شێوەیەدا بەنی مەکۆکە ئەبرێت بەناو بەینی تانوپۆکەدا بەهۆی دەرزییەکی درێژەوە ، ئینجا تانی چنێ بە شانەیەکی ئسنێ یان مشتەیەکی تەختە ئەکوترێت ٠ ئەم جۆرە تەونە مەوجو جاجمی پێ دروست ئەکرێت بە درێژی ٤٨ر١ـ٨٠ر٢م کە ڕایەڵەکانی خوری مەڕو تانوپۆکەشی مووی بزنە ٠

دووەمیان تەونی ستوونی‌یە کە لەسەر ژێرتەونێك وەستاوەو لە زەویدا قایم‌کراوەو ، لەزەویدا چاڵێك هەڵئەکەنن بۆ قاچی تەونەکەو وا دەرئەکەوێت ئەم تەونەیان لەوی‌تریان گرانترە ، گەلێ شانەی تیا بەکار ئەهێنرێت ٠ بەنی تانوپۆکە بەهۆی مەکۆیەکی ئاسنینەوە کە سەری گلۆڵە بەنەکانی پێوەیە ئەچێتە ناو ڕایەڵەکانو خوریەکە هەڵئەکات ٠ هەر بەم تەونەش قوماشی کراس بە پانی ٣٠سم‌و هەروەها قوماشی ئەستورتر لەوە بۆ جل‌و بەرگ کە لەپێشانا بەنەکەی بە قسڵی کولاو تەڕئەکەن ئەچنن ٠

ئافرەتیان فەرشی جۆراوجۆرو هەمە چەشنە ئەچنێ چ لە



مەنجەڵو سینی‌ی مس کوردەواری

خوری‌ی چاك‌و چ له مووی کورت‌و وێنه‌ی جۆراوجۆریان تیا ئه‌کرێ ڕه‌نگه‌کانیش زۆر جوان‌و زه‌وقاوین • له‌ناو ئه‌م زه‌خره‌فانه‌دا گوڵ‌و گیان‌له‌به‌ری هه‌مه‌چه‌شنه له‌سه‌ر زۆر شێوه‌و به‌زۆریش دره‌خت‌و جاڵجاڵۆکه‌یان تیایه • هه‌روه‌ها فه‌رشی نوێژ کردن* له‌ناو شوێنه‌کانی وڵاتی فارسدا زۆر به‌ناوبانگه هه‌ندێ له شاره‌زاکانیان له قوڕه سووره‌ی دێکان جامی ئاو خواردن دروست ئه‌که‌ن که ڕۆنی تێوه ناده‌ن‌و هه‌ر به‌م جۆره له شێوه‌ی قاپداو له قوڕه‌سووره‌ی شێلراو گۆزه دروست ئه‌که‌ن بێ‌ئه‌وه‌ی قاڵبی خڕی



یه‌کێك له پیشه ده‌ستی‌یه‌کانی کورده‌واری

بۆ به‌کار بهێنن • له‌پێشا له‌به‌ر خۆرا وشك ئه‌کرێته‌وه‌و دوای ئه‌وه له شێوه‌ی بازنه‌دا ژماره‌یه‌کیان ئه‌خرێته سه‌ریه‌ك به مه‌رجێ به قاڵبی ته‌پاڵه‌ی وشك داپۆشرێ • ئه‌م ئاماده کردنه سێ سه‌عات ئه‌خایه‌نێت •

---

* له کورده‌واریا به‌م فه‌رشه ئه‌وترێ [به‌رماڵ] •



ئافرەتی کورد لە هەرچی تەمەنێکدا بێت
هەر کار ئەکات

پیشەسازی لە ڕابوردوودا بەتەواوی لەژێر دەستی جولەکەو ئەرمەنیەکاندا بووە ، بەڵام ئەمڕۆ لەبەر ناهەمواریی ژیانیان وا نەماوە ، چونکە ئەرمەنیەکان لە کوردستانی تورکیا نەمانو هەر لە ساڵی ١٩٤٨ەوە جوولەکەکانیش لە عێراق نەمان • ئیتر لەوەو



پیشەیەکی دەستیی‌تری کوردەواری

دوا لەسەر کوردەکان پێویست بوو کە خۆیان نەوکێ دروستبکەن کە تەنها بۆراخستن بەکاریان نەئەهێنا بەڵکو بۆ کەرەکو کڵاویش کە لەژێر مێزەرەوە لەسەر ئەکرێ بەکار ئەهێنرێ .

کوردەکان لەوەدا نەماون کە نەتوانن لە دروست کردنی پێڵاوەکانیانا پێستە بەکار بهێنن ، هەروەها لە بەکار هێنانی کانەکانو دارتاشیشدا شارەزای چاکیان تیا پەیدابووە لەدروست کردنی زینو زەرنگەری زیوداو زۆر شارەزابوون لە هونەری نیگارکێشی سەر مستووی خەنجەرو بازنو پاوانەی زیویداو ، گەیشتوونەتە ئەوەی کە پیاڵەو بنی تێرگەلە دروست بکەن . نیگاری سەر مس هونەرێکی کوردی کۆنەو لە ڕێگای خاوەن پیشە ڕۆژهەڵاتیەکانەوە گەیشتە ئەورووپا .

لەم مەیدانەدا شاری بوندقیە ئاوەدان بووبووەوە بە کارگەی تایبەتی کە پارچە زەخرەفەی زۆریان تیا ئەکێشان . ئەمەیش لە سەدەی پانزەهەمدا بووە کە لەسەر هەندێ پارچە ئیمزای کوردێکیان دۆزیوەتەوە کە ناوی محموود بووە .

پاش ماوەیەکی کورت تەنانەت لە شاری سلێمانیدا بە تەنها ١٥٠ وەستای تایبەتی چەك دروست کردن پەیدا بوون ، کە شارەزاییەکی باشیان تیا پەیدا کردووەو توانیویانە هۆزەکانی ئەملاو ئەولای سنوور پڕچەك بکەن .

بەڵام لە وەرزی زستانداو لەکاتی وشکە سەرمای کوشندەدا خۆیان بە دروست کردنی ئاگردانو قوتووی جگەرەوە خەریك ئەکەن کە لە جۆرە قوڕێکی تایبەتی دروستی ئەکەن .

لەکاتێکدا کە هەندێکیتریان هەر لە وەرزی زستاندا ئەچن لە لقوپۆپی دار گێلاس ، دار جگەرەو کەوچکی دارینی نەخشاوی دروست ئەکەن .

# رژێمی کۆمەڵایەتی

ئەو کوردانەی کە باسمان کردن ، لە لادێکاندا بە شوانیو جووتیارییەوە خەریکنو لەشارەکانیشا کرێکاری شارەزان • ئەمانە حەزیان لە خزمایەتییە لە ڕێگای ژنو ژن خوازییەوە کە ئەوەش لە ڕژێمی هۆزایەتی ڕەسەندا دەرئەکەوێت ، ئەم شێوە کۆنەی سەردەمی ڕابوردوو لە پەیڕەوی کۆمەڵایەتی ناو ڕەوەندو نیوە ڕەوەندەکاندا بەرەو نەمان ئەچێت ، بەهۆی زەبرو زەنگی هەندێ فەرمانڕەواکانەوە ، وەکو فەرمان ڕەوای تورکیاو یەکێتی سۆڤیەت ، یان لە ڕێگای کارتێکردنی هەندێ گۆڕانی ناچاری باری ژیانی تازەوەیە •

## ١ ـ هۆزو تیرەکانی کوردەواری :

شتێکی زۆر نارەحەتە کە هۆزە کوردەکان سەرژمێر بکرێنو

بژمێررێن ، لەگەڵ ئەوەشا ئێمە هەندێ لەو تیرانە دەست نیشان ئەکەین کە لە مێژوودا دەوری خۆیان بینیوەو تا ڕادەیەك ناوبانگیان ماوە ٠

**لە عێراق* :**

پشدەر ، ئاکۆ ، خۆشناو ، هەرکی ، هەمەوەند ، زێباری ٠

**لە ئێران :**

شکاك ، بلباس ، مەنگوڕ ، مامەش ، پیران ، زەرزا ، سوکری ، ئەردەلان ، جاف ، کەلهوڕ ، ئیتر باسی لوڕو بەختیاری ناکەین کە هەردووکیان خۆیان بە کوردی ڕاستەقینە دانائێن ٠

**لە تورکیا :**

هەکاری ، هەرتوشی ، زیریکان ، جەلالی ، حەیدەران ٠

**لە سوریا :**

بەرازی ، ملی ، میران ، داکوری ، هافرکان ، مرسینی ، کیکان ٠٠٠٠ هتد ٠

تیرەی بابان لە عێراق‌و تیرەی بەدرخان لە تورکیا بە مانای ڕاستی تیرە نین ، لەڕاستیدا ئەمانە بنەماڵەی چەند سەردارێکن کە

★ تیرەو هۆزی کورد لەعیراقدا زۆرن ، بەڵام ڕەنگە نوسەر تەنها ئەوانەی بۆ دەرکەوتبێ‌و بێجگە لەوانەش وەکو تیرەی (جاف گەلێ هۆزی تیایە وەکو : شاتری ، شێخ سمایلی ، تەرخانی ڕۆغزایی ، باشکی ، سمایل عوزەیری ، سۆفیەوەند ، عیسایی ، یاروەیسی ، تاوەگۆزی ، سادانی ، نەورۆلی ، کەمالەیی ، تەرخانی ، هارونی ، میکایەلی ، جەلالی‌و ، پشت ماڵە گەلێك تیرەی تر وەکو بەرزنجی‌و زەردۆیی‌و هەورامی‌و کۆکۆیی‌و باجەڵان ، بلباس ، داودە ، دزەیی ، هەمەوەندی ، هەرکی ، جەباری ، پەرخی ، خۆشناو ، پشدەری ، شوانی ، سورکی تاڵەبانی ، زەنگەنە ، جنگنی ، دەلۆ ، دزەیی ، گەردی‌و گەلێکی تر ٠

لەناو هەندێ هۆزاو هەر لەو ناوچانەدا فەرمانڕەواییان کردووە•
بەرزانیەکانیش تیرە نین ، بەڵام لە چەند هۆزێك پێك‌هاتوون کە
بڕیاری دەســەڵاتی ئایینیو سیاسیان داوە بە شـێخەکانی بەرزان
لەسەر زێی گەورە •

بە شێوەیەکی گشتی تیرە شاخاوییەکانو بەشێوەیەکی تایبەتی
تیرەکانی کورد بە سێ جیاوازیی سـەرەکی جیائەکرێنەوە • لە
خۆیدا جیهانێکی بچکۆلەی دوورە پەرێز وەستاوەو هەر لەو کاتەدا
دەستەی بەرگری خۆی پێك ئەهێنێت •

ئەم ڕژێمە چەند ڕێڕەوێکی لاسایی‌کەرەوەی هەیە ، کەواتە خۆی
پارێزەری خـۆیەتی ، ئەم تیرەیە هەسـت بەسەرکەوتنی خۆیـان
ئەکەن بەسەر ئەو کۆمەڵانەدا کە هۆز نینو وان لەدەوروپشتیاندا
بێ‌گومان ئەم گیانو گەورەیی هۆزایەتیە خۆی لەخۆیدا هێزێکە ،
لەگەڵ ئەوەشدا ســەرچاوەی بەشی زۆری ناکۆکیو بەگـژ یەکدا
چونیشە لەگەڵ دراوسێو فەرمانڕەوا مەرکەزیەکـاندا • کاتی
خۆی نیازوابو هۆزە کوردەکان بکرێن بەخێزانێکی فراوان لەسەر
شێوەی هۆزە ئیسرائیلیەکان کەئینجیل باسی‌کردوون، لەوانەیەلای
عەرەبەکانیشـ بەشێوەیەکی ئاسایی هـەروابێت ، کە پەیوەندی
ڕەگەز بڕبڕەپشتی هۆز پێك ئەهێنێت • لەکاتێکدا لای کوردەکان
ئەمە مانای خاكو نیشـتمان ئەگەیەنێ • لەکوردســتانی عێراقدا
ئەتوانرێ کە بەسێ چەشنی جیاواز ڕژێمی کۆمەڵایەتیو ئابوری
دانیشتوانی لادێکان جیا بکرێنەوە •

١ ـ هۆزێکی کلاســیکی کۆن لەژێر دەستەڵاتی ئاغـایەکا کە
ئەچێتەوە سەر ڕەگەزێکی هاوبەشو کراوە بە چەند بەشێکەوە هەر
وەکو باری هۆزەکانی ئاکۆ ، بالك ، گردی ، سیار ، سورچی •

٢ ـ هۆزێك لەژێر دەسەڵاتی سەرکردەیەکی دەرەبەگدا ، کە لەڕەگەزی جۆراو جۆر پێك هاتوە وەکو هۆزەکانی دزەیی،خۆشناو جـاف ٠

٣ ـ دوای ئەوانە سەرکردە ئاینیەکان ، سەیدێك یان شێخێك کە دەســەڵاتی کــاتی تێکەڵاوی دەســەڵاتی ئاین ئەبێ‌و هەمــوو شێخەکان بەم شێوەن ، وەکــو شێخەکانی بەرزنجە لەســلیمانی‌و شێخەکانی بەرزان ٠

هەرچۆن بێت ، ئەبێت کە تیرەیەك لەچەند خێڵێك پێك هاتبێ کە لەیەك ناوچەدا دانیشتوون‌و چەند خێزانێکیان لە خۆیان پێك هێناوە ، هەر خێڵێك لەم خێڵانە دانایەکی گەورە ســەرۆکایەتیان ئەکات کە ڕیشێکی سپی هەیەو سەرزەنشت‌و نەسیحەت‌و ڕێنمایی ئەندامانی خێڵەکە ئەکات ٠

لەکۆنا بەسەرۆکی هۆزیان ئەووت (بەگ) یان (خان) بەڵام ئەمڕۆ ئاغای پێ ئەڵێن‌و ئەم ناوەش ئەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ســەدەی هەفدەهەم ٠

ئێمە ئەزانین کە هۆز هەیە لەئەنجامی ڕوداوی ناخۆش وەکو شەڕو نەخۆشی تێك ئەچێ‌و پەرتوبڵاو ئەبێت ، بەڵام هۆزەکانی تر بــە هۆی دەسەڵات‌و ناوبانگی ســەرۆکەکانیانەوە کە دەوری گــرنگ ئەبینن بەهێز ئەبن‌و زۆرجار لەپاڵ هۆزە نیشتەجێ بوەکاندا گەلێك توخم سەریان لێ ئەشێوێ بەتایبەتی ئەوانەی کە لەو نامۆیانە پێك هاتون کە لەلایەن خاوەن مافەکانەوە بە گوناهی کوشتن دەرکراون چونکە لەناو هۆزەکانی خۆیاندا ژیانیان لێ تاڵ کــراوەو یەکێك نەبێت بیانپارێزێت ئەوا ژیانی خۆیان ئەخەنە ئەولاوە ٠

لەبەشەکەی پێشودا باسی ئەوەمان کرد کە کوردەکان هەموویان

لەیەك ڕادەی یەكسانیا نین‌و ئەم شـێوەش بەتەواوی لەو حاڵـە ئەچێت كە ئاشوریەكانی تیادابوو ، كە سەرۆكیان لەناو پیاوانی هۆزەكەیاندا هەڵئەبژارد ، بەڵام ئەوانی تریـان لەعەبدەكانی سەدەی ناوەڕاست ئەچن،ئەوانەی كە بەشداری شەڕی تیرەگەریان نەئەكرد ، بەڵكو تەنها بۆ ئیش‌كردن‌و خزمەت‌كردنی ئاغاكـانیان تەرخان ئەكرێن ٠

چاودێرەكان هەر لەناو ئەو هۆزانەی خۆیاندا هەندێ چینی تریان بینیوە لەو توخمانەی كە هۆزەكانیان لێ‌پێك‌هاتوە ٠لەوانە چینی خانەدانەكـان‌و خێزانەكانیان كە لەســەركردەو ئاغاكـان تێناپەڕن ٠چینێكی تریش كە چینی سـكێنن‌و لەهەموو لایەنەكانی ژیاندا ئیش ئەكەن یان ئەبنە سەربازو پیاوی ســەركردەكەیان ، لەدوای ئەمانە پیاوە ئاینی‌یەكانن لەشێخ‌و مەلا كە وەكو لەمەودوا ئەبینین زۆرجــار لەبنكەی هۆزەكانی خۆیـان‌داو لە سەر فەرمان ڕەوایەتی ئەبنە هۆی دروست‌بوونی ئاژاوە ٠

## ٢ ـ ســەرۆك هـۆزی كــوردەواری ، دەســەڵات‌و بەربەرەكانێ كەرەكانی :

كۆمەڵێك هێــزی یەكگرتوو مانای چیــە ؟ وەكو لــە ڕێڕەوی مێژووەوە ئەیبینین‌و بەمانای وشە هۆزێكی سەربەخۆ مانای چیە ؟ یان تیرەیــەكی سادە مانــای چی‌و ؟ لەنــاو ئەمانــە هەموویاندا سەرۆكێك هەبێ خۆیان خستبێتە ژێر دەسەڵاتیەوە ٠

### ڕەگەزو بنەچەی سەرۆك : ـ

بەڵام كێ ئەبێ بەســەرۆك ؟ ٠ ئەو ڕێگایانەی كە ســەرۆكی پێ‌ئەگاتە فەرمان‌ڕەوایی بەگوێرەی بارو شێوەی ژیانی هۆزەكەو

بەگوێرەی ڕۆژگار ئەگۆڕێت ، ئەوەش بەڕێگای یەك لەدوای یەکی بنەچە یاخو بەڕێگای هەڵبژاردنی هۆزەکەوە یاخۆ بەدانانی گەورە پیاوان یان میریەکان دایانئەمەزرێنن‌و گەلێ‌جاریش بەزۆر ئەبن بەسەرۆك • لەزۆر کاتا بنەچە دەوری خۆی ئەبینێت ، کاتێ باوك ئەمرێ کوڕە گەورە جێگای ئەگرێتەوە ، لەمەدا ئەتوانرێ بوترێ ئەمە شێوەیەکی سروشتیە بۆ گوێزانەوەی فەرمانڕەوایی ، بەڵام جاری وا هەیە کوڕەکە توانای نیە یان بێ‌دەسەڵاتەو ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەم جێگەدارە شایانی ئەو شوێنە تایبەتیە نەبێت کە بۆی تەرخان کراوە ، لەم کاتەشا دەستەیەك لەگەورە پیاوانی هۆزەکە بانگ ئەکرێن‌و ئەگەر دوای ڕاوێژکردن ئەو جێگەدارە بە شیاو دانەنرا ئەوا جوتێ پێڵاو لەبەردەمیا دائەنرێت‌و ئەمیش پێڵاوەکان لەپێ‌ئەکـاتو ژورەکە بەجێ‌ئەهێڵێ کە نیشانەیە بۆ ئـەوەی کە ڕازیە بەوەی ســەرۆکێکی تر دیــاری بکــرێت ، بــەڵام زەوی‌و سامانەکانی ئەدرێتەوە • ڕێش‌ئەکەوێ کە کــوڕە گەورە خــۆی نەیەوێ جێگای باوکی بگرێتەوە چونکە جاری وا هەیە خواپەرستی بەباشتر ئەزانێ لەناڕەحەتی سەرۆکایەتی کــردنی هۆزەکەی • زۆر کەم ئەبینین کوڕی بچوك جێگــای کوڕی گەورە بگرێتەوە ، وەکو مەسەلەکەی بەدرخانی گەورە کە برا گەورەکەی بڕوایەکی ئاینی یەکجار زۆری هەبوو •

بــەڵام لەکوردســتاندا کاتی وازنەهێنــان ، وازنەهێنــەر ئەشـارنەوە ئەمەش وا لەو ســەرۆکە تازە ئەکات لەترسی ئەوەی نەوەکا بــرا گەورەکــەی لێی هەڵگەڕێتــەوە یاخــود یەکێــك لە دەستوپێوەنەکانی بیکوژن هەمیشە دەوروبەری خۆی بەپاســەوان ئەکرێت •

کوشتنی سیاسی لەسەر سەرکردایەتی لەنــاو یەزیدیەکاندا

زۆر ڕوونەدات • بەڵام ئەگەر ئەم سەرکردە تازەیە توانی تواناى خۆى دەرخات‌و خەڵکى لەخۆى ڕازى بکات‌و ڕێزى‌بگرن، ئیتر باسى ئەوە ناکرێت کە چۆن هاتۆتە سەر دەورو فەرمانڕەوایى •

جارى واش هەیە کوڕە دەرکراوەکە لەگەڵ لایەنگـرەکانى خۆیدا ئەچێت بۆ جێگایەکى ترو هۆزێکى تازە پێك ئەهێنێ •

وا زانراوە ژنانیش لەکاتى مردنى مێردەکانیانا سەرکردایەتى هۆزەکانیـان ئەکەن‌و تەنانـەت لەمەیدانى شـەڕیشدا جێگایـان گرتونەتەوە هەروەها ئەش‌بێت سەرۆکى هۆز سەرۆکى هۆزەکانى تر هەڵبژێرن ، خۆ ئەگەر جێگەدار هەمووان خۆشیان نەوێت ، ئەوا ئیتریەکێك هەڵئەبژێرن کەبەشى‌زۆرى جەماوەرى لەگەڵدابێت‌و ئەگەر سـیاسیش بێت خۆ ئەوە گەلێ باشترە • بـەڵام لەکاتێکدا هەڵبژاردن بـەبێ وردبـوونەوە بێت ئـەوا ئەو کاتـە ئەتوانرێ مەسەلەکە بخرێتە ڕوو •

لەڕاستیشدا ئەگەر چۆلەکە لەسەر سەرى دیارى‌کراو نیشتەوە ئەوە ئیتـر واى دائەنێن کە خوا خـۆى ئەمەى دیارى کـردوە ، تا ڕادەیەك چەند بارێکى ڕاستەقینە هەیە کە فۆلکلۆرو کەلەپور ئەیانچەسپێنێ •

لەکاتێکدا گۆڕین‌و دانـانى سەرکردایەتى میـرى بیکات ـ هەروەکو لەناو تورك‌و فارسەکاندا ڕوئەدات ـ ئەبێ ئەو سەرکردە تازەیە لەبنەماڵەى سەرکردەى کۆن هەڵبژێررابێت ، ئەگینا ئەبێ هەمیشە وریا بێت‌و چواردەورى خۆى بەسەرباز بگرێ بۆ پاراستنى‌و بەگوێ کردنیشى •

## دەسەڵاتى تایبەتى سەرۆك :ـ

لەسەردەمى دەرەبەگایەتى‌دا ئەتوانرا دەسەڵاتە تایبەتیەکانى

سەرەك هۆز جیابکرێتەوە بەوەی سەرۆکەکە دەرەبەگێکی سەر بە میری یاخود نوێنەری کەلەپوری هۆز بووە • وە پێویست بوو ئەم دەرەبەگە چەند پیاوێك ڕابگرێو هەموو پێویستیەکانی بداتێ لەسەر حسابی خۆی ئەمە ئەگەر هاتو ناوچەکەی بچوك‌بوو (تیمار) بەڵام ئەگەر ناوچەکەی گەورە بوو بەشێوەیەك ئەو سامانەی دەستی ئەکەوێ لە (۲۰۰۰۰) ئەسپەر (پارەیەکی تورکیە) زیاتر بێت ، ئەوا ئیتر لەکاتی شەڕو شۆڕدا ژمارەیەك سەرباز ئەخاتە ژێر دەسەڵاتی میریەوە • لەلایەکی ترەوە ئەگەر سوڵتان دراوسێی تایبەتی خۆی دانا کە پێی ئەڵێن [تەحصیل دار] ئەوا پارەی باجی هاتوچۆ [باجێکی ناوخۆیی‌یە] ئەگەڕێتەوە بۆ خان •

سەرۆکی هۆز ئەبێ دادپەروەر بێو فریای هۆزەکەی بکەوێو ئەندامانی هۆزەکەی بپارێزێت • بێجگە لەمانە میوان‌داریو نان دانی ئەو میوانانەی بەلای ئەماندا تێ‌ئەپەڕن وا لەسەر ئەم • ئەمە هەمووی ئەبێتە هۆی ئەوەی ببێتە خانەدانو میوان پەروەر •

ئێشتاش چونکە فەرمانڕەوا تازەکان لەهەموو لایەکەوە زۆر بوون ، ئیشوکاری سەرۆك هۆزەکان هەر لەخۆیەوە کەم بۆتەوە• ئەمڕۆش خزمەتی سەربازی بەزۆرەو تەوە نەماوە سەرۆك بتوانێ سەربازی تازە بۆ خۆی بانگ بکاتو ئەمەش لەشوێنەکانی تردا بۆتە ڕواڵەتێکی ناهەموار ، چونکە کورد هەرچەندە حەز لەشەڕیش بکات هەر حەز ناکات خۆی ببەستێتەوە بەخزمەتی سەربازی یاساییەوە ، تەنانەت ئەگەر بو بە سەربازیش ئەو هەر ئەیەوێت سەربەست بێو ڕقیەتی لەسەربازی ڕێکخراو لەیاسادا زۆر جار لە خزمەتی سەربازی هەڵدێنو یاخی‌ئەبن، بەڵام لەباجدانیشا بەمیری هەمیشە دوای ئەخەنو نایدەن • تەنانەت لەم ساڵانەی دوایشا هەروەکو نوسەری کوردی سۆڤیەتی عەرەب شەمۆ کە شوان بووەو

لەپێش شەڕی ١٩١٤دا لە یاداشتەکانیا بۆمان ئەگێڕێتەوە ، داوا کاری فەرمانڕەواکانی تورك هەمەچەشنەو قورس بوون وەکو :ـ (خەرج) باجێـکی دارایی‌یە ، (تۆلام) باجێکە لەسـەر مەڕومالات دائەنرێت • (بێگار) ئیشە بێگاریە گشتیەکان ، (سوخرە) ئیشی بە زۆر بێ‌پارەیە • (سەرێ پەزە)و (سەرێ دەوار) باجێکن لە هەموو سەرە ولاخێکی گەورەو بچوك ئەسەنرێت،مەسرەف‌وبەخێوکردنی‌و میوان‌داری‌و نانخواردنی ئەو فەرمان‌بەرو سەربازانەی کە بەوێدا تێ‌ئەپەڕن هەر لەسەر حسـابی دێیەکەیە • ئەم یاسـایەی ژیان هێنی تورکەکانەو لەناو دانیشتوانی عیراقیشدا کە گیروگرفتیان زۆرە هەر پەیڕەوی ئەکرێت •

بەلام لەبنەڕەتا ئەم سـەرۆك هۆزانە مافی ئـەوەیان نەماوە ئەم باجانە کۆ بکەنەوە،چونکە ئەمڕۆش پیاوی ناو هۆزو لادێکان هەر وەکو جاران هەندێ بەرتیل‌و سەرانە ئەدەن بە ئاغاو خاوەن زەویەکان کە بە خەیالیانا نایەت ئەگەر هەرچی بارو قورسی هەیە بەناوی پارەتی‌دانەوە بیخەنە سەرشانی مسکێنەکان ئەم بەرتیلانە ناوێکی گشتییان هەیە ئەویش (ئاغایەتیە) یان مافی ئاغا لە باتی زەکاتدا ، یاخود دەیەك لە دەسکەوتی کەنم‌وجۆ • سەرەڕای ئەمانە مسکێن هەر لە(٥٠)سەر مەڕ سەرێك یان نرخەکەی بەپارە دائەنێن یان باجی لەوەڕگاو باجی جۆراو جۆر کە لەسـەر بەشـی زۆری بەرهەمی کێلگەکان دائەنرێت ئەیدەن بە ئاغا وەکو :

(نۆنان) لەسەر کەرە ، (هێلکان) لەسەر هێلکە ، (هەرمیان) لەسەر هەرمێ ••• هتد ، ئیتر باسی (میرسەر) یاخو باجی (موچە) بۆ پیاوەکانی ئاغا ناکەین ، سەرەڕای ئەمانە هەمووی باجی ژن هێنان (سورانە)و باجی مەسرەفی ژن هێنانی خزمێکی ئاغا یاخود ئاهەنـگەکانی‌تر کـە پێی ئەڵێن [پیتـاك] • بۆ ئـەوەی ئەمانە

هەموویان بنەخشێنین ، ئیشە بێگاری‌یـەکان‌و جۆرەکانیشی باس ئەکەین ٠

بێگاری (هەرەوەز) یاخود ئیش‌وکاری جووت کردن بۆماوەی دوو سێ ڕۆژ (هەرەوەزی جووت)* ، دروێنەو گێرە (هەرەوەزی دروێنەو گێرە)*، بێگاری ئالف‌و دار (هەرەوەزی گەڵادار) ٠ ئەمانە ئەو باجانـەن کە هەمیشە لە کوردستانی عێراقدا لەسـەر خەڵکی دانراون ، هەروەکـو [سی٠ جی٠ ئادمۆندز] دەری‌خسـتووەو لە تورکیاش تا دوای لابردنی تەواوی ڕژێمی هۆزایەتی لەم جۆرە باجانە هەر هەبوون ٠ بۆنموونە ئاغای (چلیان) پارەی لە هەموو شتێ ئەسـەند ، ئەبووایە هەموو خەڵکی دێکە لە بەهـاردا یەکی سەرێ یان دوو سەر مەڕیان بدایەو لەپایزیشا بارێ یان دوو بار شەربەتی ترێ‌و برنجو گەنمیان بدایەو هەروەها لە جەژنەکاندا دیاری (جەژنانە) ، «عیدانێ» لەسەر بەروبوومی ئاژەڵ‌و دانەوێڵە هەبووە ، هەروەها ئاغا مافی بەکرێ‌گرتنی ئەو زەویانەی هەیە کە نایەڵن کـوڕی شار بەکرێیان بگـرن‌و بۆ هەموو بەشـێك یان پارچەیەك کە لە ٣٠٠ تا ٥٠٠ سـپی‌داری تیابێ ئەوا بەرتیلی لێ ئەسێنرێ کە ئەگاتە پێنج مەجیدی ٠ کاتێ پیاوەکانی میری دێن بۆ سەرژمار کردنی ئاژەڵ بۆ باج وەرگرتن ئاغا ژمارەی ڕاستیان لێ ئەشارێتەوە بۆ ئەوەی لادێیەکان لەباتی ئەم ئیشە باشەی شتی تری بدەنێ ٠ هەروەها باجیان لەسەر ئەو بازرگانیانە داناوە کە بەلای ئەواندا تێپـەڕبوون ٠ لەسەر هەموو سەرێ مـەڕو هەموو بارێ کەرەو هەموشتێکی فرۆشراو باجیان داناوە ٠ هەروەها ئەو کۆچەرییانەی بەوێدا تێ‌ئەپەڕن ئەبوایە باجی ڕانەکانیان بدایە٠ محمود بەگی کـوڕی ئیبراهیم پاشا کە بە [ملی] بەناوبـانگ بوو

---

★ لەهەندێ ناوچەی کوردەواریدا بەم هەرەوەزی جووتە ئەڵێن (گەلەجووت)
★ بەم هەرەوەزی‌یەش ئەڵێن (گەنەدرەو) ٠

باجی لەسەر فرۆشتنی بەروبوومی ساڵانەی مسکێنەکانی دانابوو تا لە دەوروبـەری ساڵی ١٩٣٤دا ئەمـە پەرەی سەند بـە جۆرێ داوای ١٠ قرۆشی ئەکرد بۆ هەر سەرێك مەڕ کە بفرۆشرایە ، وە داوای ٥ قرۆشی ئەکرد بۆ هەر بزنێكو ٥ قرۆش بۆ هەر حۆقەیەك کەرە کە٢٨٤ر١غم بووەو ٧مەجیدی بۆهەر بارێك، ئیتر هەرچی بێت ئەم باجانـەی کە لە قازانجی سەرۆك بوون زۆر گـران بوون ، ئەمانە سەرەڕای مافی سەرۆکە ئاینییەکانو ئەو دەسکەوتانەی کە ڕاستەوخۆ نەبوونو ئاغای دێیەکان ئەیانسەند · مەلای دێیش لە کاتی دروێنـەو جەژنەکاندا خۆی بڕئەخستەوەو هەروەهـا ئەو کەسانەی کە لەسـەر ئەمو ئەو ئەژین (خواردەلەمیش) لەم کاتانەدا داوای بەشە دیاریی خۆیان ئەکرد · هەرچەندە ئەوە نەماوە کە پیاوانی هۆز باج بدەن بەئاغا هێشتا ئەوان هەرچۆنبێت بەبۆنەی جەژنو ژن هێنانو سەردانەوە قەت بە دەستی بەتاڵ ناچن بۆلای ئاغاو لەشـێوەی بەخشیش یاخود دیـاریدا شتێك لەگـەڵ خۆیان ئەبەن بۆ ئاغا* ·

تاکە ئیشی سـەرۆك کە تەنها فەرمانڕەوایی کردنـە ، هیچ نەبێ وەکو ڕەسمی نیە پەیڕەوکراوە · کورد لەجیاتیی ئەوەی لە بەردەم دادگاو قازیـدا بوەستێ زۆرجار بۆ ڕێكوپێـکی ئیشو کارەکانی ئەوە بەباشتر ئەزانێ کە لەبەردەم سـەرۆکی هۆزدا بە گوێرەی (عورفو عادەت) ڕابوەستێ· ئاسایشە ئەم ڕێكخستنو خزمەتگوزارییە بە خۆڕایی ناکرێتو هەموو مەسەلەیەك باجی هەیەو ئەبێ بدرێتو پێی ئەڵێن (حەقی قازیایەتی) یاخود (مافی قازی) ، ئەمە بێجگە لەو باجانەی کە لەسەر خراپە کردن دائەنرێو بەچەند پەنجاییەك دەست پێ ئەکات هەتا ئەگاتە ١٠ دینار ، یاخود

★ لەم ڕووەوە لە کوردەواریدا شیعرێکی میللی هەیەو ئەڵێ :

بە دەستی بەتاڵ نەڕۆی بێدیاری ★ ★ دیاری پێویستە بۆ یادگاری

کوژاننـەوەی ناکۆکیـەکانو هەروەهـا دزیو کوشـتنو لێدانو برینداركردنیش هـەر سزایان لەسەر دائەنرێت • محمـود بەگ باسی هەمووشت ئەکاو باج لەسەر هەمـوو شت دائەنێ وەکو ١٠ لیرەی ئاڵتـوون بـۆ کوشـتنو ٥٠ لـیرە بۆ کوشـتنی پیـاوێکی بەناوبانگو ١٠ لیرەی ئاڵتوونیش لەسەر ژن هەڵگرتن دائەنرێتو ئەبێ باوکی کچە هەڵگیراوەکەش بەقەد کابرای ژنهەڵگر بدات •

لەکاتی دزینی ئاژەڵـدا ئەبێ نرخی دزراوەکە بـدەنەوە بە خاوەنەکەی یان چوار سەر بدەن بە سەرۆك ، بەڵام ئەگەر هاتو دزراوەکان پەلەوەری هێلکەکەر بن ئەوا سەرۆك تەنها دووسەر وەرئەگرێت •

لە سەدەی نۆزدەهـەمدا هەندێ سـەرۆك لە قەلاچـۆکردنو نەهێشتنی دزیدا لە ناوچەکانیانا توندو تیژییان بەکار هێناوە بە جۆرێ کە هیچ جۆرە سەرپێچییەك ڕووینەداوە •

هەروەها (مـیری کۆرە)ش لـە ڕەواندزو (مـیر بەدرخان)ی جەزیری ئەم شـتەیان هەروا کردووە • مەحکەمەی پیـاوکوژ بە تۆڵە کراوە ، خاوەنی کوژراوەکە مافی تۆڵەی خۆیان لە پیاوکوژ وەرنەگرت ، کە هەر لەوکاتەدا بۆ ماوەی پێنج ساڵ یان زیاتر لە هۆزەکەی دەرئەکرا ، ئەگەر خاوەن مافەکان لەم ماوەیەدا توانیان پیاوکوژ بکوژن ئەوا مەسەلەکە چارەسەر ئەکرێ ، ئەگینا دوای کۆتاییهاتنی ماوەکە پیاوکوژەکە ئەتوانێ داوای وەرگرتنی ڕای شێخەکان بکاتو بەپشتیوانیی ڕای سەرۆکەوە بگەڕێتەوە بۆ ناو هۆزەکەی خۆی•• بەڵام هەمیشە مافی تۆڵەسەندن هەر ئەسەنرێو ئەشتوانرێ لەسەر دانانی نرخی خوێنەکە ڕێبکەون • دانانی ئەم نرخەش ئەبێتە هۆی وەستانـدنی خوێنڕێژیی تازە ، چونکە وا ئەزانرێ ئەگەر مافی کوژراوەکە نەسەنرێ خوێنئەڕێژرێ ، بەڵام

ئەم جـۆرە ڕێکەوتنــە لای هەمـوو کوردەکان پەســەند نــیە ، چونکە ئەوان لە تۆڵەسەندنا تفەنگ پێوەنان یاخود خەنجەر لێدان بە باشتر ئــەزانن • هەموو جــارێ ئەگەر هاتو تاوانبــار کفنو شیرەکەی لەسەر ملی داناو هاتە لای خاوەن مافو خۆی دایە دەست لێبوردنی ئەوان ، ئەوا ئیتر ئەم جۆرە ڕێکەوتنە ناتوانرێ بدرێتە دواوە •

## دۆستو دوژمنی سەرۆک :

لەکاتی ناخۆشــیدا دەســەڵاتــەکانی ســەرۆك بەتــەواوی کەم ئەبێتەوە ، کە ئەتوانرێ بەربــەرەکانێی دەســەڵاتەکانی بکرێ بە جۆرێ زۆرجارو زۆر بە توندیش لەلایەن بەرگرێکەرەکانیەوە کە هیچ جۆرە هۆزێك یان تیرەیەکیان نیــە هێرشی بەرێتە سەر . لە ڕیزی پێشــەوەی ئەمانە پیاوە بەناوبانگەکانی شارن کــە خاوەن زەویوزارو خانووبەرەن دامەزراونو دێو زەوی‌وزاریان هەیەو لە شارەکاندا لای میری لە دادگــاکانو لای قازیــەکان ئیش‌وکاری خەڵکی هۆزەکانیــان ڕائەپەڕێننو پارەیان ئەدەنێ بە قــەرزو بە هەموو شێوەیەك یارمەتیان ئەدەن • شتێکی ئاسایشە کە ئەمانە لە شارەکانا دائەنیشنو زۆرجار ئەقیرەکانیان لەجیاتی ئەوەی بچن بۆ لای سەرۆکی هۆز ئەچن بۆلای ئەمان کە ئەت ئەفیری لەوانەیە لە ڕۆشنبیریشدا دەر لەمان کەمتربن •

لە عێــراقدا هەندێ ســەرۆك دەستیان گرت بەســەر زەوییە کشتوکاڵییەکاندا بەنــاوی ئەوەوە کە ئەو زەوییانە موڵــکی ئەو خێزانەن کــە بە گوێرەی عــورف وەکو لەوەڕگای هــۆز داگیریان کردووە هەتا وایان لێهاتووە بوون بە خاوەن موڵك •

لەم کاتەدا ئەم سەرۆکانە ــ بەتەواوی وەکو هەندێ خێزانی فەرماندە ئێرانیــەکان ــ بوون بــە گەورەترین خــاوەن موڵکو

پەیوەندییەکی پتەویان هەیە لەگەڵ بۆرژوازیەکانداو هەروەکو ئەوان ئەمانیش لەبازرگانیدا هاوبەشیان ئەکەن .

بە هەر شێوەیەك بێت ئەگــەر خاوەن زەویەکان توانیان لە دەسەڵاتی ســەرۆك هۆز کەمبکەنەوە ، بەمە هیچ لــە نارەحەتی ی جوتیار کەم ناکەنەوە ، لەڕاستیدا جوتیار هەتا ئێستاش هەر وا لە ژێر قورسایی ئەرکو ئیش‌وکاری ئاغاداو هەر ئەناڵێنێ بە دەست خاوەن زەوی‌یەوە .

لە هەموو کاتێکدا ئاغا بەتێرێ دوو نیشانە ئەشکێنێ ، ئەگەر لەدانانی زەوی‌یە کشتوکاڵیەکاندا بێ هەر خۆی سەرئەکەوێت ، هەرچۆن بێت ســاڵ کۆتایی دێت‌و جوتیار ســفر هیچ بەدەستەوە ئەبێ‌و بووشــە بەژێر قەرزێکی زۆرەوە ، چونکە خــاوەن زەوی نیوەی بەرووبوومی هاوینە وەکو تووتن‌و لۆکە لە جوتیاری کورد وەرئەگرێت ، کە لەوەدا مافی زیاتری هەیە لە جوتیاری عەرەب . لە بەرووبــوومی زستانەشدا لە گەنم‌و جۆ دەیــەك وەرئەگرێت ، ســەرەڕای ئەوە ئەو باجەی کە کەوتۆتە سەریەك ، ئەبێ بیدات بە نوێنەری میری کە ئەویش ٥ر٧٪و ١٠٪یە .

هەندێ بــەشی بچووکی‌تریش هەیە دابەش ئەکــرێت بەسەر خزمەتکارو دەست‌وپێوەندی سەییدا ، ئا لەمەوە ئەوە تێ‌ئەگەین کە لەژێر سایەی یاسایەکی وادا ڕاپەڕینی جوتیارەکان زۆر دوو بارە ئەبێتــەوەو ئەبێتــە هــۆی ئــەوەی بەکۆمەڵ کــۆچ بکەن‌و زەویەکانیان بــفرۆشن‌و بەتایبــەتی ئــەوانەی دەســکەوتیان لە مانگێکدا لەوانەیە نەگاتە ٥٠٠ـ١٠٠٠ فرەنکی کۆنی فەرەنــی .

هەتا ئێســتاش لە کوردستانی تورکیا خاوەن موڵــکی گەورە ســەرکەوتوو خاوەن دەسەڵاتن .

لە عێراقیشدا بــە هیچ جۆرێك ئەو یاسای چارەســەر کردنی

کشتوکالیە جێبەجێ نەکراوە کە شۆڕشی چواردەی تەمموز بڵاوی کردەوە، چونکە دەرەبەگە گەورە خاوەنزەویەکان هەوڵی ئەوەیان دا کە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان ئیدارەی لەگەڵدا بکەن(٨) •

ئەوەی شایانی باسە ئەم کارە بۆ یەکەمجار یەکێ لە کوردەکانی سوریا کە ناوی (حسین ئەبەش) بوو و خاوەن ملکێکی گەورە بوو جێبەجێی کردوو ئەمەش دوای شەڕی دووەمی جیهانی بوو ، لەپێش ئەوەشا کە میرییەکان بیری لێ بکەنەوە ئەم خاوەن ملکە دەستی کرد بە کۆکردنەوەو بەکارهێنانی ٢٤٠٠٠ هکتار ئاو لە زۆنکاوەکانی دۆڵی (ئۆج) کە بە نرخێکی باش لە (هیجانا)ی کڕیبوو کە ٣٠کم لە دیمەشقەوە دوورە •

ئەم زەوییەی ئامادە کردبوو بۆ کشتوکاڵی بەرئاوو دێمو ٦٠٠٠ خێزانی تیا دانیشتبوو ، نزیکەی سێیەکی ئەم زەوییانەی تەرخان کردبوو بۆ جوتیارانو هەرچی خاوەن بەرژەوەندی هەبو لەو کاتەدا سامانەکانیان خستە ئەم دەسکەوتەوە •

بەربەرەکانی‌کەرێکی سەرۆك هەیە ، بەتایبەتی لەناو کۆچەرەکاندا ئەویش (تۆبەباشی)یە کە سەرۆکی تیرەیە ، پارچە بچکۆلەکان لە ٢٠ تا ٢٥ دەوارێك کۆ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بیان‌کات بە پارچەیەکی گەورەو چەند هەزارێکیان لێ پێك بهێنێ •

ئەم سەرۆك تیرەیە (تۆبەباشی) لەناو کوردەکانا شوان هەڵ ئەبژێرێو جێگای لەوەڕاندنو شێوەی کۆچ‌کردنیان بۆ دیاری

(٨) ئەوەی شایانی باسە . میری شۆڕشی ١٧ی تەموز . یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵی ژمارە (١١٧)ی ساڵی ١٩٧٠ی بڵاوکردەوەو . بەڕاستی لەزۆر شوێنی کوردستاندا جێبەجێ کراوە★

★ هەر لەم ڕووەوە میری لەعێراقدا لەساڵی ١٩٧٥دا یاسای چارەسەری بنەڕەتی ژمارە (٩٠)ی دەرکرد کە لەناوچەی کوردستاندا خاوەن موڵکی نەهێشتو ئەجامێکی باشو سود بەخشی هەبوو بۆ جوتیارانی ناوچەکە •

ئەکاتو هەمــوو کەس بەگوێرەی گرنگیی ڕانەکەی خــۆی پارە ئەدات ، ئەم ڕێکخەرەش هیچ شتێك ناداتو بێجگە لەوەش هەندێ خزمەتگوزاری بــۆ ئەکەن ، شتومــەکەکانی بــۆ ئەگوێزنەوەو دەواری بــۆ هەڵئــەدرێو بــۆشی ئەپێچرێتــەوە • ئــەم ڕژێــمی چەوساندنەوەی ئابووریـیــە ـ وەکــو نووســەرە سۆڤیەتیەکان دەریان خســتووە ـ نەژادێــکی تورکییەو ـ دەســەلاتی ســەرۆك هۆزەکانی کەمکردۆتەوە •

دوای ئەمانە زۆرجار سەرۆکو شێخە ئاینییەکان هەوڵی ئەوە ئەدەن دەســەلاتی تایبەتی سەرۆکی هۆز بوەستێننو بــە بیانووی ئاینەوە ئەڵێن دەوری سیامی هەموو کاتێك کەلکی نیەو لەدوایشدا ماوەمان ئەبێت دووبــارە بگەڕێینەوە سەر باسی کاری ئــەم پیاوە ئاینیانە لەناو کوردەواریدا •

## ٣ ـ کەمبوونەوەی قەوارەی هۆزایەتی :

ئەگەر هەتا ئێستاش ســەرۆك هۆز هەبێتو ڕەسمییەن بڕوا پێکراو بێت ، بەجــۆرێ لەلایــەن فەرمــانڕەواکانی عێــراقو ئێرانەوە دانرابن ، لە تورکیاو ئەرمینیــای سۆڤیەتی ئەم شێوەیە رانیەو هەموو دەسەلاتێکی هۆزایەتی لابراوەو هەندێجاریش زۆر بەبێ ڕەحمانەو بە زۆر لایئەبەن • خــۆ ئیتر لای سۆڤیەت ئەوە هیچ گومانی تیا نیە کە لەگەڵیا ڕێناکەون •

[ ئەمین عەبدال ] بەپەرۆشەوە بۆمان باس ئەکاتو ئێمەش هاوبەشیمان کردووە لەوەدا کە نووسیویەتیو ئەڵێ :

زۆر شت لــە ســــەردەمی کۆنــا هەبــوونو ئێســــتا دوور کەوتوونەتەوەو نەماون• لەمەولا پیاوی شێخو خزمەتکاری ئاغاو

بەگەکان نامێنێ • بەڵام هەتا ئێستاش لە تورکیادا هەندێ خوو ڕەوشتی کۆن ماونو سەرۆکەکانیش هەر بە تەواوی تیانەچوون• هەرچۆن بێت ئێستاش کوڕو منداڵـە بچووکەکانیان هەر ئەژینو ماوون •

هەروەها لەناو جەماوەریشداو لـە هەندێ لە ناوچەکاندا تا ڕادەیەك ڕێزی خێزانە خانەدانە کۆنەکان هەر ئەگیرێو نووسەرە سۆفیەتیەکانیش وەکو کوتلۆڤ Kotlov و ڤیلچیڤسـکی دانیـــان بەم ڕێزگرتنەدا ناوە •

ئەگەر بڕوامان بە قسەی گەنجێکی کورد هەبێت کە لە ساڵی ١٩٥٩دا لـە ئەستەنبـوڵ پێی وتم «ئاشـکرایە کە هەنـدێ لە هۆزەکان یەکێتییـان تیانەماوە ، سـەرۆکەکانیان هـەوڵی ئەوە ئەدەن سەرلەنوێ دەسەڵاتی خۆیان وەربگرنەوە ، نەك لە پێناوی هۆی دەرەبەگایەتیدا بەڵکو بۆ چەسپاندنی خزمەت گوزاری تازە بۆ قەوارەی کۆمەڵایەتی •

منداڵانی دەرەبەگە کۆنەکان بوون بە پارێزەرو پزیشكو وان لە خزمەتی سـەرۆکە پێشووەکانیـانداو هەروەها ئەمانە لەکاتی هەڵبژاردنی پەرلەماندا لەبیرناچنو ئەوا ئیتر قسەی پێشوو زۆر لە ڕاست ناچێت» •

کەواتە ئەوەتا خانەدانێکی تازەیەو بیروڕاکانی وەکو بیروڕا تازەکانی ئێمە وایە ، هەر لەم ڕووەوە یەکێك لەو کوردانەی لە بەیرووتەوە کۆچی کردبوو ، بۆی ڕوون کردمەوەو وتی :

ئەم هەموو خزمەت کردنەی ئاغای هۆز هیچ نیە هۆنینەوەی مێژووی کۆن نەبێت ، ئێستا ئەگەر ئـەم سەرۆکە ئیشێکی هەبێت ئەبێ ئەمیش وەکو خەڵکەکانیتر ئیش بکات • کەواتە پێشکەوتن لە برەودایەو وایش دەرئەکەوێ کە ناگەڕێتە دواوە •

کۆبوونەوە لــە وڵاتە عەرەبیەکاندا وەکو عێــراق‌و سوریا کاری کردۆتە سەر کەم‌کردنەوەی دەسەڵاتی سەرۆکەکان • ئەوەتا ژمارەیەك فەرمانبەر هەن خەریکی ئیش‌وکاری دادپەروەری‌و باج وەرگرتنن • چارەسەری کشتوکاڵیش کە بڵاوکرایەوەو پلانی بۆ کێشرا ئەبێتــە هــۆی تونــد کردنــەوەی خێــرایی ئــەم گۆڕانە کۆمەڵایەتی‌یە •

هەروەها وا دەرئەکەوێت ئەمە لە ئێرانیشدا هەر ڕوو ئەدات کە هەتا ئێســتاش پەیوەندی لەنێوان هۆزەکاندا زیاتــر قووڵ‌و پتەون • بەڵام لەگەڵ دامەزرانی کۆچــەرو هات‌وچۆکەرەکانداو لەگەڵ کۆبوونەوەی ئیداریدا ، لەوانەیــە نزیك بێ یاخود دوور هەموو جۆرە ڕژێمێکی هۆزایەتی لەناو کوردەکاندا نەمێنێ •



# خێزان

ئەگەر هاتو کورد لەژێر دەسەلاتی هۆزدا ژیاو یا بەتەواوی سەربەست لەپەیوەندییەکانی هۆزایەتیو یاخود لەناو دەوارنشینە چیاییەکاندا شوان بوو ، یاخود بەتـەواوی نیشتەجێ بێت وەکو وکاندارو جوتیـار لە دێیـەکەدا یاخـود وەستایێت لـە شاراو کرێکارێکی شـارەزا لە ئیش‌وکـاری بەربەستداو لـە دەرهێنانی نەوتدا ژیانی بردە سەر ئەو هەرگیز بەتەنها ناژیو بەلکو ژنو منالی هەیە ٠

ئایا خێزانێکی کورد لە چیـاکاندا وەکو خێزانێکی عەرەبی کۆچەر وایە ؟

ئایا ئەتوانرێت بەراورد بـکرێن لەگەڵ خێزانی جوتیارێك یاخود شـارستانیەك ـ ئاشـوری بێ یا ئەرمەنی ـ کە لـە نزیك ئەوانەوە ئەژی ؟

با بچینە ناوماڵێکی کوردەوە ئەوکاتە کتوپڕی خۆش‌خۆشمان دێتە ڕێگا ٠

**١ ـ خۆشەویستی لە کوردستاندا گاڵتەی پێناکرێت :**

خێزانی کـورد لەپێش ڕواڵـەتی کۆمەڵایـەتیو ئابووریدا

ڕواڵەتێکی ئـاینی هەیە • بێگومان ئەم ڕواڵەتـەش کار ئەکاتە سەر گـەنج لەپێش ژن هێنانیدا • لەپێش هەموو شـتێکدا هەموو کورد لە تەمەنی منالّیدا ژن ئەهێنن‌و هەرزەکاری لە کوردستاندا ماوەی زۆر نیە ، نەك تەنها بەوەی کە ئەم پەندە ئەڵێت : (پیاوی تەنهـا لاوازە ، ژنی تەنهـاش سـەرلێشێواوە) بەڵـکو چونـکە کۆمەڵیش ماوە نـادات بە کچی هەرزەکارو بە چاودێـری کردن‌و گومان لێکـردن ئازاریان ئەدەن • سەرەڕای ئەمەش کـورد هەر زوو ژن ئەهێنێ ، کوڕیان ناگاتە بیست ساڵی تەواو ، جێی سەر سووڕمانیش نیـە کە کچیان لە دوانـزە بەهاردا شو بـکات‌و ئەم کیژۆڵە کـوردە ئەبێتە کەیبانووی ناومالّی تـەواو ، لێپرسراوی ئەو ئیش‌وکارەیە کە ئەکەوێتە سەرشانی • ئەمڕۆش ئەیانەوێت تەمەنی ژن هێنان نەختێك دواخەن بەتایبەتی لە شارەکانداو ئەو گەنجانەی خەریـکی خوێندنن • هەروەهـا دوای ئـەوەش یاسای شارستانیەت تەمەنێکی دیاری‌کراو بۆ ئەم مەبەستە دائەنێت •

بێگومان ئـەم ژن هێنانـە لەم تەمەنـە کەمەدا یەکێـکە لەو هۆیانەی وای لـە کورد کردووە نـەزانێت داوێن‌پیسی چیـەو بە زاراوە تورکیـەکان نەبێت نەتـوانێت باسیان بـکات • هەرچی مالّێکیش لە شـارە بچووکـەکانی ئێـران‌و عێـراقدا وا بوون داخراون‌و نەماوون •

من سی سـاڵ لەمەوبـەرم لە یـادە ، لە دێیـەکی کوردستانی سوریادا لە جەزیرە سەربازگەیەکی لێبوو لەگەڵ مالّێکی داوێن پیسدا کە ڕەسمی نەبوو ، هیچ کەسێ هاتوچۆی نەئەکردن تەنها ئەو فەرمانبـەرە تورکانە نەبێ کـە لەوبەری سـنوورەوە نزیك بوون •

لەناو کوردەواریدا خۆشەویستی بۆ هەڵخەڵەتاندن نیە ، بە

شێوەیەکی گشتیش ئەگەرچی هەتیوبازیش (لوطیە) لە سلێمانی هەیە بەڵام خەریکبوونیشی ئەبێتە هۆی سوکێتیو ڕقلێبوونەوە ٠

چونکە کوردەکان هەموویان موسڵمانن ڕێیان دراوە کە لە ژنێك زیاتر بهێنن ، لەکۆندا سەرۆکەکان گەلێ ژنیان ئەهێناو منالی زۆریان لێیان ئەبوو ، ئەمەش لەبەر باری سیاسی بووە ٠

ئەمڕۆش پاشماوەی ئەمە خەریکە زیاتر بەرەو نەمان ئەچێو بەلکو هەر نەشماوە ، بەڵام لە ناوچە شارستانیەکاندا کە هێشتا هەندێ لە خەڵکەکەی شارستانی نەبوون هەر ماوە ، بەڵام ئەمیش لە دوو ژن زیاتر نا ٠

بەهۆی باری ئابووریەوە لە لادێکاندا یەك ژن باوە ، ڕادەی هەوێساریشیان لە ٢٪ تێناپەڕێت ، چونکە خەڵکەکە لەوە ئەترسێ کە بکەوێتە ناو نارەحەتی خێزانی تێکەلاوەوە یاخود ئەو پەندەیان دێت بەخەیالدا کە ئەلێ ژنەوەی دوو ژن بهێنێ ئەبێتە دەرگاوان[*] ٠ ژنهێنان لەیەکێ زیاتر هۆی تایبەتی خۆی هەیەو لەوانەش ئەنجامی نزیکبوونەوەی گەنجەکانە لە شارستانیەتی ڕۆژئاواوە ، هەر لە بەرانبەر ئەمەوە ژن هێنانی یەك لەدوای یەکیش لەئەنجامی تەلاقدانو مردن لەناو کەورەپیاوانی لادێکاندا ئەدی ئەکرێت ٠

(شێخی شەدەلە) لە عێراق بەسە بۆ نموونە کە لە ژیانیاو لە تەمەنی درێژیدا ١٩ ژنی هێناوە ! هەروەها تەلاقدانیش تا ڕادەیەك کەمە ، خۆ ئەگەر هەشبێ هۆی سەرەکی ئەوەیە کە ئافرەت منالی نابێت یان منالی ئەبێو کوڕی نابێت ٠ بەشێوەیەکی گشتیش ڕقیان لە بێوەژنە ٠ ئەگەر پیاوێك ژنەکەی سێ بە سێ تەلاقدا ئەوا ئەبێ ئەو مارەییەی کە لای ماوەو زۆر جار ئەکاتە

---

★ لەم ڕووەوە کورد پەندێکیتری هەیەو ئەلێ [پیاوی دوو ژنە جەرگی کونکونە]٠

نیو یان سێ‌یەکی ماڵ بیدات بە ژنەکە •

لەناو کـوردەکانی (کردداغ)دا لە مارەییا شـتێکی بێ‌بایەخ نەبێت هیچی‌وا نادەن‌و لە هەمـوو کاتێکیشدا منداڵ ئەدرێتەوە بە باوك • جیابوونەوەش لەسەر ڕێکەوتنی هەردوولا زۆر کەم ڕوو ئەدات‌و ژنێك کە بەهۆیەکی سەرەکی‌یەوە تەڵاق بدرێت بەدەگمەن شو ئەکاتەوە ، بێجگە لەوەش گۆرانی‌یەك هەیە ئەڵێ : [پیاوانی نالەبار واز لە ژنی جوان ناهێنن بەڵکو ئەیکوژن] •

ناشتوانین بڵێین کە لە کوردستاندا خۆشەویستی سەربەستانە نیە ، لەوانەشە سەیر نەبێت ئەگەر کوڕە کورد دۆست‌و دەسگیرانی هەبێت ، بـەڵام ئەمەش بەزۆری لە غەریبایەتیداو لـە ئەورووپاو ئەمەریکا لەکاتی خوێندندا ڕوو ئەدات‌و ئەم گەنجە ئەوە نایەت بە خەیاڵیا کە ئەم ژنە بهێنێت بۆ وڵاتەکەی خۆی ، هەندێکیش مارە کردنی ئاشـکرا بە باشتر ئەزانێت • بەڵام مەسـەلەی زیناکردن ئەبێ داپۆشرێ‌و بشارێتەوە ، چونکە کچەکە چاك ئەو پاشەڕۆژەی خۆی لەبەرچـاوە کە چـاوەڕوانی ئـەکات‌و ئەگـەر گوناهەکەی دەرکەوێت ئـەزانێت بەدەسـتی بـراکەی یاخود یەکێ لـە خزمە بەغیرەتـەکانی‌و لەپێنـاوی پاراسـتنی شـەرەفی خێزانەکەیاندا ئەکوژرێت، ئەمەئەنجامی هەموو کچێکە کەبکەوێتە پەیوەندییەکی ناوانبارانەوە •

زۆر جاریش ڕێك‌ئەکەوێت کە دادگا مەدەنیەکان لەپیاوکوژ ببوورن ، بێ‌گومان ئەم ئەرکە کۆمەڵایەتی‌یە بەس نیە بۆ ئەوەی گەنجەکان بخاتـە سەر ڕێـگای ڕاست ئەگـەر ڕەوشـتی چـاك‌و داڕێژراویان نەبێت •

## ٢ ـ ئامادەبوون بۆ ژن هێنانو دەسگیرانی :

ئاساییە کە پیاوی کورد مێردێکی باشەو باوکێکی دڵنەرمە • بێگومان دروست کـــردنی ئەم خێـــزانەش هەڵبژاردنێـــکی چاکی ئەوێت ، چونـــکە ئەو مەسەلەیە گرنگی تایبەتی خۆی هەیـــە ، کە ئەبێت ڕەچاو بکرێت ، جگە لە شەخسـیـەتو جوانیی ئافرەت کە ئەچنە سەر مەسـەلەکە ، هەروەکو ئەڵێن :

(مەڕوانە بۆ ژن ، بڕوانە بۆ کەس‌وکاری) •

( ژن مەهێنە تا خاڵۆی تاقی‌ئەکەیتەوە ) •

لەڕاستیدا باشترین هەڵبژاردن لە ئافرەتا کچی مامە ، چونکە ئامۆزا ئەگەر مارەییش لە خەڵکی کەمتر بدات هەر خاوەن مافە . وە هەر ئەم مافەیە کە دەسگیران واڵێ‌ئەکات ، چەردەیەکی دیاری کراو پارە بدات بە ئامۆزای کچەکە ، لەپێناوی ئەوەدا کە وازی بۆ لێ‌ئەهێنێت ، ئەگینا لەوانەیە کچەکە هەڵگرێت ، بەتایبەتی ئەگەر کچەکە ڕازی‌بێت • لەکاتی هەڵگرتنا هەردوو هەڵهاتووەکە خۆیان ئەدەنە دەست پارێزگاریی سەرۆك هۆزێکی دراوسێیان کە توانای هەبێت باوکیان هێمن‌بکاتەوەو مەسەلەکەیان بۆ ڕێك‌بخات •

لە هەموو بارێکدا چونکە مەسەلەکە چەسپاو نیەو مەسەلەی شەرەفە ، کوڕەکە زۆر ڕێزی کچەکە ئەگرێت• بەڵام ئەگەر کچەکە شووی کرد بە نامۆیەك ئەوا ئامۆزا دورخراوەکە [یان ئەو کوڕەی کە لە مافی خـــۆی بێ‌بەش کراوە] وازناهێنێ لە کوشـــتنی کچەکە یاخود کوڕەکە یان هەردووکیان بەیەکەوە• هەرچۆن‌بێت پەندێك هەیە ئەڵێت (ئـــەوەی ئەیـــەوێ ژن بهێنێت ئـــەبێ توورەکەیەك پەنجایی‌و باقەیەك درۆی هەبێت) •

هەروەها ناتوانیت شازادەیەك مارەکەیت بە سامانی شوانی گاگەلێك •

له لادێکاندا ، گەنجەکان لەسەر کانی یان لەکاتی ئیشوکاری کێلگەکاندا بەیەك ئەگەن‌و لەناو کۆچەریەکانیشدا هەر لە کاتی ئاهەنگە سالانەییەکاندا بەبێ‌شەرم هەڵئەپەڕن ، چونکە نابێ داوێن پاکی‌و بێ‌شەرمی تێکەڵاو بکرێن .

کچە کورد ئەمە زۆر چاك ئەزانێ هەر ئەوانن کە لەکاتی گەڕانەوەیان لە هاوینە هەوارەکان‌و بەدەم تەشی ڕستن‌و گوێزانەوەی ڕاخەرە ڕەنگاوڕەنگەکانیانەوەو هێنان‌و بردنی تاژەڵەوە گۆرانیی خۆشەویستی ئەڵێن، ئەمانە لەگۆرانیەکانیاندا هەستێك دەرئەبڕن کە بە هەموو شوێنێکدا بڵاو ئەبێتەوەو دڵ پڕ ئەکەن لە خۆشەویستی‌و زمان ئەهێننە گۆرانی وتن ، بەلام لەم گۆرانیانەداو بە شێوەیەکی ناوخۆیی وشەی توێکڵ‌دار ئەڵێن‌و بە تیروتوانج باسی شێوەکانی خۆشەویستی ئەکەن‌و هەست بەجوانی‌و لەنجەو لاریان ئەکەن‌و لایان گرنگ نیە کە ئەمە دووبارە بکەنەوە بە پەلکەی قژی کاڵ‌و چاوی ڕەش کە لە چاوی ئاسك ئەچێت‌و بە لەنجەولارەکەیان کە لە لەنجەی قازو مراوی‌یە کێوی‌و کەوی دەشت ئەچێت خۆیان بائەدەن .

ئەمانە هەروەکو (حفصدە Heftsada ) لەکاتێکدا کە ویستی ئەسپی ئامۆزاکەی ئامادە بکات ، ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ئەوەی هەرچی هەیە لە ئاڵتوون‌و جەواهێرات بیکات بە قوربانی لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا بە گۆرانی‌یەوە ئەیوت :

گوارەکەم پێلاوی لێ‌دروست ئەکەم
بازنەکانم ئەکەم بە بزمار
بە نینۆکەکانم پشتێنت بۆ ئەچنم
پەلکەکانم ئەکەم بە ڕەشۆی ئەسپەکەت

کچە گەنجی کورد ئەوەندەی هەیــە کە لێی ســەرسام ببیت ، زۆر جوانەو دڵ ڕفێنەو بە ڕێکەوتیش دڵ ڕەقە • (لەدوای هەموو قژێکی کاڵــەوە سمێڵێکی ســوور هەیە) ، لێــرەش وەکــو هەموو جێگایــەکی‌تر [گــەورە کــچ پەرســتگایە] • لەشـــاراو لەنـــاو دەوڵەمەندەکاندا کچ‌و کوڕ بەئاسانی بەیەك ناگەن ، کوڕ شەرم ئەکات لەوەی کە ئارەزووی خۆی لەپێك‌هێنانی ماڵ دەربیڕێت ، ئەگەر لەتەمەنی ڕابواردویدا حەزی لەکچێك نەکرد کە خێزانەکەی بناسن ، ئیتر لەم کاتەدا دایکی کوڕەکە دەست ئەکات بەگەڕان بە دوای بوکی داهاتوی‌دا ، دوای ئەوە ئیتر سەردان دەست‌پێ‌ئەکات بۆ دۆزینەوەو ناسینی ئەو کچانەی کە کاتی شویانە ، خۆ ئەگــەر دایکەکە یان ژنێکی خزمیان ڕازی‌بوون بەوەی ئەوەی ئەمان بۆی ئەگەڕێن دۆزیویانەتــەوە ، ئیتر یەکســەر بە پەرۆشــەوە باسی سیفاتی مادی‌و مەعنەوی دۆزراوەکە ئەکەن بۆ کوڕەکە • ئەگەر کوڕەکە ڕازی بوو ، کەسوکاری کچەکەش ڕازی‌بوون ، ئیتر دایك یاخود پوری کوڕەکە یاخود هاوڕێیەکی نزیکیان لەژێرەوە ئەچن بۆ ماڵی کچەکەو دیاریەکی بۆ ئەبەن ، ئەگەر وەری گــرت مانای ئەوەیە ڕازی‌بوون ، ئیتر ئەمە دەسگیرانی‌یە •

کچ ئەتوانێ بەو شوە ڕازی نەبێ ، بەڵام ئەم ڕازی نەبونە بە سوکی دائەنرێت ، لەلایەکی تریشەوە بەتەواوی بــاوك ناتوانێ کچەکەی بەزۆر بدات بەشو ئەگەر خۆی ڕازی‌نەبێت • دوای ئەوە باوك یان مامە یان برا گەورەی کوڕەکە بەئاشکرا ئەچن بۆ داوا کردنی کچەکە •

بەم بۆنەشەوە مێوژو شیرینی تر پێش‌کەش ئەکــرێت‌و بەم شیرینیەش ئەڵێن [شیرینی خواردنەوە] •

نرخی مارەیی بەگوێرەی قورئان دیاری ئەکرێت‌و بەگوێرەی ناوچەش ئەگۆڕێ‌و لەپێشانا باسی ڕادەی کەم‌و زۆری مارەی‌یەکە ئەکەن بۆ ئەوەی لەگێرەوکێشەی ناو خێزان دورکەونەوە ، چونکە زۆرجار ماوەی ئەوە هەیە زۆروکەمی تیابکرێت٠شتێکی سرۆشتیە بە گوێرەی ناوچەکان‌و باری ئابوری کەسوکاریان ئەم مارەییە هەر ئەگۆڕێت هەروەها ئەش‌زانین کە کوردەکانی ئەرمینیای سوڤیەت هێرشێکیان کرد لەدژی ئەم ڕەوشتە چونکە لەنرخی مرۆڤایەتی ئافرەت کەم ئەکاتەو٠٠بەشێوەیەك وەکو ئاژەڵ وایێت، چونکە ئەم مەسەلەیە دوپات ئەکەنەوە ئیتر ئەوە ئەگەیەنێ کە ڕەوشتێکی زۆر بنەڕەتیە ٠ بەڵام ڕواڵەتی کرین‌و فرۆشتن کە زۆرجار لەگەڵ عەقلی ئێمەی ڕۆژئاواییدا ڕێ‌ناکەوێت ، لای ئەوانەی کە شو ئەکەن وا نیە ، چونکە وا ئەزانن ئەم شێوەیە گرنگی ئەدات بە شوێن‌و جێگای ڕاستەقینەیان ، هەروەکو خاتو [هانسن] پێی وتین ٠ ئەمەش تێ‌ڕوانینێکی باشە ، هەرچەندە کە نەوەی تازە ئەم ڕایە بەباش نازانن ٠

ئاشکراشە کە لەڕاستیا هەندێ باوك هەن بەتوندی داوای مارەی‌یەکی زۆر ئەکەن،گەلێ‌جار زۆر بەرزترە لەمەسرەفی بەشی زۆری لادێیەکان‌و ئەبێتە هۆی ئەوەی ژن زۆرگران دەستکەوێت٠

بۆ زانینی شتێك لەم مەسەلەیە ئەوەتا خاتو [هانسن] هەندێ حساباتی نارەحەتی ساڵی ١٩٥٧مان بۆ باس ئەکات ، لە [بەڵغە] مارەیی کچێکی دوانزە ساڵ (٢٠) دینارە ، لە [تۆبزاوا]ش مارەیی مامۆستایەك کە خەڵکی سلێمانی‌یە (٢٠٠) دینارەو هەر لەسلێمانی خۆی بەرزترین مارەیی ئەگاتە (١٥٠٠) دینار لەگەڵ (٧٥٠)دینار مارەیی دواخراو بۆکاتی تەڵاقدان ٠ لەناو یەزیدیەکانیشا مارەیی ئەگاتە (٤٠)دینار ، لەکاتێکدا کە لەناو کوردە نەسرانی‌و کلدانی‌یەکانی عیراقدا ڕادەی مارەیی قەشە دیاری ئەکات ، بۆ

ئەوەی لەچەوساندنەوە دوربکەونەوەو هەندێ جاریشس بەدوو خوشك ژن بەژن ئەکەن‌و ئەمەش شوێنی مارەیی ئەگرێتەوە ٠

دوای ئاشکرا کردنی مەسەلەکەو داواکردنی ئیتر بوکو زاوا ئەتوانن یەکتر ببینن ، دوای چەند مانگێك یاخود سالێك هەردوو دەسگیران ئاهەنگێك ئەگێڕن بەناوی [دەسگیرانی] یاخود [دەزورانی] کە لەناو خێلی حەقەکاندا هەیە ٠ ئێستا کارەکە مەیسەر بوە بۆ ئەوەی نانخواردنێك ئامادە بکەن بۆ خێزانەکانیان لەدوای ئەم شتانە لەجیاتی دیاری میوانە بانگ‌کراوەکان هەندێك پارە پێش‌کەش ئەکەن بە بوکێ ٠ هەروەها کوڕەکەش پارچەیەك ئالتون بەدیاری پێش‌کەش ئەکات بە دەسگیرانەکەی لەجیاتی نیشانە کردن [دیاری‌کردن] ، ئاسایشە ئەم دیاریە بری‌تیە لە مستیلەیەك [ئەلقە] ٠

دوای ئەمە هەردوکیان ئەبن بە دەسگیرانی یەکتری ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ڕازین زاوا سەر لەمالی دەسگیرانەکەی بدات‌و کاتێك کە مارەی‌یەکەی درا ئیتر ئەبنە [دەلەندە] ٠

سەرەڕای مارەیی ئەبێ مەسرەفی ڕازانەوەی بووکەکە بدرێت لەگەل هەندێ دیاری تردا وەکو پارچەیەك زەوی یاخود ئاشێك یان پارچەیەك ئالتونی بەنرخ ٠ کاتێك پارەکە هەمووی درا ، دایکو باوکی زاوا دەست‌ئەکەن بە ئامادەکردنی کەلوپەلی جیازی٠

## ٣ ـ ژن هێنان‌و بوکێنی : ـ

ئێستا هەمو شت ئامادەیە ، بەلام چاوەڕوانی پایز یان بەهار ئەکرێت بۆ ئەوەی ئاهەنگی بوکێنی بگێڕن ٠ ژن‌هێنان دوو ئاهەنگی تیایەو پێویستیش‌ناکات هەردووکیان لەڕۆژێکدا بکرێن٠

یەکەمیان ئاینی‌یەو ناوی (مارە برینە)و بەگوێرەی مەزهەبی شافعی ئەکرێت، ئەمەش بریتیە لەبەستنی پەیمانی ژن‌ومێردایەتی‌و

هەردوولایان ئیمزای ئەکەن ، گرنگیش نیە ئەگەر هەردوولایان ئامادە نەبن ، قازی یاخود مەلا ئەم پەیمانە ئەنوسن ، بەگوێرەی چەند مەرجێكو شایەتی هەردوو لایان ئامادە ئەبێت ، کە کچەکە چوار شایەتی هەیەو یەکێکیان لێ پرسراوەکەیەتیو زۆرجار باوکی ئەبێتو هەر لێرەدا ئەو پارەیەی لەسەری ڕێك کەوتون بۆ مارەیی تەسلیم ئەکرێت ئەمەش بۆ کاتی تەڵاقدانو بێوەژنیە کە لەوانەیە ڕووبدات ، لەسەر چەردەیەك پارە ڕێك ئەکەون کە ئاسایی ئەگاتە نیوە یان سێ یەکی مارەییەکەیە ، هەروەکو لەپێشەوە باسمان کرد ، دوای ئەوە مەلا یاخو قازی داوا لە هەردوکیان ئەکات کە ڕازی بنو بە وەکیلی کچەکە ئەڵێ ئەم قسانەی خوارەوە لە دوایەوە بڵێتەوە «ئەوا کچەکەماندا بەفلان کەس بەمارەیی ئەوەندە پارە» ، لەکاتی ئەم قسانەشدا ئەبێ ئامادەبووانهەموو بێدەنگ دانیشنو هەردوو دەستیان لەسەر ئەژنۆیان دانێن بەجۆرێك کە هیچ کەسیان نەتوانن شریت گرێبدەنو زاوا ببەستن ، هەتا هەموو ئیشوکارەکە تەواو ئەبێت ، بەم شێوەیە ڕێکەوتنەکەیان ئەچەسپێننو هەندێجار بەخوێندنی سورەتی فاتحا کۆتایی پێ دێنن . لەم کاتەوە ئیتر بوکو زاوا بەژنو مێرد دائەنرێن ، هەر چەندە کە ژنهێنانەکە تەواو نەبووە . مێردەکە ناتوانێ پەیمانەکە بەتاڵ بکاتەوە لەڕێگای تەڵاقو بەگوێرەی ڕەسمیاتو دادگاو مارەییدانەوە نەبێت .

ئیتر ئاهەنگی دووهەم ئەمێنێت ئەویش شایی بوکێنییەو هەر لەکۆنەوە هەیەو لەبەرچاوی زۆریانا ئەمە گرنگترەو جەماوەریەتی زیاترە . چونکە لەم ئاهەنگەدا بوك ئەهێنرێت بۆ ماڵی زاوا لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا . هاوڕێیانی هەردوولا دەستئەکەن بە ڕازاندنەوەی بوکێ ، ئەیبەنە حەمامو خەنە ئەگرنە بەری هەردوو

دەستو قاچی • هـەروەها کـوڕەکەش هەر بۆ جوانی مـوەکانی لاشەی ئەتاشێو کچەکەش هەروەها لاشەی خۆی موڕن ئەکات بـە هۆی ماجومێکەوە کە لەزەنكو زەرنیخ[*]، پێك‌هاتوەو موو لائەبات، هەردو چاوی بەکل ئەڕێژێ بۆ ئەوەی چاوی ڕەشتر بکاتو لەشەوی بوکێنیدا دەموچاوی خۆی بەتارایەك دائەپۆشێت کە دەستەسڕێکی زەردەو زۆرجاریش دانشتوانی شارەکان لەجیاتی ئەمە تـارای سپی ئەورووپیانە بەکارئەهێنن •

زێڕو زیو هەمە چەشنەیەو لەهەموو لایەکی کوردەواریا باوەو بەناوبانگەکانیان ئەمانەن زنجیرێکی ئاڵتون لەکڵاوەوە هەتا ژێر ملی یەت ، ملوانکەیەك بەدرێژایی یەخەی سەڵتەکەی ، هەندێ لەم ملوانکانە لەپارچە بەرد یاخود شتی بریقەدار دروست ئەکرێن کە پێویستە شێوەو جۆرەکەی ڕێ‌بکەوێت لەگەڵ دورخستنەوەی چاوی پیسدا[*] • بازنو پشتوێنی گەورەی گۆپکەدار کە لەزیو کراون ، لوتەوانەی ئاڵتـونیان هەیەو وا لەکـونەلوتی لای چەپیـاندا کە هەندێجار پیرۆزەی شینەو گوێکی بچووکەو لەپێشەکەیدا پلپلەی پێوەیەز وەکو مانگێو دڵ وان •

کاتێ بوك ئەڕازێتەوە ، ڕێڕەوی بوکێنی بەسـواری وڵاخ ئامادە ئەکرێت، بەڵام ئێستا لەشارەکاندا بە ئوتومبێلە ـ لەپێشەوە کەلوپەلو شتومەکی ناومـاڵی بوك ئەبەن[*] ، مەبەسـتیش لەمە دەرخستنی دەوڵەمەندیو ڕێزگرتنی زاوایە •

لەهەندێ ناوچەدا وەکو (گردداغ) خەڵکی شتومەك ئەخوازن

* لە کوردەواریدا بەم ماجومە ئەڵێن [داوڕ] •

* لە کوردەواریدا زۆرجار بۆ ئەم مەبەستە کەلانە یاخود مورووی شین بەکـار ئەهێنن •

* بەم کەلوپەلو شتومەکانە ئەوترێت جیازی، ئێستا ئەم جیازیە لەگەڵ بوکدا ئەبرێت •



منالانی کورد لە ئاهەنگێکی
ژنهێنانی ئەم سەردەمەدا

بۆ ئەوەی دەوڵەمەندی خۆیـان دەربخەنو دوای تەواوبـونی ئیشەکەیان شتەکان ئەبەنەوە بۆ خاوەنەکانی •

عادەت وایە کە بووك لە ماڵی باوکی چووە دەرەوە ئەگریو چەند فرمێسکێك ئەڕێژێت ، ئەگەر دروستکراویش بێت ، هەر لەبەر ئەم ناخۆشییەی بووك ئەو هاوڕێیانەی لەگەڵیا ئەچن گۆرانیی بـۆ ئەڵێن ، بە هەموویانەوە گۆرانیی (بـووك)ی بۆ ئەڵێن • هەتا ئەگەنە ماڵی زاوا ئەوە ئیتر هەر گۆرانیو سەرو شمشاڵو هەڵپەڕکێیە • لە خۆدەرخستندا زاوا هیچ پەلە ناکاتو خۆی قورس ئەگرێتو لێی ئەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی بووکێ لەسەر ماینەکە دابگـرێت ، هەرچەندە ئـەویش مەکر ئـەکاتو وا خۆی دەرئەخات کە نایەوێ دابەزێت ، بەڵام لەکۆتاییدا هەموو شت بە ئاسایی ڕێك ئـەکەوێت • کاتێك بووك ئەچێتە مـاڵی داهاتووی چەند ڕەوشتێکی فۆلکلۆری بەگوێـرەی ناوچەکان ڕووئەدەن بۆ نموونە ، پێش ئەوەی بووك پێبخاتە ئەودیو دەرگای ماڵی زاواوە گۆزەیەکی پڕ لە پارەو شیرینی لەژێر پێیدا ئەشکێننو ئەبێ بەسـەر ئەوەدا بچێتە ژوورەوە • لە ئازربایجان یەکێ لە خزمەکانی زاوا هەندێ پارچە نان فڕێئەداتە بـەر پێی بووکێ کاتێك کە ئەگاتە ناو دەرگاکـە ، ئیتر بووکێ پارچە نانەکان کۆئەکاتـەوەو ، ناو دەرگاکە ماچ ئەکات •

لەناو حەقەکانی ئێرانیشدا ، کاتێ بووك بەناو دەرگاکەدا تێئەپەڕێت چەند مۆمێکی بەدەستەوەیە بەرزیان ئەکاتەوە • لەم کاتەدا زاوا لەسەر گوێسەبانەکەیان ئەوەستێو بووکێ ئەداتە بەر پارەو گەنمو برنجی ڕەنگاوڕەنگ •

لەناو یەزیدییەکانیشدا ، هەر کە بووکێ گەیشتە پێشەوە ، خەسووی لەسەر گوێسەبانەکەیانەوە ئەیداتە بەر شیرینیو گوڵ ، دوایئەوەی لەسەر ماینەکە دائەگیرێت ، هەر خەسووی گۆزەیەکی

پڕ لە شیرینی ئەدات بە بووکەکەی ، کە ئەبێت هەر چووە ژوورەوە لەناو دەرگاکەدا بیشکێنێ • هەموو کەس پەلە ئەکات لە کۆکردنەوەی ئەم شیرینییەدا چونکە کامەرانیی پێوەیە • بووکێ بەناو ماڵە تازەکەیداو بەسەر پارچەی گۆزە شکاوەکەو خوێنی مەڕێکدا کە لەژێر پێیدا سەربڕراوە ئەگەڕێت •

لە [گرداغ] پێش ئەوەی بووکێ بچێتە ماڵی مێردەکەیەوە ، کەوچکێکی دارین لەژێر پێیدا پارچە پارچە ئەکەن ، ئەمەش بەختیاری بۆ ئەو ژنو مێردە ئەهێنێت •

لە (تۆبزاوە)ی عێراقیش ، لەو کاتەدا کە بووکێ ئەچێتە ئەودیو دەرگای ماڵی تازەیەوە بانندەیەك بەرەڵلا ئەکەنو هەر لەو کاتەدا زاوا لەسەر گرێسەبانەکەوە بە دارێکی درێژو باریك کە بە هەردوو دەستی گرتوویەتی ئەدات بەسەری بووکێداو ئەم ڕەوشتەی دوایی لەناو کوردەکانی ئەرمینیای سۆڤیەتیشدا هەر باوە •

هەر لەگەڵ بووکێ چووە ژوورەوە ، ئیتر بە دەنگێکی بەرز ئاهەنگێکی ئاینی ئەگێڕن بەمەرجێ لەوەوپێش ئەم ئاهەنگەیان ئەگێڕابێت • هەر لەو کاتەدا هەموان خەریکی خۆشیو شاین ، بووکێش لە سووچێکی ژوورەکەدا بە بێدەنگی وەکو بت دائەنیشێتو هەموو گیانی خۆی بە تاراکەی دائەپۆشێت • کاتێك هەموان بە چاکی ڕایانبواردوو لە گۆرانیو هەڵپەڕکێو ڕمبازیو یاریەکان هیلاك بوون ، ئیتر ئاهەنگەکە کۆتایی دێتو بووكو زاوا بەتەنها بەجێ ئەهێڵنو ئەخرێنە ژووری بووكو زاواوەو یەکێك لە برا زاواکان لە بەردەم دەرگاکەیاندا ڕائەوەستێت • پێش ئەوەی زاوا بووکێ بکات بە ژن ، دیارییەکی تازەی پێشکەش ئەکات کە نرخی حەیاو شەرمییەتی •

کاتێك هەموو شت لە شوێنی خۆیدا تەواو بوو ، ئیتر زاوا خۆی یان برازاوایەك فیشەکێك ئەتەقێنێتو ئیتر هەموو کەس ئەگەڕێتەوە بۆ مالّی خۆی ٠

لەسەر جێگای بووکێنی پارچە قوماشێکی چوارگۆشە ڕائەخەنو پێی‌ئەڵێن (ڕووسپیەتی)و ئەمەش شەرەفو داوێن پاکی‌ی کچەکە ئەسەلمێنێ ٠ (بەربووری) یاخو (پیرەك) یان (پاخەسوو)* ئەو ژنەیە کە لەگەڵ بووکێدا دێتو شارەزای ئەکات لە ئەرکی تازەی ناومالّداو هەر ئەمە کە ڕۆژی دوایی ، نیشانەی داوێن پاکی ئەباتەوە بۆ دایكو باوكو هاوڕێیانی بووکێ ، ئەم پارچە قوماشە لای خێزانی بووکێ هەڵئەگیرێ هەتا یەکەم منالّی ئەبێت ٠

## ٤ ـ کەیبانوی کوردەواری (ژنی ناومالّ) : ـ

دوای ئەوانەی باسمان کردنو ، ئەم کەیبانوە گەنجە چوە مالّی تایبەتی خۆی ، کە زۆرجار وا ڕێك ئەکەوێت بەجیان وان لە ژوورێکی تایبەتیدا لای باوكو دایکی کوڕەکەو هەرچۆن بێت ژیانیان ئەچێتە سەر لەگەڵ پێشهاتو گیروگرفتی زۆردا ئەگەر پشت ببەستین بەو پەندانەی کە ئەڵێن :

ژن کۆڵەکەی مالّە ٠

ژنی باش دیاریەکی باشەو ژنی خراپیش زیندانە ٠

ژن قەلاّیەو پیاویش بەندەیەتی ٠

پیاو چەمەو ژنیش دەریا ٠

---

★ لە کوردەواریدا ئەو ژنەی لە مالّی بوکەوە دێت پێی ئەوترێت (بەربوك)و ئەو ژنەی لەمالّی زاواوە ئەچێت بەشوێن بوکدا پێی ئەوترێت (پێخەسو) ٠

هەمیشە ژن لەمێردەکەی زیاتر خۆی ئەپارێزێت ، ئیتر لێرە بەدواوە هەتا مردن ئەم دوانە ژیانیان بەستراوە بەیەکەوە وەکو ئەڵێن (ژنو مێرد ، تەقڕو بێر) ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ژنو مێرد وەکو پاچو خاکەنازو وانو هەر ئەمان گۆڕی هەردووکیان هەڵئەکەنن‌و هەر ئەوان ئەتوانن لەیەکیان بکەن‌و بەس ·

بێ‌گومان بەم شێوەیە کاتێکی زۆر کامەران ئەبەنە سەر ·

**« سەیرکردنی چاوی خۆشەویست دڵ ئەکاتەوە »**

پیاویش کە بیەوێ باسی ژنەکەی بکات ئەڵێ :

لەپێناوی کانیەکدا شاخێکم خۆش ئەوێت ·

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لەژێر رکێفی ژنەکەیدا نیە ، چونکە هەر یەکەیان جێگای تایبەتی خۆیان هەیە ، وەکو ئەڵێن (ژنێکی بێ‌فێز شارێك ئەژی ، پیاوێکی بێ‌نیزیش گێسکێك ئەژی !! هیچ کاتێ کە (پیاو لەمالـەوە دانیشێت‌و ژنیش بچیت بەدەم سـەرۆکاری شەڕەوە) یاخو ئەڵێن (کەڵەشێر بۆ ڕۆژێ‌و مریشکیش بۆ ساڵێ)·

پیاوێکیش کە لەژێر ڕکێفی ژنەکەیدا بێت وەکو پارچە تەختەیەکی لاوەکی وایە ، سەرەڕای ئەوەش (ژن بە پاڕانەوە نابرێت بەڕێوە)

ئەگەر وتیشمان سەربەستی ئافرەت لەناو کوردەکاندا زۆر ترە هەتا لەناو هەمـوو گەلە ئیسلامیەکانی تـردا ، ئەوا شتێکی وامان زیادە نەوتـوە ، چونکە ئافـرەتی ئەمان ئەگەر هەمیشـە سەریشی داپۆشێت ، پەچە نادەن بەسەر دەموچاویاندا‌و هەر ئەمە ئیشوکاری ناوماڵ‌و دارایی بەڕێوە ئەبات‌و بەگوێرەی ئارەزوی خۆی مەسرەفی ناوماڵ ڕێك ئەخات ·

لەپەڕاوێکی بە کەلکدا دەربارەی (ژیانی ئافرەتی کورد) خوشکە هانسن کـە ( ئافرەتێـکی دانیمـارکی‌یە )و لـە بـارەی ژیانی ژنو مێردەوە لەخێزانی کوردەواریدا هەندێ نیشـانەی پرشنگ دارمان بۆ باس ئەکات ·



ئافرەتی کورد هەرگیز هیلاک نەبووە
لە ئیش‌کردن

لەڕووی دەسەڵاتەوە پیاو هیچ تایبەتیەکی نیە ، لەناو ماڵدا دەسەڵاتو جێگای کەمترە • وە بە سوعبەتەوە پێان وتین دبزمارێك داکوتراوە بۆ هەڵواسینی جلەکانی ، جێگاکەی لەسەر زەویەو سینیەکی لەنزیکەوەیە بۆ خواردن ، قەرەوێڵەیەکی ئاسنین بۆ نوستنو ئیتر ئەمە هەموو شتێکیەتی» •تەنانەت لەناو ئوروستقراتیەکانیشداو لەهەڵبژاردنی هاوڕێی ژیاندا پیاو سەربەستی لەئافرەت زیاتر نیەو هەمیشە لەگەڵ کەیبانوەکانی ناو ماڵدا ئەبێ خەریکی ئیشکردن بێت ، وەکو دایکیو ژنەکەیو براکانیو کچی گەورەو بچوکی • بەڵام ژنە جوتیارەکان سەربەستیان زیاتر هەیە لەجموجۆڵداو ، یەکسان نین لەگەڵ ئافرەتی ناو شارەکاندا ، چونکە بەشی زۆری ئیشە قورسەکان وان بەسەرشانی ئەمانەوە ، لەناو ئەوانەشدا کە پێش کەوتونو شارستانی نەبوون ئەگەر پیاو ژنی زۆری هەبوو ئەوا لەحاڵی بەندایەتیدا ئەبێت• لەڕاستیشدا، ژیانی هاوبەشی نێوان ئەو ژنو مێردانە بە پیاوو ژنەوە کە لە جیهانێکی جیاوازدا ئەژین کەمەو هەر ئەمەشە کە ئاینی ئیسلامی پێجیانەکرێتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا پیاو ژنەکەی خۆشئەوێتو ئەزانێت چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا ئەکات ، چونکە ئەو ژنە ئیشوکاری ماڵەکەی بەشێوەیەکی چاك بەڕێوە ئەبات• ئەبێ سەرمان سووڕنەمێنێتو ئەگەر بینیمان هەندێکیان دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ناو هۆزو شارەکان وەربگرن• هەروەها ئەوەش ئەزانین کە لەناو کوردەکاندا ئەگەر خۆت خستە ژێر دەسەڵاتو پەنای ژنێکەوە ئەوا خۆت بەپارێزراو بزانەو ئەوە جێگای بڕواو متمانەیە •

## ٥ ـ دەربارەی بێشـکە : ـ

نرخی ئافرەت لەبەرچاوی خەڵکیدا هەرچۆن بێت لەڕاستیدا لەماڵەکەی خۆیدا پاشایە ٠

« خوا ژنی دروست کردوەو ژنیش ماڵ » ، «هەرچی کاتێك دایك منالی ببێت خوا ئەیداتێ» ئەمانە نمونەی کوردەوارین ٠ خۆشی پیاویش لەوەدایە کە ئەڵێن «هەتا گەنجی ژن بهێنە ، بۆ ئەوەی لە کاتێکی باشدا ڕابوێریتو منالەکانت لەگەڵدا بێت » ٠

هەروەها بەگوێرەی نەریتی کۆمەڵایەتی «ئەگەر خوا بیەوێت ئەوا دوای نۆ مانگو نۆ ڕۆژو نۆ سەعاتو نۆ دەقیقە ، خێرەتی وشکمان سەوز ئەکات» هەروەها «خوا ژن والێ ئەکات کە منالی ببێتو ٣ دڵۆپ نور ئەڕژێنێت بەسەر دەمو چاویا» ٠

چونکە لەڕاستیدا منال (میوەی ماڵە) ٠ (ماڵی دەوڵەمەند لە پارەو ساماندا ئەتوانرێ بڕوخێنرێت بەڵام ماڵی دەوڵەمەند لـە منالـدا ناتوانـرێت بڕوخێنرێت) ئەم سـەلماندنە پاکەش هەموو خۆپەرستەکان ئەشارێتەوە (ئەو ماڵەی منالی تیابێت شـەیتانی تێ ناچێت) ئای لەخۆشی دایكو باوك لەکاتێکدا کە خۆیان ئەدەن بەسەر بێشکەی منالەکەیاندا، بۆ ئەوەی یەکەم زەردەخەنەو یەکەم وشەی منالەکەیان ببینن ٠ هەندێ جار باوکی بێ بەزەیی و دڵڕەق دڵی نـەرم ئەبێت ، کاتێك بەهێواشـی گـوێ لەلای لایەی ژنـە گەنجەکەی ئەگرێت کە بۆ نووستنی منالەکەی ئەیڵێت ٠

« لای لایەی کـورد هەروەکو خۆشـە جۆراو جۆریشـەو باو باپیران دای ئەنێن و ڕێکی ئەخەن ،لای لایەش نیشانەی خۆشەویستی ڕاستەقینەی دایكو باوکە ٠

ئەمەش لای‌لایەیەکە کە ژنە کوردێکی سۆڤیەتی ڕێکی‌خستووە بە جوانترین شێوە هەستی تێکەڵاو ئەکات لەگەڵ سەرگورشتەی خوا پەرستیدا ٠

لای‌لایە ئەی منالّی چاك
ئەی چاوڕەشی ئەبرۆ کەوان
کاتێ بیرت لێ ئەکەمەوە دڵم پڕ ئەبێت لە خۆشەویستی
بنوو بە هێواشی بنوو بە بێدەنگی
لای‌لایە ئەی منالّی چاك
منالّە ئاسکۆڵەکەم زوو گەورە ببە
ببە بەپاڵپشتی باوکت
گەورە ببەو ببە بەپیاوێکی ئازا
دنیای تازەمان بپارێزە
بنو بە هێواشی بنو بەبێدەنگی
لای‌لایە ئەی منالّی چاك
شەو داهاتو دایکو باوکت ڕاکشاون
ئاسکەکەش لەگەڵ بەچکەکانیدا نوستون
ئەستێرەکان دەرکەوتزو مانگ بەرزبووەوە
ئەی چیاکان ئەی چەمەکان بەبێدەنگی بنون
بنو بەهێواشی بنو بەبێدەنگی
لای‌لایە ئەی منالّی چاك

چونکە لەسلێمانی هەندێ ڕوداوی خراپ چاوەڕوان ئەکرێت، ئەبێ ئافرەتی سك پڕ جۆرێك دوعا هەلگرێت کە هەندێ ئایەتی قورئانی لەسەر نوسراوە ٠ وا بلاوبۆتەوە کە هەر ژنێك ئەم دوعایە بسڕێتەوە ئیتر منالّی نابێت ٠

دکتۆر برینێـل Dr. Brunel که پزیشـکێکی سەربازیی فەرەنسییە ، توانی باسێکی کاریگەر بۆ ڕووداوێکی منداڵ بوون تۆمار بـکات سـەرەڕای ئـەوە ناوی نـا نەفرین (لعنـة) چونکە ڕووداوەکە هیچ سەرگورشتەو ئەندیشـەی تیا نیەو لە (دیرك) لە جەزیرەی سوریا ڕوویداوە* ، بـەڵام ئەمە لە هەزارەها جۆرو لە هەموو سەرانسەری کوردستاندا دووبارە ئەبێتەوە .

لەسـەرەتادا لەماڵەوە منداڵیان ئەبوو بە یارمەتیی ئافرەتێکی خزمیان یاخـود پیرەژنێکی شـارەزا ، چونکە بە دەگمـەن مامانی شارەزاو ڕەسـمییان هەیەو ئەگـەر ئافرەتیش بەمنداڵەوە بگیرێت یاخود بەنارەحـەتی منداڵەکەی ببێت ئەوا پەنا ئەبەنـە بەر فێڵو شتی بەتاڵو خۆخەتاندن وەکو لە سایمانی ئەچوون بۆ مزگەوتو بەشوێن ئەو دوعایەدا ئەگەڕان کە بریتیبوو لە بەردێكو هەندێ ئایەتی لەسـەر نووسراوەو ئەیانهێنـاو ئەیانخستە سـەر پشتی ژنەکەو ئیتر هەموو شت بە سەلامەتی تێئەپەڕی .

لەنـاو هـۆزی (شمس الدین)دا لـەو کاتـەدا شـیری خانی لەپزێڕین) ئەهێنن کـە بەمانای (خاوەن دەسـتی ئاڵتوونی)یەو پانەزانی سەرگورشتەی دەدمی بەناوبانگەو ئەیخەنە سەر جێگای ئافرەتەکە .

لەناو مەسیحییەکانی ناوچەی دهۆکدا ، دوای بەرزکردنەوەی پلوسکی سەر پاساری کەنیسە ناوکی منداڵەکە بە مقەست ئەبڕنو لە هەندێ شوێنا بە بەردی تیژ ئەیبڕن .

ئەبێ ئاگاداری ئەو شوێنەبن کە منداڵەکەی ئەکەوێتە سەر لە

---

* بە داخەوە لەچاپە عەرەبییەکەدا باسی ڕووداوەکە نەکراوە .



دوو منالی کورد لە سەرەدەمی ئێستادا

کاتی لەدایکبوونیدا ، ئەگــەر کەوتە سەر چەك ئەوا ئــەو منالە شەڕکەرێکی ئــازا ئەبێت ، ئەگەر کەوتە ســەر دەورییش ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە زۆرخۆر ئەبێت • لە هەموو کاتێکدا ئەبێ لە گیانە پیسەکان (الارواح الشریرە) بیپارێزن •

لە وڵاتی ئەرمینیای سۆڤیەتیو وڵاتی فارسدا (ئاڵ)* ئەوەیە کە ئەیەوێت دڵ یاخود جگەر یاخود سیی ئافرەتی زەیستان ببات •

لەناو یەزیدیەکانیشدا (رەشە شەڤ) یاخود ڕەشی شەو بەوە دائەنێن کە ئەیەوێ منالەکە بخنکێنێ یــان شەڕو ناپەسەندی بۆ خۆیو دایــکی بهێنێت • هەروەها لەناو موکریانیــەکاندا هێزی (شەشە)و لــە سلێمانیش (شــەوە) باون کە ئەیانــەوێت منالەکە بخنکێنن ، لەبەرئەوە هەر لەدایك بوو خێرا قورئانێكو شیرێكو پارچە ئاسنێك ئەخەنە سەر جێگاکەی ، لەگەڵ چەند نوشتەیەکی تردا بۆئەوەی لە ڕووداوی خــراپ دوور بکەوێتەوە • خۆ ئەگەر منالەکە کوڕ بوو ئەوا پیاوانی خێزانەکە بۆ ماوەی هەفتەیەك بە شەوو ڕۆژ ئێشــکی ئەگرنو لەم ماوەیەدا نایەڵن دایــکەکەو ئەو ژنانەش کاتی منال بوون لەوێبوون بچنــە دەرەوەی ژوورەکەو هیچ شــتێك بهێنرێت بۆ ئەو ژوورە ، هەروەها نایــەڵن ئافرەتی پیس ، ئافرەتێك کە لەبێنوێژیــدابێت بچێتە ژوورەوە ، چونکە بڕوایان وایە ئەمانە ناخۆشی ئەهێنن لەگەڵ خۆیان •

ئەم منالە تازەبووە ئەخرێتە ســەر بێشکێکو بە قوماشێکی تەنکی ناســك دایئەپۆشن ، ئەمە جێــگای نووستنی ئــەبێت هەتا شەش حەوت ڕۆژی یەکەم لە ژیانی ، دوای ئەوە زۆر بە هێواشی

* (ئاڵ) لەناو کوردەوارای عێراقدا زۆر باوەو لەکاتی منالبووندا ئەگەر ژن بورێتەوە ئەوا ئەڵێن ئاڵ بردویەتی ، بۆ ڕزگار بونیشی قژی ڕائەکێشن وا ئەزانن بە ئازاردان ڕزگاری ئەبێت •
یاخود دەرزی پیا ئەکەن یاخود تفەنگ ئەتەقێنن بە سەریاو هەرچۆن بێت

هەڵئەگیرێو ئەخرێتە ناو بێشکەیەکەوە کە لە کوردەواریدا سێ جۆری هەیە ، جۆرێکیان جۆلانەیە کە کەڵكو بەکارهێنا زۆرترەو گوێزانەوەشی ئاسانە • جۆری دووەمیان جێگایەکی هەڵواسراوە لە بەینی دوو کۆڵـەکەدا (کارۆك)* • جـۆری سـێیەمیش بێشکەی گەورەیـە ، کە کوتێکی خـڕ وا لە ناوەڕاسـتەکەیداو (بلوێر)ی تێ ئەخەن ، کە ئەمیش بۆریەکی دارینەو میزی لێوە ئەکرێت •

(هنری فیلد)ی زانا کە لە زانسـتی ڕەگەزدا شارەزایە هۆی تێکچوونی کاسەی سەری بۆ دەرکەوتووە ، کە هەندێ جار پشتی سەر بەهـۆی بەکارهێنانی بێشـکەی خراپـەوە ئەقـوپێتو پان ئەبێتەوە ، بەتایبـەتی لەنـاو ئـەو کوردانـەدا کـە دراوسێی ئەرمەنین •

بەبۆنەی منداڵبوونـەوە گەلێـك دیـاری پێشـکەش ئەکرێن بەتایبەتی ئەگەر هاتو منداڵەکە کوڕ بوو ، چونکە کوڕ بە باشتر ئەزانن لـە کچ ، ئەم دیاری‌یانـەش هەمە چەشنەنو بـە گوێرەی ڕەوشـتی هـۆزەکانو ڕێو شـوێنی کۆمەڵایـەتی‌ی خێـزانەکە ئەگۆڕرێت ، لەوانەیە ئاڵتوونی پێشکەش بکرێت ، یاخو بەراتێکی بۆ سەربېـڕن ، دەمانچە یان خەنجـەریش ئەبەن بۆ منداڵـەکە ، لە هەموو کاتێکدا منداڵ بوون ڕێکەوتێکی باشە بۆ ئاهەنگ‌گێڕان •

عادەت وایــە کە دایك ناوی منداڵـەکەی ئەنێتو هەنـدێ جاریش مەلای دێیەکە خۆی تێ‌هەڵئەقورتێنێو قسەی خۆی ئەکات ، بەشی زۆری منداڵەکانیان ناوی ئیسلامی‌یان ئەنێن وەکو : محمد ، احمد، محمود •••• هتد • ئیتـر هەمەجۆریشن وەکو : عـەلیو حسنو حسین ، سەرەڕای ئەمانەش تا ڕادەیەك ناوی کوردیشیان هەیە ، وەکو : چۆلـۆ ، جندی ، مەند ، خودیـدا ، یاخود ئەگـەر ناوە

---

★ ئەمە نە کوردەواری عێراقدا پێی ئەوترێت (مێلۆ) •

ئیسلامیەکانیان هەڵگێڕاپەوە وەکو : رەشۆ ، مانای رەشید ، مەحۆ* مانای محمد ، حەمۆ مانای حامد ، وە ناونان بە ناوی پاڵەوانەکانی مێژووەوە یاخود پاڵەوانەکانی سەرگورشتەکانمان لەبیر نەچێت وەکو : جمشید ، قباد ، خەسرەو ، فەرەیدون ، بارام ، گودەرز • گەلێ‌جاریش بەناوی هەندێ شتی باشەوە ناوی منداڵەکانیان ئەنێن ، وەکو ناوی گوڵەکانو میوەهاتو ئەو گیان دارانەی کە لای هەموو کەس خووڕەوشتی پەسەندکراویان هەیەو ناوی کچیشیان زۆرە وەکو : گوڵێ ، قومری ، خەزاڵ ، ڕێحان ، بەنەوشە ، نێرگس ، یاسەمین ، سەوسەن •

هەروەها ناوی کوڕانیشیان هەر زۆرە وەکو : شێر ، پڵنگ، شاهێن •

خەتەنە کردن شتێکە هەر ئەبێ بکرێت ، لەڕۆژی پێنجەم یاخود حەوتەمدا ئەکرێت* و ئەم کارەش ئەبێ مەلا دەستی پێ‌بکات • لە پێش ۲٥ ساڵ لەمەوبەر لەسلیمانی‌و لەتەمەنی حەوت تا ■ ساڵیدا کوڕانیان پاك ئەکردەوە ، هەروەکو ئەمڕۆ لەئەستەموڵ پەیڕەوی ئەکرێت • ئەمەش ڕێکەوتێکی باشە بۆ جەژنێکی بچکۆلە کە منداڵ شەرواڵی کورتو کراسی سپی لەبەر ئەکەن لەگەڵ حەمەیالێکی قوماشی گوڵ‌گوڵینداو کڵاوێکی بریقەداریشی ئەکرێتە سەر ، مەرجیش نیە کە وەستاکە لەخێزانەکە بێت • بەلام ئەبێ پیاوێکی خوڕەوشت باش بێت‌و ناوبانگی هەبێت ، خۆ ئەگەر لەناوی حەوت

---

★ لە کوردەواری عێراقدا ناوە ئیسلامیەکان زۆر ئەگۆڕن وەکو محمد بۆ حەمەو احمد بۆ ئەحار محمود بۆ حولەو •••• هتد •

★ لە زۆر شوێنی کوردەواریدا ئەم کاتە بەم جۆرە دیاری نەکراوە ، بە تایبەتی لە زۆروی ڕۆژهەلاتی عێراقدا لە تەمەنی سێ‌و چوار ساڵ بەرەو ژووردا ئەکرێت‌و زۆر جاریش مەلا حەقی نیە بەسەرەوە ، بەلکو وەستای تایبەتی خۆی هەیەو ئەیکات‌و هەموو ساڵێ لەوەرزی بەهاردا بۆ ئەم مەبەستە بە هەموو ناوچەکاندا ئەگەڕێن •

کانی خواردبێتەوە ، ئـەوە ئیتر پەسەندە چونکە ئەمە نیشـانەی زانین‌و ژیری‌یەتی •

یەزیدیەکان بە هەموو ئیسلامێك ڕازین کە وەستای خەتەنە بێت ، بەلاّم گاورو جولەکە بەهیچ جۆرێك نایانەوون‌و کوردەکانی تریش ئەم گومانەیان نیەو هەرکاتێك ئەم خزمەتەیان ویست ئیتر تیا ناوەسـتن یاخود بەشێوەیـەکی‌تر بەهۆی تێـکەلاّوی خوێن‌و خزمایەتیەوە متمانەی بڕوایان ناوێت •

خەتەنە کردنی کچان خویەکی دواکەوتوە، ئافرەتی موسولّمان دەستیان کـرد بەیـاخی بوون لـەدژی ئەم مەبەسـتە بەتایبەتی میسری‌یەکان‌و هەروەهـا ئەم خوە هەر لەسـلیمانیش پەیڕەوی ئەکرێت ، بەلاّم پێش ئەوەی تەمەنی کچەکە بگاتە هەشت تا دە سالّ ئەم خوەش گشتی نیە ، بەلاّم ئەوەی ئەم ڕووەرە تێ‌بینیم کردوە ، ئەوەیە ئەو مامانەی دەست ئەکات بەم‌کارە ئەبێ زۆر شارەزابێت•
دەرەنگیشـ منالّ لەشـیر ئەبڕنەوە ، هەتا تەمـەنی دووسـالاّن‌و زیاتریش شیری ئەدرێتێ‌و ژنـان وا ئەزانن هەتا شـیر بدەن بە منالّەاکنیان ، منالّیـان نابێت لەبەر ئەمە زۆرجار منـالّ بوونیان نزیکن لەیەکەوە، بەتایبەتی بەکارهێنانی منالّ‌نەبوون(منع الحمل) نازانن‌و بەشـێوەیەکی تریش ئەمە لەسەرانسـەری کوردەواریدا شتێکی ناپەسەندە• منالّە شیرە خۆرەکان کە شیری یەکتری ئەخۆن ئەبنە خوشك‌و برای شیری ، ئەم خزمایەتیە ڕاستەش لە دواڕۆژدا لەڕێگای ژن‌و ژنخوازیدا ئەبێتە کۆسپ •

٦ ــ ڕۆشنبیری منالاّن : ــ

کورد منالّی زۆر خۆش‌ئەوێت ، هەروەها دایکیش حەز ئەکات کۆرپەکەی لە کرداری ناهەمواری گیانـە دڕندەکان بپارێزێت ، هەر لەتەمەنی منالّیدا بەهۆی دۆعاو نوشتەوە منالّەکانیان لەچاوی



منالانی کوردی ئەم سەردەمە
لەسەر شانۆ

پیس ئەپارێزن ، ئەم نوشتەو دۆعایانە وان بەسەرشانو کڵاوەکانیانەوە • کڵاوە سورەکانیان هەندێ شتی بەسەرەوەیە کە کامەرانیان بۆ ئەهێنێت وەکو ، دانی گورگ ، مێخەك ، یاقوتی یەمانی ، بەردی بەنرخ ، هێلکە شەیتانۆکەو چەند پارچەیەکی تری هەمە چەشنەی دارو بەردو هەندێ حەمەیالیش ئەکەنە باڵیان کە ئایەتی قورئانی هەمەچەشنەیان لەسەر نوسراوەتەوە ، مقاشو قاچی قرژاڵیان خستۆتە پەڕۆیەکەوەو دوراوە بە کراسەکەیدا ، هەتا ئەمڕۆش ئەمە هەر باوێەتیو لەترسی چاوی پیس بەکاری ئەهێنن • بەدەگمەن توندو تیژی لەگەڵ منالدا بەکار ئەهێنرێت ئەگەر ڕویەکی زۆریشی نەدرێتێ •

یاری منالان بەشێوەیەکی ڕاست نەزانراون ، بەڵام کوڕان خۆیان لە پارچە تەختەو تەلی ئاسن عارەبانە دروست ئەکەنو کچانیش لە پارچە قوماشی کۆن بوکلە دروست ئەکەن • کوڕ بەشی زۆری تەمەنی منالی لەگەڵ ئافرەتا ئەباتە سەر ، بەڵام هەر لەگەڵ پێ گرت ئیتر لەکۆڵانو لەگەڵ هاوڕێکانیدا کاتی خۆی ئەباتە سەر ، هەروەها خوشکە بچکۆلەکەی بەرەبەرە زۆرچاك فێری ئیشو کار ئەبێت هەتا ئەبێتە کەیبانویەکی باش •

بەشی زۆری دێ بچوکەکان قوتابخانەیان تیانیە • زۆرجاریش مەلای دێکە یان شێخێکی دڵگەرم بە تەنها خۆی قورئان ئەڵێ بەو کوڕانەی کە حەزی لێ ئەکەنو چاویان کراوەتەوە •

لەو جێگایانەشدا کە قوتابخانەیان تیایە ، هەر باری ژیانی خێزان لەگەڵ ژیانی قوتابخانەدا بەهیچ جۆرێ یەك ناکەون ، بە جۆرێك کە لەناو ماڵەکەدا شوێنێك نیە پەڕاوەکانی قوتابخانەی لێ دابنرێت ، یاخود کۆششی تیا بکات • زۆرجار منال والەدەرەوەی ماڵاو وا بەلای ڕانە مەڕو گاگەلەوە ، کاتەکانی تریش گوێ لە قسەی گەورە پیاوان ئەگرێو ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا

نەگەیشتۆتە ئەو تەمەنەو منالە ٠

هەروەها منالی کورد ئەو شاراوەو گیروگرفتانەی کە دێنە ڕێگای ژیانی هەموویان ئەزانێو هەرکاتێ بەرەنگاریان بووەوە ئیتر یەکسەر ئامادەیەو بەتوانایە لەبەرەنگاری کردنی جەنگەکانی ژیاندا ٠



منالانی کورد لەم سەردەمەدا
هاوبەشی سەیرانو خۆشییەکانیش ئەکەن



# بەشی شەشەم

# کاتی نێ ئێشی

# کاتی بێ ئیشی

ئاوو هەوای کوردستان وای لەدانیشتوانی کردوە کە ببنە پیاوانی بە تەندروستو بەهێزو زۆرجار ڕوالـەتی بەتوانایان هەبێت • کورد لەڕەوشـتیدا ڕەش‌بین نیەو هەمیشە دڵخۆشـەو ئامادەیە بۆ وەلام دانەوە بەشێوەیەکی جوان ، زۆریش بە بەزەیو خاوەن خۆشەویستی‌یە • ئەم ڕواڵەتە جۆراو جۆرانە بە ئاشـکرا لەهەموو خۆشیەکانیدا بەدی‌ئەکرێن • قسە کەم ئەکەن • سەرەڕای ئەو کارە گرنگانەی کە لەژیانی ڕۆژانەیدا بەجێیـان ئەهێنێتو سەرەڕای هەموو شتێك لەکوردستاندا ماوەیەکی فراوان هەیە بۆ کاتی بێ‌ئیشی‌و حەوانەوەو وەرزش •

ا ـ ئاوازو گـۆرانی : ـ

هەموو خۆشیەکانی خێزان : منالبوون ، خەتەنەسـوران بە تایبەتیش ژن‌هێنان گۆرانی‌و هەڵپەڕکێ‌یان لەگەڵدایە ، لەڕاستیشدا لەکوردەواریدا هیچ شایەك نیە بەبێ‌هەڵپەڕکێ ، هەڵپەڕکێ بەلای ئەوانەوە ڕابواردنە ئەو هەڵپەڕکێیەی کە لـە منالیەوە فێری ئەبن هیچ جولانێکی ڕۆژئاوایی تازە بابەتو باوی ئەم سەردەمەی تیانیەو ناوی بە(سەما)ناسراوە کە ئەمەعەرەبی‌یەو (دیلان*) ناوە کوردیە تەواوەکەیـەتی • جۆرەکانی هەڵپەڕکێ

---

★ لە سـەرانـسەری کوردەواریدا هەر هەڵپەڕکێ باوەو نیتر وا بزانـم (رقص) (سەما) نەگرتەوەو زۆر باو نیە لەناو کوردا •

دیاری نەکــراونو گەلێجــاریش بەگوێرەی ناوی ناوچەکــانیو بنەڕەتەکەی ناو ئەبرێن وەکو* : ـ

| | | |
|---|---|---|
| ئامیــــدی | ، | بۆتانی |
| سەرهەردی | ، | روهایی |
| دیــــرنکی | ، | سێومرکی |

جۆری دوایان لەهەڵپەڕکێی لوبنانی ئەچێت ٠

هەروەها هەڵپەڕکێکان بەگوێرەی شێوەی جوڵانی هەڵپەڕکێ کەرەکانیش ناو ئەنرێن ، هەروەکو : ـ

(کۆفەند) کە کوڕو کچ لەدەورەیەکدا دەست ئەگرنو هەنگاو هەڵ ئەهێننەوەو خۆیان ئەخەن بــەملاولاداو زوڕناو دەهۆڵیشــیان بە دەنگی بەرز بۆ لێئەدەن ٠

لەهەڵپەڕکێکانی تریش : ـ

(سێ‌پێیی) یاخود سێ‌هەنگاوە یان چوارهەنگاوە (چوارپێیی) یاخود هێواشی (گرانی)* بە هێواشی یاخود بەشلی (خەرمانێ) ٠

لە (ملانێ) بەشدارانی هەڵپەڕکێ شان بە شانی یەکەوە هەڵ ئەپەڕن ٠ بەڵام (عایشۆك) یاخود ئایشێ بچۆلە لەکاتێکدایە کە بەشداران بازنەیەکی تەواو دروست بکەن ٠

قوتابیانیش هەڵپەڕکێیەکی تایبەتی خۆیان هەیە کە جۆرێکە لە (کاردیل)و پێی ئەڵێن (بێلون) یان (بیلیتە) و لەکۆنا لەئیلهامی ئاینیەوە وەرگیراوەو ئەمڕۆش لەجاران زیاتر باویەتی ٠

هەڵپەڕکێی(چۆپی)زۆر باوەو بازدانێکی خۆشی لەگەڵدایەو

---

★ جۆرەکانی هەڵپەڕکێی کوردی زۆرنو بگرە لە هەر ناوچەیەکدا چەندەها جۆری هەیە ، بەڵام ڕەنگە نوسەر هەر ئەمەندەی زانیبێت ٠

★ لە کوردەواری عێراقدا بەم شێوە هەڵپەڕکێ ئەوترێت (چەپی) چونکە زۆر قاچی چەپی تیا بەکار ئەهێنرێو هێواشیشە ٠



کاتی بڕنیشیو تێڕوانینی هیوای
دووا ڕۆژ

یەکێك سەرۆکایەتی ئەکات کـە پێی ئەڵێن [ســەرچۆپی‌کێش*] دەستەسڕێك ئەگرێت بەدەستێکیەوەو بەدەستەکەی تری خەڵـکی ڕائەکێشێت بۆ ناو هەڵپەڕکێ‌کە خۆی ئەلەنگێنێ‌و خۆی بائەداو هەنگاو ئەنێت بۆ پێشەوەو دواوە کە ئەمانەش جوڵانو لەنگەیەکی جوانن لەو کاتەدا کە هەموو هەڵپەڕکێ‌کەران لەبازنەیەکی ڕێك‌و پێك‌دان‌و مۆسیقایان لەگەڵدایە ، ئەم لەنگاندنە لەشەپۆلی گوڵە گەنم ئەچێت لەکاتێکدا کە شەماڵێکی فێنك بەسەریا هەڵ‌ئەکات ٠

لە میلینجنـــەوە : Millingen

ئەو هەڵپەڕکێ‌یەی ئافرەت بەشداری تیا بکات پێی‌ئەوترێت (ڕەش‌بەڵەك) واتا چەند شـێوەیەك کە لەیەك ناچــن ، ئەمەش لە دێهاتەکان‌دا باوە ٠

هەڵپەڕکێی (بێریو) ، ماست‌فرۆش‌و (تەمزارە) هەمووی وەکــو شێخانی وایەو لەئاشــوریەکانەوە فێــری بوون ، هەڵپەڕکــێی شیریش هێواش‌و زانینێکی باشی ئەوێت‌و ئەمەش بۆ تەماشاکەر زۆر خــۆش‌و ڕابــواردنە ٠ هەروەها گـۆرانیـەکانیشی وەکــو جۆرەکانی هەڵپەڕکێ هــەر زۆرن ٠ کە گۆرانیــەك وترا ، ئیتر مانای ئەوە نیە هەر ئەوەیە بەشەو ڕۆژ بوترێت ٠ ئەگەر منالێك وتی ئەوە شتێکە ، ئەگەر ئافــرەتێکیش وتی مانای شــتێکی ترە ئەمەش بەگوێرەی ئەو کەسەی ئەیلێت ئەگۆڕێت ئەگەر هاتو گەنج بوو یان پیر ٠ هەروەها ئەو گۆرانی‌یەی لەشاخ ئەوترێ جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەوەی لە دەشت‌و ناو دارستان‌و سەر دەریادا ئەوترێ، ئیتر هەمــوو جارێ بەگوێرەی کات ئەگۆڕرێت ، وەکــو بەیانی‌و نیوەڕۆ ، یاخــود دوای نیــوەڕۆو ئێــوارە ٠ تەنها یــەك کــورد توانیویەتی هەست بـکات بە حەزلێ‌کردنی گــۆرانی‌ی کوردی‌ی

★ وا بزانم هەموو جۆرەکانی هەڵپەڕکێی کوردی سەرچۆپی کێشی هەیە ٠

جۆراوجۆر کەهەرگیز دوایی نایەتو ئەویش [یەشار کەمال]ە(١٠) ٠

سەرگورشتە هۆنراوەییەکان یاخود هۆنراوەکانی سواری لە شەڕی دەشتەکاندا پێیان ئەوترێت (دەلال)و لە ناو چیا نشینەکانیشدا کە زۆر جار درێژخایانە پێی ئەوترێت (لاوکی سواران)و مەسەلەکەش زانراوە کە :

دەسگیران یاخود خۆشەویست لە کاتی شەڕدا لە ماڵەوە ئەیێنێتەوەو گۆرانی ئەڵێتو بە پێی باری تایبەتی ئەیگۆڕێتو قارەمانی گۆرانی‌یەکەش خۆشەویستەکەیەتی کە چووە بۆ شەڕ ، بەلام بە شێوەیەکی نا ئاشکرایی دەری‌ئەبڕێت ٠ ئەتوانین بلێین کە هەموو هۆزێك (دەلال)ی تایبەتی خۆی هەیە ٠ (لاوژ) ئەو گۆرانییە درێژانەیە کەتەنها خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان‌نیەو بەس ، بەڵکو ئەوانەیە کە لەگەڵ مۆسیقادا پێکەوە ئەیانڵێن ، دوای ئەمانە مەقامی جۆراوجۆریش هەیە کە هەموو ئیشەکانی ژیانی ڕۆژانە ئەگێڕێتەوە ٠ (بەردۆلانێ) ئەو گۆرانیانەیە کە کچان وردە وردەو لەبەرخۆیانەوە لە بەردەم تەونی کەتان‌چنیندا ئەیانڵێن٠ گۆرانی‌ی (پێ‌هیزۆك) لەکاتی دروێنەداو گۆرانیەکانی (پایز . زۆزان) ئەو گۆرانیانەن کە کوڕو کچ لە کاتی گەڕانەوەیاندا لە هاوینە هەوارەکان بە نۆبە ئەیانڵێن ، دوای ئەمانە گۆرانیەکانی بەهار ، ئەمانەو بێجگە لەو گۆرانیانەی کە ز هەڵپەڕکێ ئەوترێنو پێیان‌ئەڵێن (دێلۆك)و ناشۆمێررێنو روڕناو دەهۆڵیشیان لەگەڵدایە ٠

هەروەها گۆرانیەکانی شایمان بیرنەچێت کە لە کاتی بووك هێناندا ئەوترێنو پێیان‌ئەڵێن (هەقالی یاخود سەری زاقانۆ) ٠

---

(١٠) نوسەری کوردی ناسراو (یەشار کەمال) لە کوردستانی تورکیایەو سالی ٩٧٣ هەڵبژێررا بۆ ئەوەی یاداشتی نوبل وەربگرێت ٠

(لۆری)* ئـەو گۆرانیانەیە کە بۆ نووستنی منـاڵ ئەوترێن ئەمانیش بـە تەنها خۆیان جۆرێـك لە شێوەی سـادەیی‌و مەلولی پێك ئەهێنن ٠

گۆرانی‌و هەڵپەڕکێی کوردی بێ مۆسیقا ناکرێن‌و بێ‌گومان مۆسیقای کـوردیش بەشـێکە لـەو مۆسـیقایەی کـە پێی ئەڵێن مۆسیقای ڕۆژهـەلات ، بـەلام ناتوانـرێ تێـکەلاوی مۆسـیقای عەرەبی‌و ئەرمەنی‌و تورکی بکرێت ٠ لەگەڵ ئەوەشدا کە لە کۆنا مۆسیقای کوردی کاری کردۆتە سەر گۆرانی‌ی گەلە دراوسێکانی٠ لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانیـەکاندا مۆسـیقایەکی یەکجار پێشکەوتوو بەرزیان هەبووەو لاسایی کردنەوەش لە ناویاندا هەر بەردەوام بووە ٠

مۆسیقاژەنی بەناوبانگ (زریاب) لـە بنەماڵەیەکی کوردەو خەلکی موسڵە (٧٨٩ـ٩٥٧) ، ژیـانی هونەری لە بەغدا دەستی پێ‌کـردووەو زۆر بـە چـالاکی‌و هوشـیارانە لـە دیوەخـانی عەبدولڕەحماندا لە (کوردۆ) تـەواوی کردووە ، پەیمانگایەکی مۆسیقای تیا دامـەزراندووە ٠ ئـەو ئـاوازە ڕۆژهەلاتیـەی کە خراوەتەوە پەیمانـگاکەوە سروشـتێکی ڕەسـەنی هەبـووەو لە ئەندەلوسـەوە وەرگیراوەو هەتا ئەمڕۆش قەرەجەکان هەرماویانە٠

هەر (زریاب)یش بووە کە وەتەری پێنجەمی عودی دۆزیوەتەوە . (مێژوو)ش لەسەدەی نۆهەمدا نـاوی خێزانێکی مۆسیقیی کوردی تۆمار کردووە کە ئیبراهیم کوڕی مەهدیەو ، ئیسحاق مەوسلیش کوڕیەتی لە سـالی ٨٥٠داو هەروەهـا کوڕەزایـەکیشی هەبووە ناوی (حماد) بووە ٠

---

* لەناوچە کوردەواریەکانی کوردستانی عێراق‌و ئێراندا بەم جۆرە گـۆرانیانە ئەوترێت (لای لایە) ٠

ئەم ڕەسەنایەتی‌یەو تێکۆشانی ڕابوردووە هەرچۆن بوو بێت مۆسیقای کوردی ئەمڕۆ هەژار نیە ، بەڵام ئەوەندە هەیە کە مۆسیقایەکی میللیەو ڕێکخستن‌و کێش‌و ئاوازی‌نیەو* ئاوازەکانی لە جۆرەکانی زۆرترن‌و هەمیشەش بەرەو غەمگینی‌و دڵ پەستی‌و سەرسووڕمان ئەچێت • لە ڕاستیداو هەر لە هەمان کاتیش‌دا‌وەدەنگە کوردی‌یەکان چەند ئاوازێکی ڕێکخراویان هەیە ، ماناو لەرینەوەیەکی وا بەسۆزو غەمگینی هەیە کەمرۆڤ نازانێت ئەم بەسۆزی‌و خۆشەویستیە لە خورەوشتی ئەو هۆزانەدا چۆن دروست بوە کە لەڕەفتاریاندا تەنها بەزۆردارو تاڵانکەر ناسراون‌و ئەمەش ڕای (دولوری‌یە) بوە لەسەدەی پێشودا • گەشتەوەرە ڕۆژ ئاواییەکانیش پێویستیان بەوە نەبوە کە بنەڕەت‌و ڕەسەنی ئەم مۆسیقایە دەربخەن • هەندێکیان لەبڕیارەکانیاندا هەر لەبەر جوانی‌و سەرنج ڕاکێشەریتی ئەم ئاوازانە زۆر دڵڕەقن‌و هەندێکی تریشیان بەپێچەوانەوە هەستیان پێ‌کردوە کە(ساردو دزراوە)و ئەم مۆسیقایە بە(١٧)دەنگ دائەنێن کە ژمارەو ڕێک‌و پێکی دەنگەکانی تیا نیە • هەر لێرەدا زۆر جێگای سەرسوڕمانە ئەگەر زانیمان کە قەشەیەکی ئەرمەنی بەناوی (باوکە کۆمیتاس) (١٨٦٩ ـ ١٩٣٥) لەسەرەتادا هەندێ گۆرانی میللی کوردی کۆکردۆتەوەو نوسیویەتیەوە •

لەسەردەمێکی زۆر تازەداو لەساڵی ١٩٦٣دا دکتور کریستنس لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی کرد لەمۆسیقای هەڵپەڕکێ‌و مۆسیقای ئامێری‌و دەنگی هەکاریداو ئاوازەکانی شیتەڵ کردەوەو ڕەخنەشی

---

★ لێرەدا نوسەر باسی مۆسیقای کوردی کۆن ئەکات ئەگینا زۆر ئاشکرایە کە لەم ساڵانەی دوایی‌دا بەتایبەتی دوای ساڵی ١٩٧٠ مۆسیقای کوردی بە هەوڵی هونەرمەندانی هەنگاوی بەرز بەرزی ناوەو توانیویەتی تا ڕادەیەك خۆی بناسێ‌و مۆسیقازەنی باش پەیدا بکات‌و ئەگەر ماوەش بدرێت ڕەنگە زۆر زوو خۆی بگەیەنێتە مۆسیقای گەلە پێشکەوتوەکان •

لەشێوەكانی گرت • هەروەها كوردەكان خۆشیان ئەمڕۆ بیریان كردۆتەوە كە گرنگی بدەن بەمۆسیقای نەتەوەییانو لەناخی دڵیانەوە بڕیاریان داوە كە ئەبێ ئەم سامانەیان لەكیس نەچێت ، بەم شێوەیە هەندێ لەقوتابیانی عیراق دەستیان كردوە بەڕێك خستنی تیپی مۆسیقا بۆ پاراستنو پێش‌خستنی مۆسیقای كوردی • هەر لەم ڕووەوە لەسالی ۱۹٦۰دا لاوێكی كورد بەناوی (جەمیلی جەمیل(۱۱)) لەئەرمینیای سۆڤیەتی دیوانێكی لەگۆرانی كوردی چاپ كردوە • بەشی زۆری ئەو ئامێرە مۆسیقیانەی لەكوردەواریدا بەكارهێنرێن لەناو خۆدا دروست ئەكرێن •

هەموو شوانێك شمشالی خۆی هەیەو لەتوێشەبەرەیەكدا هەلی گرتوە . لەگەل هەلپەڕكێ‌شدا (زوڕنا) بەكارئەهێنن كە مزمارێكی كورتەو دەهۆلیشی لەگەلدایە • جوزەلەی نێرومێشیان هەیە كە نزیكەی ۲٥سم درێژەو لەدوو قامیشی گلۆری وەك یەك دروست كراوە كە هەموو قامیشەكە لەسەر باری درێژی كون كون كراوە بۆ ئەوەی پەنجەیان بخرێتە سەر بۆ پێك‌هێنانی ئاوازەكان • هەندێ جوزەلەی تر هەیە كە لەئێسقانی پەلەور دروست كراون و درێژنو ناوەكەیان گلۆرو دەمەكەشیان بریتییە لە دوو قامیشی بچوك كە ئەچنە ناو دوو قامیشە گەورەكەوەو ئەمانە زۆرباشنو دەنگ‌و ئاوازەكان ئەلەرێننەوە لەسەر هەر قامیشێكیاندا نەخشو نیگار كێشراوەو بەشی سەرەوەی درێژو باریكە •

شێوەی دروست بوونی لەرینەوەی دەنگەكان بەم جۆرە ئەبێت :ـ لەو كاتەدا كە فو ئەكرێت بە ئامێرەكەدا ئەبێ دەمەكەی بەتەواوی لەناو دەمی فووكەرەكەدا بێت ، هەردوو گوپ وەكو میزەلان

(۱۱) دانەری بەڕێز لێرەدا بە هەلەدا چوە•چونكە ئەم دیوانە سالی ۹٦٥ لەچاپ دراوە نەك سالی ۹٦۰ ، هەروەها كچێك داىناوە كە ناوی (جەمیلە جەلیل)بوە لە ئەرمینیای سۆڤیەتی •

پڕ ئەکرێن لەهەواو ئەو دەنگەی لەئەنجامی ئەم فو کردنەدا دروست ئەبێت لەدەنگی جوزەلەی مەشکە ئەچێت • لادێییەکانیش ڕەبابەو کەمانو عود لەهەڵپەرکێکانیاندا بەکار ئەهێنن • هەندێ جاریش یەزیدیەکـان لەڕازاندنەوەی گـۆرانیە ئاینیەکانیاندا (صەنج) بەکـار ئەهێنن کـە زۆرجـار لـەگـەڵێ ئاهـەنگی مەسـیحیە ڕۆژهەڵاتیەکاندا بەکار ئەهێنرێت ، ئامێری گیتاریش (ساز*) هەر بەکار ئەهێنن ، هەرچەندە تا ڕادەیەك ئەمە ئامێرێکی کوردی نیە • بۆقییش تەنها لەناو سوپادا بەکار ئەهێنرێت •

لەوانەیە لـەلای زۆر لـە تۆمـارگاکان گـۆرانیو مۆسیقای کوردەی تۆمـارکراو دەست بـکەوێ کـە لەسەر قـەوان تۆمار کراون* •

## ۲ ـ شایەرەکان :

### ئەو گۆرانیبێژانەی کە ئەگەڕێن بۆ گۆرانیوتن :

«کوردەکان بە پیاوو ژنەوە هەموویان شاعیرن !!» •

ئەمە قـسـەی نوسەری ئەرمەنیی بەناوبـانگ (ئابۆڤیان)ە (١٨٠٤ـ١٩٤٨) کە لە سەدەی ڕابوردوودا دەربارەی کوردەکان کردوویەتی ، مەبەستیش لەوە دەرخستنی ئەوەیە کە کورد ئەزانێ مۆسیقا لێبداتو حەزیش لە گـۆرانی ئەکاتو هەشیانە کە زۆر شارەزایە تیایدا •

گۆرانیبێژو حیکایەتخوانەکان لەناو گەلدا جێی باوەڕن ، ئەمانەش وەکـو شۆڕشگێڕەکان نین کە هیچ پەیوەندییـەکیان بە

---

★ ساز ئامێرێکی مۆسیقی کوردیە ، بەڵام گیتار کوردی نیەو ڕەنگە بە هەڵە مانای بە ساز وەرگێڕابێت بۆ نوسەر •

★ ئەم ساڵانەی دوایدا گەلێك تۆمارگای کوردی باش باش دامەزرانو گۆرانیو مۆسیقای کوردی زۆریان لادەست ئەکەوێت کە لە ئاهەنگە کوردیەکاندا تۆمار کراون ، نەك وەکو کۆن لەسـەر قەوان بەڵکو لەسـەر شـریتی تەسـجیلو بە سریوش، ئەم لایەنە ئێستا زۆر پێشکەوتوە •

هۆزەوە نەبێت ، بەڵکو بەناو هەموو وڵاتدا ئەگەڕێن بۆڕابواردنی خەڵکی •

دەرکەوتنی ڕادیۆی ترانسستەرو بڵاو بوونەوەی لەلادێکاندا لەم دواییەدا بووە هۆی ئەوەی کە بتوانن گوێ لە گۆرانی‌یە کوردییەکان بگرن کە لە ئێستگەکانەوە بڵاوئەکرێنەوە ، ئەبینین کە پیاوو ژن زۆر بە پەرۆشەوە گوێ لە گۆرانی‌یە چاکەکانیان ئەگرن‌و ئەمەش جێگای شایەرەکانی گرتۆتەوەو وای لەو پیشەیە کردووە کە نەمێنێت‌و لەگەڵ ئەوەشدا حیکایەتخوانەکان هەردەوری تایبەتی خۆیان ئەبینن‌و بۆ ڕاکێشانی گوێگرەکانیان سحری خۆیان هەیە بەتایبەتی کاتێك کە سەرگورشتەکانیان ئەگێڕنەوەو جوانی‌و ترسناکی‌و خەیاڵی خۆش‌خۆشی تیا تێکەڵاو ئەکەن‌و هەتا شەوگارێکی درەنگ ئەخایەنێت ، ئەگەر خەوبردنەوەی منداڵان نەبێت ، کە ئەویش ڕاکشان لەسەر ڕانی دایکیان کەمی ئەکاتەوەو هەرچۆن‌بێت گوێ لەو سەرگورشتانە ئەگرن کە زۆر جار لەسەر شێوەی هەڵبەستدان‌و یارمەتی حیکایەتخوانەکان ئەدەن بۆ قووڵکردنەوەی گێڕانەوەکانیان‌و هەر لەکاتی گێڕانەوەی سەرگورشتەکەدا هەندێ وشەی خۆش‌خۆش لە پاڵەوانیەتی‌و ئازایەتی‌و دڵداری‌و سواری ئەوترێت کە گوێگرەکان هان‌ئەدات بۆ گوێگرتن‌و بێ‌دەنگی •

ئەمەش دوو سەرگورشتەی کوردەوارین کە لەسەر شێوەیەکی سادە داڕێژراون‌و وا لە پێشەوە سەرگورشتەی (زلێخاو فاتول) باس‌ئەکەین :

لە سەردەمی کۆندا گەلێ کچی جوان جوان لەناو ماڵ‌و خێزانی (فاتول) خانی ئێراندا ئەژیان ، هەرە جوانەکەشیان زلێخا بوو کە فاتول لە پلەی پەرستندا خۆشی ئەویست • ڕۆژێکیان ویستی

خۆشەویستی‌ی خۆی بۆ دەربخات‌و لێ‌ی پرسی کە ئایا ئەو ڕای چیە لەوەی کە ئەم ئامادەیە ئەگەر زلێخا بیەوێت ئەم مانگی بۆ دێنێتە خوارەوە، بەڵام زلێخا تەنها ئەوەی بەس‌بوو کەشاعیرێك بهاتایەو گۆرانی‌ی بۆ بووتایەو ئەمیش گۆرانی‌ی بووتایە بۆ جوانی‌ی ڕۆژو سروشت ، چونکە ئەم حەزی لە گۆرانی ئەکرد • بەڕێکەوت لاوێکی کورد کە ناوی (تاری) بوو بە بەردەرگای کۆشکەکەی زلێخادا تێپەڕی ، ئەم لاوە مۆسیقاژەن بوو خەڵکی ئەسفەهان بوو، لە کۆشکی زلێخادا چاوی کەوت بە ئاهەنگی گۆرانی‌و هەڵپەڕکێ‌و چووە ژوورەوە بۆ ئەوەی هاوبەشی ئەو ئاهەنگە بکات ، زلێخاش لەسەر تەختی پاشایەتی لەبەردەم ژمارەیەکی زۆر میوانی عەرەب‌و فارس‌دا کە بەتایبەتی بۆ بینینی ئەو شازادە کوردە جوانە هاتبوون دانیشتبوو ، هەر لەگەڵ (تاری) دەستی دایە گیتارەکەی ئیتر لەگەڵ ئاوازی خۆشی مۆسیقاکەیدا لێ‌ی هاتە پێشەوە ، هەردووکیان سەیری یەکتریان ئەکردو دەستی کرد بە گۆرانی وتن‌و ئیتر زلێخا کەوتە فرمێسك ڕشتن •

[من تاری‌ی عاشقم، بەدوای ئیشێکا ئەگەڕێم، گۆرانی ئەڵێم، بۆ سەربەستی‌و بۆ خەڵکی کە هیلاك‌و نارەحەتی ئەم ژیانەن ] •

ئەم وشانە کاری کردە شازادە جوانەکەو کەوتە خۆشەویستی مۆسیقای ئەم لاوەوە •

شەو داهات‌و هەموو شت بێدەنگ بوو ، دوای ئەوەی بە مەی خواردنەوەو ڕابواردن هەموویان سەرخۆش بوون ئینجا نووستن ، بەڵام زلێخا بە تەنها خۆی نەنووست هەتا بەیانی ، چاوەڕوانی شتێکی ئەکرد کە خۆشی نەی‌ئەزانی تامی چیەو هەر لێکی ئەدایەوە کە ئایا تاری ڕۆیشتووە ؟ لەم کاتەدا دەرگای ژوورەکەی کرایەوەو تاری لەناو دەرگاکەدا دەرکەوت ، هەردوو

خۆشەویست دەستیان کردە ملی یەکتری ، کارەکەرێکی بەخیل پێی زانین‌و چوو بە فاتولی وت ، فاتولیش بە کتوپڕی کە دەستیان لە ملی یەکتردا بوو هات بە سەریاندا · ڕۆژی دوایی لە گۆڕەپانی گشتیدا سێدارەیان هەڵخست‌و تاری‌یان پیا هەڵواسی · تاری‌ی نامۆ کە کەس نەی‌ئەناسی ، پێش ئەوەی گیانی دەرچێت ، دوا ڕوانینی ڕاونی‌یە خۆشەویستەکەی ، چونکە لەو کاتەدا زلێخا لێوەی نزیک بوو سەیری ڕووداوەکەی ئەکرد، ژنان لەگەڵ زلێخادا ئەگریان‌و بردیانەوە بۆ کۆشکەکەی‌و هەوڵی ئەوەیان ئەدا کە تۆزێك لە خەم‌و خەفەتەکەی کەم بکەنەوە ، لە ڕێگا تووشی کارەکەرە تاوانبارەکە بوون‌و زلێخاش خەنجەرێکی دەرهێناو دای لەسەر دڵە پیسەکەی‌و کوشتی ·

زلێخا نەی‌ئەتوانی خۆشەویستەکەی لەبیربچێتەوە ، گۆڕەکەی بە گوڵ ڕازاندەوەو بە مات‌و مەلوولی لە کۆشکەکەیدا مایەوەو قسەی لەگەڵ کەس نەئەکرد، فاتولیش هەوڵی ئەوەی‌ئەدا کە بچێت بە لایەوەو خۆی لێ نزیك بکاتەوە ، ڕۆژێکیان بینی کە زلێخا ئەچووە دەرەوە ، هەوڵی‌دا کە نەیەڵێت بەڵام ڕای‌کرد لە دەستی ، ئیتر فەرمانی‌دا کە گۆڕەکەی تاری هەڵتەکێنن‌و لاشەکەی فڕێ بدەنە شوێنێکی ترسناکەوە ، ئەمە کارێکی تەواوی کردە سەر هەستی زلێخای مەلوول‌و تووشی‌نەخۆشی‌و لاوازی‌ی‌کرد شەوێکیان ئاسمان سایەقەی ساماڵ بوو ، ئەستێرەکان ئەدرەوشانەوە ·

دەستی کرد بە گەڕان بەدوای لاشەی خۆشەویستەکەیداو کەوتە ئەودەشتانەی ئەسفەهان کە پڕیەتی لەگورگ‌و گیانلەبەری دڕندە زلێخاش گۆرانی‌ی ئەوت بۆ چیاودرەختەکان‌و لێیان ئەپاڕایەوە کە لاشەی خۆشەویستەکەی نیشان بدەن · لەبەر شەوقی مانگە شەوەکەدا زلێخا لەژێر درەختێکا ئێسقانی مرۆڤێکی دۆزیەوە کە

ئەناسرایــەوە ، چونکە پەیــکەری ئێسکی هێشتا ساغ بــوو بەڵام گۆشتەکەی نەمابوو چونکە باوبۆران کاری تێکردبوو • زلێخا لە نزیك لاشەکەوە دانیشتو دەســتی‌کرد بە گریانو هاوار کردن ، دوای ئــەوە گەڕایەوە بۆ ئەسفەهانو لە ڕێگاکەیــدا تووشی باو بارانێکی سارد ئەبێ ، هەر لەگەڵ ئەگاتەوە کۆشکەکەی یەکسەر لە جێگادا ئەکەوێتو دوای چەنــد ڕۆژێك دڵی لە لێدان ئەوەستێو ڕوو ئەکاتە دنیای فانی •

سەرگورشــتەیەکی‌تر هەیە بــە ناوی «خەجو ســیامەند» کە ئەمیش ئەگەر لە زلێخاو فاتول میللی‌تر نەبێت وا کەمتر نیە • لە سەردەمی کۆنــداو لە (ســیپانــداغ) لاوێکی جــوانو پێکەوتوو ژیاوە کە ناوی (سیامەند) بووە ، ڕاوچی‌ی هۆزی (زیلی) بووە ، سیامەند ئەکەوێتە داوی خۆشەویــســتی‌ی (خەج)ەوە بەڵام هەژار بووە نەیتوانیوە مارەییە گرانەکەی بدات ، لەبەر ئەوە پەنا ئەباتە بەر هەڵگرتنو فڕاندنی خۆشەویــستەکەیو ئەیبات بۆ چیاکانو لەوێ سێ ڕۆژ بە کامەرانی‌و سەرفرازییەوە ئەمێننەوە •

لە ڕۆژی چــوارمداو کاتێــك ســیامەند لەســەر باڵی خەج نووستووە ، هەنــدێ ئاســکە کێــوی بــەو نــاوەدا تێ‌ئــەپەڕنو گەورەترینو جوانترینی ئەم ئاسکانە نێرینەیەکیان ئەیفڕێنێ ، کە خەج ئەم ڕووداوە ئەبینێ دەست ئەکات بە گریانو فرمێسك لە چاوەکانی دێتە خوارەوەو ئەکەوێتە سەر ڕوومەتی سیامەندو بەوە ەئاگا دێت ، کە فرمێسکەکانی خەج ئەبینێ پێ‌ی ئەڵێت : [ئەگەر ە ڕەزای خۆت نەبوویی بە ژنم ئەوا لەمەودوا وەکو خوشكو برا ردەوەت لەگەڵدا ئەکەمو ئەشــتبەمەوە بۆ ماڵی کەس‌وکارت] •

خــەج وەڵامی ئەداتــەوەو ئــەڵێ : [نەخێــر ئــەی ســیامەندی خۆشەویستم ، من تــۆم خۆش ئەوێت ، هەتا هەتایە بــۆ تۆ ئەبمو ژنێکی دڵسۆزی تۆ ئەبم ، بەڵام من بۆیە ئەگریم چونکە ئاسکێکی

بەهێزو گەورەم بینی ئاسکە مێینەیەکی لەناو ڕانەکەدا فڕاند بێ ئەوەی ئەوانی‌تـر ڕێگای لێ‌بگرن ، ئـەم ئاسکە ئازایە تـۆی بیر خستمەوە ، منیش لە یادی ئازایەتی‌ی تۆداو لە بەختیاری خۆمدا گریام] •

لێرەدا سـیامەند لێی ئەپرسێت کە ئایا ئاسـکەکان ڕوویان کردۆتە کوێ ، خەجیش نیشانی ئەدات ، سیامەند زۆر دڵی لەخۆی دائەمێنێت کە ئەو ئازاترین ڕاوچی ناوچەکەیەو کەچی بێ‌ئاگایە لەم تاوانەی کە لەپەنای ئەمدا کراوە • بۆیە هەوڵی ئەوە ئەدات کە بچێت بە دوای ئاسکە هەڵهاتووەکەداو تیرەکەی بەرەو ڕووی ئەو ئامادە ئەکات، بەڵام ئاسکەکە لێی‌هەڵ‌ئەگەڕێتەوەو سواری ئەبێ‌و باش برینداری ئەکات • سیامەند لە دۆڵەکەدا ئەکەوێ‌و خەجیش بەسەریا شۆڕئەبێتەوەو زۆر بەپەرۆشەوە بۆی ئەگری ، نەفرین لە دارستان‌و گوڵ‌و سروشت ئەکات‌و ڕقەکەی خۆی بە ئاوی کانی‌و گژوگیاو بـەرووبوومی ئەو ناوە ئەڕێژێت ، کە ئاسـکەکە لێی خواردوون‌و ئەو هێزەیان لێوەرئەگرێ کە وایان‌لێ‌کردووە بەسـەر سیامەندا سەربکەوێت •

جارێکی‌تـریش زۆر پەست ئـەبێ‌و نەفـرین لـە لەوەڕگا سەوزەکانی هاوین‌و لە هەوای پـاك‌و پڕ لە بۆنی گوڵە شاخاوی‌یە جوانەکان‌و لەو ڕۆژەی کە هەڵدێت‌و سپیان ـ داغ ڕوون‌ئەکاتەوە کە شوێنی ئاسکە کێوی دڕندەیە ئەکاتەوە •

خەج بەسەر لاشەی خۆشەویستەکەیدا ئەمرێت• لەو کاتەوەو هەر لەو شوێنەدا درەختێکی هەمیشە سەوزو بەردار سەوز ئەبێت، کە ڕێبـوارەکانی ئەو ناوە لە هێـزو توانای ئـەو خۆشەویستییە ئاگادار ئەکاتەوە •

## ٢ ـ جەژنو وەرزەکان :

کوردەکان هەروەکو جەژنی خێزانیان هەیە ، چەند جەژنێکی وەرزیشیان هەیە کە ئەوانەی مەڕوماڵات بەخێو ئەکەن (شوانەکان) ئاهەنگیان بۆ ئەگێڕن • ئەم جەژنو نمایشە لادێییانەش هەمە چەشنن •

(سەرەپێز ـ Sarapez) لە دەست پێکردنی وەرزی زاوزێی مەڕەوە دەست پێ ئەکات ، (بارودان ـ Barodan) کاتێکە کە ئەچن بۆ لەوەڕگاکانی هاوین • (بەرخ بڕ barx — bir) کاتی بڕینەوەی کاوڕە ، بەتایبەتی جەژنی گەورە (بەران بڕان ـ Baran — Biran ) کە تورکەکان پێی ئەڵێن (کاسیم ـ Kasim) لەکاتی هاویندا بەران ئەکەنە ناو کاوڕەکانیان ، لە(ئاڤێستا)دا[١٢] (Avesta) پاشماوەی ئەم جەژنە ڕەچاو کراوە ، هەرچۆنێك بێت ئەمەهەلێکی باشە بۆبانگ‌کردنێکی چەورو ئاهەنگێکی باش‌و هەروەها بۆنەیەکی باشە بۆ ژنو ژنخوازی لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا ، چونکە کچان دەسماڵە حەریرەکانیان ئەخەنە سەر ملی باشترین مەڕ ، کوڕێکیش دێت‌و دەستماڵەکە هەڵئەگرێت ، بەوە ئامادەیی خۆی نیشان ئەدات بۆ مارەکردنی خاوەنی دەسماڵەکە • ئەگەر هات‌و کەس‌وکاری کچەکە کەئاگایان لەوفێڵەیە ڕازی‌بوون ئەوا هەر دوای ئەوە داوا ئەکرێت‌و گواستنەوەشی لەکاتی خۆیدا جێ‌بەجێ ئەکرێت • ئەگەر تەنها ئاژەڵدارەکان ئەم جەژنانە بکەن لەبەرئەوەی پەیوەندی بە ئاژەڵەوە هەیە ، ئەوا جەژنی‌تر هەیە کە هەموو کوردەکان بەوپەڕی ئارەزوو بەتامەزرۆییەوە ئاهەنگیان بۆ ئەگێڕن •

---

(١٢) ـ کتێبی زەردەشتی کۆن •

جەژنی (نەورۆز – Newruz ) یاخود (نوێڕۆژ – که جەژنێکی کۆنی ئیسلامییە(١٣) ، لەناو هەموو ئێرانیەکاندا زۆر خۆشەویستەو* لەنــاو یەزیدیەکانیشدا زۆر پیرۆزە ، چونــکە وا ئەزانن بەمــە پارێزگاریی ئاینی نەتــەوایەتی‌یان ئەکــەن • بە جەژنێکی سالی تازەی دائەنێن (سەری‌سال)و لە ڕاستیشدا جەژنی بەهاری تازەیــە ، چونکە ڕێکەوتی یەکەم چوارشەممــەی مانگی نیسان(١٤) ئەکات •

زەمانەش بەرانبــەر بەم جەژنــە زۆر خراپ بــووە ، کەچی کوردەکانی عێــراق کە لە کۆندا ڕێگەشیان نەئەدرا ئاهەنــگی بۆ بگێڕن ، لــەپێش چەند ساڵێــکەوە دەستیان کردووە بــە ئاهەنگ گێڕانو نەورۆز بووە بە جەژنێــکی نەتەوایەتی‌ی ڕاستەقینەیان بە جۆرێــك کوردەکانی سلێمانی ئاهەنگی بۆ ئەگێــڕنو ئاگری خۆشی‌و شادی ئەکەنەوە ، لە بەغداش لە کۆڕی شیعرو گۆرانیدا ئاهەنگی بــۆ ئەگێڕن • هەر بەم بۆنەیەوە گۆڤــارە کوردییەکان ژمارەی تایبــەتی بە وێنەی ڕەنــگاوڕەنگەوە لەچــاپ ئەدەن •

قوتابی‌یە کوردەکانی دەرەوەی وڵات ئەم بۆنەیە بە هەل ئەزانن بۆ ئەوەی لە ڕێگای کۆنگرەو کــۆڕەوە گەلەکەیــان بناســێنن بە گەلانی‌تر کە لەم بۆنەیەدا دەرفەت دروست ئەکەن بۆ هاوڕێکانیان

---

(١٣) نەورۆز جەژنێکی ئیسلامی نیە ، بەلکو جەژنێکی کۆنی کوردە •

★ جەژنی نەورۆز،جەژنێکی نەتەوایەتی کوردەو لەناو هەموو کوردا خۆشەویستەو تەنها جەژنی ئێرانیەکان نیە •

(١٤) دانەر لەدانانی ئەم ڕۆژەدا هەڵەی کردوە • ڕاستیەکــەی ٢١ی ئــازارە ، هەروەکو بە ڕەسمی‌و بە گەلیش وازانراوە ، بەتایبەتی لەناو کــوردەکانی عیراقدا• بەلام بەڕاستی لەناو کوردەکانی ئێرانو تورکیادا بە(سێزدە بەدەر)* دانراوە •

★ لەناو کوردەکانی ئێراندا لەڕۆژی نەورۆزەوە ، هەتا سیانزە ڕۆژی تەواو پێی ئەوترێت (سیانزە بەدەر)و لەڕۆژی سیانزەشدا هەر ئاهەنگێکی تر ئەگێڕن •

که هــەر کەسـەیان بە گوێرەی ئاوازی نەتەوایەتییــان گۆرانیو هەڵپەرکێ پێك بهێنن ٠

لە ئێرانیش ، ئەو چوار شەممەیەی ئەکەوێتە پێش جەژنەوە لە هەمــوو ساڵێکدا کاتێکی تایبەتی یە بۆ خۆشی دەربــڕین لەگەڵ هەندێ یــاری‌ی جادوگەریدا ، چونکە ئەمە لەناو ئــەواندا ئەوە ئەگەیەنێت کـــە گیانە پیسەکان دەرئەکەنو بارێــکی ڕێكو پێكو باش ئەهێننە کایەوە ٠ هەر لەم جەژنــەدا لە تاران ئەچن بەژێر (تۆپی مروارید) یاخود (تۆپی بەنرخ) کە وا لە گۆڕەپانی (ئارك) ، چونکە وائــەزانن تێپەڕبوون بەژێر ئەو تۆپەدا بەختیــاریان بۆ ئەهێنێت ٠ لەم شارەدا بە ئاگری خۆشیەکەیان ئەڵێن (زراتشترا) چونکــە ڕایان وایە کـــە ڕوناکی ئاگــر زەمــانی خوای چاکــەو ڕاستەقینەیە ٠

ئەو مەرکانەو گۆزانەی کە لەم ڕۆژەدا ئەیانشکێنن بەوەیان دائەنێن کە هۆی پیتو بەرەکەت هێنان بنو دژی چاوی پیسیش ٠ بەرد ئەخەنە نــاو گۆزە ئاوەو وا ئەزانن مژدەی چاکەیان پێ یــە وەکو ئەو وشــانەی کە بە کتوپڕی ئەوترێن ، هەروەها بڕیــاری خێــرێك ئــەدەنو پــێ ی ئەڵێن (قاشــوق زانی)و شــۆربایەکی لێدروســـت ئەکــرێ کە بە درێــژایی ســاڵی داهاتــو باشـترین تەندروســتیان ئەداتێ بــەڵام ئەم ڕەوشــتە کۆنانــە وردە وردە خەریکە نامێنن ٠ هەموو خۆ ئامادە کردنێکیشیان بۆ ئەم جەژنــە دروستکردنی (سەمەنیە) (Samani) کە یادکردنەوەیەکی باخچە بەناوبانگەکانی ئەدۆنیسە ، دەنکە گەنم لەزەویەکی تەختدا ئەچێنن ، دوای ئەوەی ئەم شەتڵانە تۆزێك بەرزبونەوە بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە ئەیانبــڕنو لەقوڵینەیەکدا تەڕ ئەکرێو بــۆ

دەرهێنانی دۆشاوەکەی ئەگوشرێتو پاشماوەکەشی ئەخەنە ئاوێکی ڕۆیشتووەوە هەر لەتێوارەی نەورۆزدا ئەو دۆشاوە وەکو کەرەسەیەك بەکار ئەهێنن بۆ دروستکردنی چەشنە کێکێك ، هەروەها هەموو خێزانێکی ناسیاو دراوسێکانی بانگ ئەکات بۆ ئەم ئاهەنگە کە پێی ئەڵێن (مولود)(١٥) لەتێوارەشدا بەدەوری ئەو ئاگرەدا کە کێکەکەی پێ گەرم ئەکەن هەڵپەرکێ ساز ئەکەن ، کاتێك کە ئەم خواردنە پێ گەیی، لەگەڵ ئاوێنەیەكو کلو خەنەدا ئەخرێنە سەر سینیەكو هەموویان ئەخرێنە شوێنێکی داخراو ، ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ ئامانجو داواکاریەکانی خۆیان بهێننە دی لەدەوری ئەم سینیەدا چەند مۆمێك دائەگیرسێنن ، لەدەمەو بەیانداو کە شوێنی سینیەکە دەرکەوت ، ئیتر هەموویان لەسەر کێکەکە بەشوێن ، پاشماوەی لەپە دەستێکدا ئەگەڕێن ، کەوا ئەزانن دۆزینەوەی پاشماوەی ئەو لەپەدەستە لەسەر کێکەکە هەڵە بۆ پەرەپێدانی خۆشیەکەیان ، چونکە وا ئەزانن کە ئایشێ یاخود فاتمەی زەهرا هاتوون بۆ سەردانیان بۆ ئەوەی بەرەکەتو ڕەزامەندی ببەخشن بە ئاهەنگەکەیانو بۆ سەلماندنی هاتنەکەشیان نیشانەی لەپیدەستیان بەجێ هێشتوە دوای ئەوە ئەم کێکە پیرۆزە دابەش ئەکرێت بەسەر هاوڕێو دراوسێکانیاندا، زانای بەناوبانگ (توفیق وەهبی) لەم ڕووەوە نوسیویەتیو ئەڵێ (بەڕای من ئەم ئاهەنگە ڕەگو ڕەسەنایەتی تایبەتی خۆی لەزۆر ڕابوردوو کۆنەوە هەیە ٠

---

(١٥) یاخود خوێندنەوەی مەولودنامەی پێغەمبەری (پیرۆز)* ٠

★ لێرەدا ئاتەبرو وەرگێڕانی بۆ عەرەبی بە هەڵەدا چون ، چونکە کوردەکان نیسلامن لەڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەردا کە ڕێکەوتی ١٢ ی ربیع الاولی مانی کۆچی ئەکات هەموو ساڵێك مولودنامە ئەخوێننەوەو ئەم ڕۆژەش بە گوێرەی ساڵی زاینیو کوردی ئەگۆڕێت ، هەر ساڵەی ئەکەوێتە مانگێکی جیاواز لەمانی پێشوی بەهۆی گۆڕانی ساڵی کۆچیەوە ٠

لەناو ئێرانیە کۆنەکاندا ئەو ژنەی کە بۆ سەردان دێت ئەچێتە لای شاژنی (ئەناهیتا)و لەناو سۆمەریەکاندا ئەچنە لای عەشتارو بابلیەکانیش ئەچنە لای عەشتەرون • ئەبێ ئامانجی پێك‌هێنانی ئەم ئاهەنگە یارمەتی‌دانی هەموانو خوای بەپیت بێت بۆ سەرکەوتنی دروێنەی ئەو ساڵە ، لە سەردەمی ئێمەشدا لەبەر پێکهێنانی منداڵو نەوەی‌تازەو بەدی‌هێنانی ئامانجەکاندا ئەکرێت •

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەندێ لەگەشتەوەرەکان وەکو (مورغان) بۆیان دەرکەوتووە کە جەژنی نەورۆز لەناو موکریەکانی ساوجبلاق* (مەهاباد)ی ئەمڕۆدا بە تەواوی لە کرنڤاڵ ئەچێت •

(توفیق وەهبی) هەندێ لەو جۆرە دروشمانەی باس کردووە کە لە بەهاری سلێمانیدا بەجێ ئەهێنرێن ، خۆ ئامادە کردن لێرەدا ئەدرێت بە لیژنەیەکی تایبەتی ، دانیشتووانی سلێمانی لە رۆژی دیاری‌کراودا ئەچن بۆ ئەو شوێنەی دیاری‌کراوە بۆ ئاهەنگەکە •

پاشاو دەستو پێوەندەکانی دائەنرێنو پاسەوانەکانیشی دەوری ئەدەن • پاشا سواری گایەك ئەبێو دەستوپێوەندەکانیشی دوای ئەکەون ، دوای ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خێوەتگاکەی کە کورسیو قەنەفەو ئاگردانی تیا ئامادەکراوە • هەندێ خەڵك خۆیان ئەگۆڕنو لاسایی ئاژەڵ ئەکەنەوەو ئەم جەژنەش سێ رۆژ ئەخایەنێت •

ئەم پاشایە بێ لێپرسینەوەو لێکدانەوە باج لەسەر ئەو خەڵکانە دائەنێت ، لەوێ‌بنو لەوێ نەبن • ئەم نازناوی پاشایەتیو شوێنەی بۆ ئەمێنێتەوە هەتا جەژنی داهاتو کە یەکێکی‌تری لەپاش دائەنێن •

---

★ لێرەدا دانەر مەبەستی لە سابلاخە کە مەهابادی ئەمڕۆیە •

لەلایەکی تریشەوە (عەرەب شەمۆ) لە جەژنێکی میللی تردا هاوبەشیمان ئەکات کە خۆی بە مناڵی بەشداریی تیا کردووە ، ئەم جەژنەش جەژنی (کۆسەگلدی)یە(١٦) (Kose - geln. کە جۆرێکە لە کرنڤال ، گەنجێك خۆی ئەگۆڕێ‌و جلی شێخ یاخود مەلا لەبەر ئەکاو یەکێکی تریش جلی ژنانە لەبەر ئەکاو بەناو ماڵە دەوڵەمەندەکانا بۆ کەرەو پەنیرو پارە کۆکردنەوە ئەگەڕێن . ئەوەی جلی ژنانەی لەبەرکردووە سکاڵا ئەکات کە مێرشیان بردۆتە سەر شەرەفی، ئیتر لەجیاتیی ئەوە هەندێ پارەو گیسکێکی پێشکەش ئەکەن هەرچیەك بەم شێوەیەو لەلایەن گەنجەکانەوە کۆئەکرێتەوە بەسەر خێزانە هەژارەکاندا دابەش ئەکرێت .

## ٤ ـ یاری‌: خۆشییەکانی کوردەواری :

بەبۆنەی ئەم جەژن‌و وەرزانەو هەندێ شتی ترەوە گەلێ لە رۆژهەڵاتناس‌و گەشتەوەرەکان هاتون بۆ کوردستان وەکو ریچ‌و میلینجن‌و سولتن‌و خەڵکانی تریش‌و هەندێ یاری میللی ناو کوردەواریان بینیوە . لەپێش هەموویانەوە یاری (جرید)(١٧) کە جۆرێکە لەغارغارێنی ئەسپ لەهەموو شایی‌و خۆشییەکی ناوبەناوەکانی گەلدا شوێنی خۆی هەیە . دوای ئەوە یاریەکی ترە کە پێی‌ئەڵێن (taghaleh) کە جۆرێکە لەمەشق کردن بە ئەسپی تیژڕەو ، کە بەگوێرەی توانا شوێنێکی تەختی بۆ هەڵئەبژێرن‌و سوارەکان یەك لەدوای یەك بەوپەڕی تیژڕەویانەوە غار ئەکەن ، هەر گەیشتنە شوێنی دیاریکراو لەبەردەم ئەسپەکەدا دارێکی درێژ کە نزیکەی

(١٦) کۆسەگەدی : ـ وشەیەکی فارسیەو ناوی جەژنێکی کۆنە . بە کوردیش مانای (کۆسەوەری)،(کۆسەبەی)یە.هەتا ئێستاش دروشمەکانی ئەم جەژنە گەلێ‌بە سەرەتایی‌یە بە کوردستانی ئەمڕۆدا بەردەوامە . بە تایبەتی کە باران بران ئەبێت .

(١٧) یاخو (جنیت)،(جلیت بازی) .

مەترێکە فڕێ ئەدەنە سەر زەوی ، خۆ ئەگەر بە لێهاتویی‌و شارەزایی‌یەوە فڕێدرا ئەوا دارەکە لەهەوادا ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە ، هەر شارەزایی سوارەکەیە وا ئەکات کە بتوانێت دارەکەی بەجۆرێك بهاوێژێت بگەڕێتەوە بۆ دواوە ، یاخود بتوانێ بە ژێریا بڕوات یاخود بەدەستێکی بی‌گرێتەوە ، (چۆگان) (Chogan) یاخود (پۆلو) (Polo) وەرزشێکی فارسی کۆنەو صلاح‌الدین حەزی لێکردوەو هەمیشە زۆر بەخۆشیەوەلەو جێگا تایبەتیەدا کە لە دیمەشق بۆ ئەم یاریە ئامادە کرابوو لەسەر ڕۆخی بەرەدا مەشقی ئەکرد .

(زۆران)بازیش هەروەکو لەتورکیاو ئێران ئەکرێت لەناو کوردەکانیشدا باویەتی‌و هەیە کە حەزی لێبکات. هەروەها هەندێ لەگەنجە کوردەکانی بەیروت زۆر سەرکەوتوو پێش‌کەوتون لە یاریەکان‌و مەشقە وەرزشیەکان‌داو هەروەها لەهەڵگرتنی قورسایی‌ بۆکسێن‌و تۆپی پێ‌و سەبەتەدا .

یەکێ لەو یاریانەی کە زۆر میللیە یاری (هۆلوجوکە)ە کە وەکو یاری (هۆکی) ئێستا وایە .

ئەمانە بێجگە لەشەڕە کەڵەشێرو شەڕە کەو* ، شەڕە گامێشیش هەر ئەیانی‌ئەوەیە کە سەیربکرێت‌و شەڕە بەرانیش بابوەستێت کە چەند خۆشە ، هەروەها شوانە بچوکەکانیش یاری‌و ڕابواردنی خۆیان هەیەو هەر لەم ڕووەوە (عەرەب شەمۆ) یاری(زی زی) یاخود داری بچوك‌و پێش‌برکێ‌و تۆپێن‌و یاری تیروکەوان‌مان بۆ باس ئەکات ، سەرەڕای ئەو یاریانەی کە لەیاری ناو منالانی ڕۆژئاوا ئەچن وەکو : بازدان یاخود کاروانە خۆی ، یاری (شیر)و یاری 'سەرخۆچون (خۆبوراندنەوە) ، یاری هەڵماتێنیش وەکو یاری

* لە کوردەواریدا بە شەڕە کەو ئەڵێن [شەڕە بەق] .

داره‌بچوك (تاتول)و یاریه‌كانی یه‌كتری ڕاونان • له‌زستاندا ، منالاَن به‌یاری كۆتر هه‌ڵدان(سوك فڕێ)یان له‌قوتابخانه به یاری عاشق‌و (Kob) كاتی خۆیان ئه‌به‌نه‌سه‌ر •

پیاوانیش به یاری‌یه‌كی تره‌وه خه‌ریك ئه‌بن كه زۆر گرنگه‌و ئه‌ویش یاری كاغه‌زه (ئیسكانبیل) ، به‌گوێره‌ی قسه‌ی ڤیلچفسكی یاری زار له‌ناو مناڵه ده‌وڵه‌مه‌نده موكریه‌كاندا زۆر باوه‌و حه‌زی لێ ئه‌كه‌ن •

هه‌روه‌ها (نه‌رد) یاری‌یه‌كه له‌كاتی بێ‌ئیشی ئاساییدا پیاوه پیره‌كان له‌چایخانه‌كاندا ئه‌یكه‌ن • شه‌تره‌نجیش یاریه‌كی ڕه‌سه‌ن‌و سه‌ره‌كیه‌و پیاوه ڕۆشنبیره‌كانیان حه‌زی لێ ئه‌كه‌ن • ئه‌مه‌ش ڕۆشنبیریه‌كی باشه بۆ هه‌ر ئاغایه‌ك كه بیه‌وێت ڕێزی خۆی بگرێت • صلاح‌الدین زۆر حه‌زی له‌م یاری‌یه كردوه‌و ئێواران هه‌ر به‌م یاری‌یه‌وه خۆی خه‌ریك كردوه •

هه‌ر له‌گه‌ڵ ئه‌م ڕابواردنانه‌داو به شێوه‌یه‌كی تایبه‌تی هه‌ندێ یاری‌ی میللی‌ی‌تر هه‌ن كه یه‌كجار جه‌ماوه‌ر دڵخۆش ئه‌كه‌ن ، بۆ نمونه به‌بۆنه‌ی یادی عاشوراوه فارسه شیعه‌كان* چه‌ند كۆبونه‌وه‌یه‌كی ئاینی پێك‌ئه‌هێنن، پرسه‌ش هه‌روه‌كو ئه‌مه وایه• ئه‌و كوردانه‌ی كه شیعه‌نین ، بێجگه له چه‌ند كۆمه‌ڵێكی كه‌م نه‌بێت، وا ده‌رناكه‌وێت كه كه‌ڵك له‌م جۆره شتانه وه‌ربگرن •

قه‌ره‌قۆزی توركی یاخود شانۆگه‌ری سێبه‌ری چینی زۆر جیاوازی‌یان هه‌یه‌و هیچ قوتابخانه‌یه‌كی كوردستان نایانگاتێ ، بێجگه له‌وانه‌ش هه‌تا ئێستا شانۆ له‌ناو عه‌ره‌به‌كاندا زۆر باوی

---

★ ئه‌توانم بلێم له‌سه‌ردا دانه‌ری به‌ڕێز كه‌وتۆته هه‌ڵه‌وه ، چونكه كۆڕی ئاینیی فارسه شیعه‌كان به هیچ جۆرێك په‌یوه‌ندیی به یاریه میللیه‌كانی كورده‌وارییه‌وه نیه •

نیە ، ئیتر جێی سەرسوڕمان نیە ئەگەر لەناو کوردەکانیشدا باوی نەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە هەندێ لە ئەدیبو نووسەری زمانی عەرەبی لە بنەڕەتو ڕەگەزدا کوردن ، وەکو جەمیل صدقی زەهاوی(١٨٦٣ـ١٩٣٦) •

بەشێکی زۆر لـە تراژیدیای کلاسیکیی‌تر هەر لـەو جۆرە نووسراوانە هەیـە کـە هی کەڵەشـاعیری بەناوبـانگ (ئەحمەد شەوقی)یە(١٨٦٨ـ١٩٣٢) کە ئەمیش لە ڕەگەزو بنەڕەتدا هەر کورد بووە •

لە سـلێمانی هەوڵو تەقـەلای قوتابخانەیی هـەر هەبووەو تەنانەت لە تێـران لەکاتی شۆڕشی کوردا لـە (مەهاباد) ١٩٤٥ـ ١٩٤٦ ، گەنجـەکان لە هەندێ شانۆگەریی نیشـتمانیدا دەوری خۆیان بینیوە !!

بەڵام لە یەریڤـان لە ئەرمینیـای سۆڤیەتی یـەکەم شانۆی کوردی لە ساڵی ١٩٣٦دا دامەزراو هەروەها تیپێکی شانۆگەریش لە دێی (علی‌کوچك) دامەزراو لەڕاستیدا من ڕادەی سەرکەوتنو بایەخی هونـەریو زانستیی نـاو بینەرە کـوردەکان نازانم ، هەروەها ئەشتوانم پەنجە ڕابکێشـم بۆ هەندێ فلیمی ڕۆشنبیری فۆلکلۆریی ناو کوردەواری سۆڤیەت ، هەر لەم ڕووەوە هەندێ لە گەنجەکان لـە ئیـستگەی یەریڤـان خۆیـان دەرخستو هەندێ تەمسیلی ئیستگەییان دەرهێنا •

بەڵام هەتـا ئێسـتاش هونـەری شـانۆگەریی کـورد لـە سـەرەتادایە* ، مەترسیی ئەوەی لێ‌ئەکرێت کە لە پێش پێگەیشتنو پێشکەوتنیدا هونەری سینەما سـەری لێ‌بشێوێنێتو نەیهێڵێت ،

* ئەمە بـۆ کاتی نووسینی ئەم کتێبە ڕاستە • بەڵام ئەمڕۆ شانۆی کـوردی بە هەوڵی هونەرمەندانی دڵسۆز زۆر پێشکەوتووەو بەرەوپێش‌تریش ئەڕواتو بەرهەمی باشی هەیەو چاوەڕوانی دواڕۆژێکی گەشی لێ‌ئەکرێت •

لەگەڵ ئەوەشدا کە کورد زۆر کەم کاتی خۆی لە سینەماکاندا ئەباتە سەر ٠

## ٥ ـ ئەمرووەو تارتارین :

زۆر بە ئاسانی هەست بەوە ئەکرێت کە کورد حەز لەدەرەوەو هەوای پاك ئەکات ، ئاهەنگەکانیشی لە دەرەوەی ماڵدا ئەگێڕێت‌و لەپێش هەمووشیانەوە حەز لە ڕاوچیەتی ئەکات ، لە ڕاستیشدا کورد ڕاوچیەکی بەتواناو تفەنگ‌چیەکی زۆر شارەزایە ، ڕاوچیەتی خۆشترین حەزیانە ، میوان بانگ ئەکەن بۆ کاروانە ڕاو ٠ وڵاتەکە پڕیەتی لە نێچیری هەمەچەشنەی تووك‌دارو پەڕدار کە کات بردنە سەر زۆر خۆش ئەکەن ٠ ڕاوی گیانلەبەرە دڕندەکان ئەکەن ، وەکو ورچ‌و گورگ‌و شێرو ڕێوی‌و بەرازی کێوی کە کوردەکان قەت نایخۆن ٠

هەروەها لە کۆناو هەتا سەدەی ڕابوردوش ڕاوی شێریان ئەکرد ، خۆ ئەگەر بڕوا بە سەرگورشتەکانیان بکەین ئەوا خۆ گرتووشیانە ، بەڵام ئەمڕۆ بەتەواوی ئەم شتە نەماوەو ئێستا بە دوای کەروێشکە کێوی‌و ئاسکدا ئەگەڕێن بۆ گۆشتەکەیان‌و لەم ڕووەوە پەندێکیان هەیە کە ئەڵێت : [لەپێناوی ڕاوکردنی نێچیرێك لە هێلانەکەیدا ئەبێ خۆت بخەیتە مەترسییەوە] ، ئەمەش دەربارەی هەندێ مەڕ ڕاستە ٠

لە کوردستانی عێراق‌و لەسەر ڕۆخەکانی ڕوباری سیروان ، ڕاوی هەمە چەشنە ئەکەن ، لەوانەی کە پەڕیان هەیە وەکو مێشەسی‌ر قازوقولنگ‌و کەوو پۆڕو سراوی‌یە کێوی ٠

خۆ ئیتر کەو با بوەستێت کە باڵندەیەکی میللی ناسراوەو زۆر حەزی لێ ئەکەن‌و گەلێك ڕێگایان هەیە بۆ کوشتن یاخود گرتنی بۆ ئەوەی بەخێوی بکەن ٠ لە ڕاوکردندا بە گوێرەی پێویستی کات‌و

ماوه شتومــەکی بۆ بەکار ئەهێنن وەکو تفەنگك یاخود تــۆڕ یان ماکەو • لەکاتی بەفر باریندا هــەر بەدەست ئەیگرن • بەڵام لە بەهاردا بەهۆی پەریزو* شوێن ڕاوەوە ئەیانکوژن • هەندێ جار نرخی هەندێ پەرێزیان ئەگاتە ڕادەی مارەیی ژنێك •

تانجی لەنــاو کوردەواریــدا بەناوبانگە ، هــەروەکو سەگە گەورەکــانی شوانەکانیــان ، هەروەهــا داڵیش فێرئــەکەن بــۆ ڕاوکردن • شاهۆ (هەڵۆ) جاری وا هەیە نــرخی بەرزئەبێتەوەو ئەگاتە ۳۰ لــیرەی ئاڵتوون ، ئەمە لە ڕاوکردنی حــاجی لەقلەقدا کەڵکی لێ وەرئەگرن •

بەڵام (سێبەر) کە نرخی ۲۰ لیرەی ئاڵتوونەو (دوکسان) کە نرخی زۆر لــەم کەمترە لــە ڕاوکــردنی کۆترو کــەودا کەڵکیان لێ وەرئەگرن •

[حسین ئەبــەش] کە کوردێــکی دیمەشقیە ، لــە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بــە بەناوبانگتــرین ڕاوچیی ســەردەم دائەنرێت • بەتایبەتی لــە ڕاوکردنی ئاسكو کەڵەکێویدا ، لە پێشــەوەش لە باسی باری کۆمــەڵایەتیو کشتوکاڵیدا هەر باسمان کــرد لە ساڵی ۱۹۰۰دا حسین ئەبەش لە سوریا دەستی کردووە بە ڕاوە ئاسكو بزنەکێوی • دوای ئەوە ۱۰ ساڵ لە سۆدان ڕاوی شێرو گامێشو یەكشاخ (خرتیت)و پڵنــگی کردوو ە• هەر ئەمەی لــە ئۆغەندەو کۆنغۆو بەلجیکاش دووبارە کردۆتەوە •

لە هندســتان ڕاوی پڵنگكو فیــلو ئاسکی لە جــۆری (تیتل) کردووەو هــەروەها لە ئەفریقای ڕۆژهــەڵات لە پرتغــال ڕاوی وشترملی کردووە •

---

★ بەرێز : بــەو شوێنە ئەوترێ کە ڕاوچی خــۆی تیا حەشار ئــەدات بۆ ئەوەی نێچیرەکەی نەیبینێت •

لە دیمەشق کۆشکێکی هەیە کە بەیادگارە جوانە هەمە چەشنەکانی ڕازێنراوەتەوە ، مۆزەخانەیەکی گەورەی تیایە کە گیانلەبەری سەرسووڕهێنەری هەمەچەشنەی تیایە ، هەروەکو هەموو وڵاتەکانی تری جیهان ٠

ڕاوچییە کوردەکان زۆرجار گیانی تارتارین کاریان تێ ئەکاتو وەکو ئەوان وان ٠ کاتێك حکایەتخوانەکان شتێك لە یادگارو ڕووداوەکانیان ئەگێڕنەوە گەلێ پێی دڵخۆش ئەبن ٠

لەسەردەمی بەدرخاندا وا ڕێك ئەکەوێت کە شێرێك لەناوچەی جەزیرە پەلاماری گاگەلو ئاژەڵێکی گەورە ئەدات ٠ دوای ئەوەی گەلێ هەوڵ ئەدەن بۆ کوشتنی ئەم شێرە بێ ئەنجام ئەبێت ، سەرداری بۆتان بڕیار ئەداو بڵاوی ئەکاتەوە کەپاداشت ئەدات بەو کەسەی ئەتوانێ ئەم گیاندارە دڕندەیە بکوژێت ٠ کۆچەرییەك ئەمە بە هەڵ ئەزانێو ئەچێت بۆ ناوچەی جەزیرە ، تەنها دار دەستێکی گەورەی پێ ئەبێت ، زۆر بەناڕەحەت ئەگاتە ناوچەکەو لەکتوپڕدا شێرەکە دێتە سەر ڕێگای پیاوەکە ، پێش ئەوەی شێرەکە پەلاماری بدات ، براسان یەك داری باش ئەگەیەنێتە ناوچەوانی شێرەکە ، شێری دڕندە وەکو ڕێوییەکەڕ بێ گیان ئەکەوێتە بەردەم کابرای کۆچەری ، کابرای فەقیر وا ئەزانێت کە سەگەکەی سەرداری کوشتووەو ترسی ئەوەی لێ ئەنیشێت کە دەستوپێوەندەکانی سەردار پێی بزانن و بیگرن ، ئیتر دەمودەست ئەو ناوچەیە بەجێ ئەهێڵێت ٠ وا ڕێك ئەکەوێت کە بۆتانیەکی پیاوخراپ بەوێدا تێ ئەپەڕێو لاشەی شێرەکە ئەبینێتو یەکسەر لولەی تفەنگی تێ ئەکاو گوللەیەکی پێوە ئەنێت ، دوای ئەوە ئەیخاتە سەر پشتی کەرەکەیو ئەیبات بۆ سەرداری بۆتان ٠ بەڵام سەردار لەجیاتی ئەوەی پاداشتی بداتێ پێش هەموو شتێ ئەکەوێتە

پرسیار لێ‌کردنی‌و لەو کاتەدا بیر ئەکاتەوە کە بۆتانی پیاوی ئەوە نین شێر بکوژن • هەر لەو ماوەیەدا پاڵەوانی ڕاستەقینەمان (کۆچەریەکە) بەسەرهاتەکەی بۆ دوکانداریك ئەگێڕێتەوەو بۆی باس ئەکات کە چۆن سەگەکەی سەرداری کوشتوە • کاتێك دەنگی جارچی گشتی سەرداریان گوێ لێ ئەبێت • دوکان دارەکە داوا لە کابرای کۆچەری ئەکات ، زیاتر بۆی ڕونبکاتەوە کە چۆن سەگەکەی کوشتوە ـ دوای ئەوە پێی ئەڵێت برام تۆ سەگی سەردارت نەکوشتوە بەڵکو ئەوەی تۆ کوشتوتە شێرەکە بووەو هەستە بەپەلە بچۆ بۆلای سەردار بۆ ئەوەی پاداشتەکەت وەرگریت•

پیاوەکە ئەچێت بۆ کۆشك‌و هەر لەگەڵ لاشەی شێرەکە ئەبینێ یەکسەر بەوانەی دەوروپشتی ئەڵێت (بەخوا ئەگەر ئەم برینەی نەبوایە ئەم‌توانی بڵێم کە من بە داردەستەکەم کوشتومە ، ئەم هەواڵە ئەگاتە سەردارو کابرا بانگ ئەکات‌و هەر کە ئەی‌بینێ بە تەواوی بۆی دەرئەکەوێت کە ئەم پیاوە شایانی ئەوەیە کە بتوانێ بە داردەستەکەی شێرێك بکوژێت‌و ئیتر ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵدا ئەکات •

ـ ئایا تۆ شێرەکەت کوشت ؟ •
ـ گەورەم ئەگەر ئەو برینەی سەری نەبوایە ئەم توانی بڵێم من کوشتم •
ـ چۆن کوشتت •
ـ سەرداری گەورەم ، وای دائەنێین کە تۆ شێرەکەیت‌و منیش منم باشە ، کاتێك کە ویستی پەلامارم بدات ، داردەستەکەم لێ بەرز کردەوەو ، ئابەم شێوەیە کێشام بە نەوچەوانیا •
ـ لێرەدا بەردەستەکانی سەردار تەنها ئەوەندەیان پێ ئەکرێت کە دەستی کابرا بگرن‌و نەیەڵن بیکێشێ بە ناوچەوانی سەرداردا •

ـ باشه کەواتە تۆ بویت شێرەکەت کوشت ، ئێستا پێم بڵێ چیت ئەوێ بتدەمێ •
ـ گەورەم لەهیچم کەم نیەو پێویستم بەهیچ نیە بێجگە لەچەردەیەك پارە کە ئەمەوێ باجەکانی سەرداری لێ بدەم •
ـ لەمەولا لێت خۆش ئەبم و نایەڵم باج بدەیت چی ترت ئەوێت ؟•
ـ سەردارم من تفەنگێکو چەند سەرێك مەڕم هەیەو خواردەمەنیشم هەر هەیەو لەمانە زیاترم ناوێ •
ـ سەردار فەرمان ئەدات بە پیاوەکانی کە لەگەڵیدا بچن بۆ بازاڕو جلوبەرگی تازە بۆ خۆیو منداڵەکانی بکڕنو شیرێکو تفەنگێکی ئاودار بە ئاڵتونی پێشکەش ئەکات •

ئەم سەرگورشتە کورتەو سەرگورشتەکانی تریش زۆر بە پەرۆشەوە عثمان سەبری کە یەکێکە لە حیکایەتخوانەکانی کورد بۆی گێڕامەوە •

هەروەها ڕاوە ماسی کە لەیەك کاتدا ئیشو وەرزشیشە ، هەمدیسان زۆریان لاخۆشە • چونکە ماسی لەناو ڕوباری فوراتو پەلەکانیو لەناو ڕوباری دیجلەو خابورو هەردوو زێو لەهەموو چەمەکانی کوردستاندا یەکجار زۆرەو بەتۆڕ یاخود بە قولاپو چنگاڵ ڕاوی ئەکەن • هەروەها بە مەتاڵیش ڕاوی ئەکەن ، بە تایبەتی ئەگەر بیانەوێ ماسی گەورە بگرن ، وەکو ماسی (توبی) کە لەناو زێدا هەیە کە کاتێك لەسەر پشتی کەر ئەیبەن بۆ بازاڕ سەری لەلایەکەوە لەزەوی ئەخشێو کلکیشی لەو لاکەی ترەوە •

# بەشی حەوتەم

## ڕۆژە شومەکانی کوردەواری

## ڕۆژە شومەکانی کوردەواری

هەروەکو هەموو وڵاتە تازە پێگەیشتوەکانی تر ، کوردستانیش لەچۆنیەتی باری تەندروستیدا هەر دواکەوتوە ٠

هەروەکو ئەزانین خانوەکانیان ، بەتایبەتی لەلادێکاندا هەر ئەوە نیە ئاوو کارەبایان نەبێت ، بەڵکو بێبەشیشن لەشوێنی ڕابواردنو بەدەگمەن ئەبینرێت کە دانیشتوانی دێهاتەکان تۆزێك ئەرك‌و باگرانی لەسەرشانی‌خۆیان لابەن‌و بچنە نزیك کانی‌یەکەوە کە خۆشۆردنو دەستنوێژ گرتنی تیا ئاسان بێت ٠ هەر لەپێش چەند ساڵێکەوەو لەلادێ گەورەکاندا هەندێ جێگا هەیە کە چرای ئاسای‌یان تیا داناوە ٠

هەتا ئێستاش مێشولەی مەلاریا (ئەنۆفلس) لەسەر بەرزایی «٢٠٠٠م»لەسەر ڕوی دەریاوە ئەژی‌و مەرەزەکانیان پڕە لەگەرای ئەم مێشولەیە ٠ مێشیش با بوەستێت کە هەر لەزۆر بوندایەو سەرچاوەی ئێشو ئازاری ئەو میوانانەیە ، کە بەوێدا تێ‌ئەپەڕن‌و

لەبەهاردا کێچ بەڕادەیەك زۆر ئەبێت کە پیاو لەنــاو ماڵەکاندا ناتوانێ بمێنێتەوە • بەشەوا لەسەر ســنوری ئێرانی گەنە خوێن هەڵئەمژێت •

بەڵام نەخۆشخانەیان نیە * ، تەنها لەشــارە گەورەکانی وەکو سلیمانیو هەڵەبجەدا نەبێت کە بە شێوەیەکی گشتی بەشیان ناکات پزیشکیان کەمەو هەندێ جار میری تیمارخانەیان بۆ ئەکاتەوە کە برین پێچێکی تیایەو هەندێ دەرمان دابەش ئەکات بەتایبەتی کنین و خوێی ئینگلیزی* لەبەرئەوە نابێ سەرمان سوورِبمێنێ لە قسەی دکتۆرێکی بەریتانی دەربارەی عێراق و کوردســتانیش کە هەر لە ژێر ئەو بارەدا ئەژی ، ئەڵــێ :لەدڵی منەوە کــە دکتۆرێکــم . وا ئەزانم عێــراق باشــترین وڵاتە لەجیهاندا چونکــە بەهەشــتێکی ڕاستەقینەی هەموو نەخۆشیەکانە •

## ١ ـ نەخۆشیو برینداری : ـ

کەوابو ژیان لەکوردستاندا تەنها نەختێکی خۆشــیو خۆش گوزەرانیە ، کە ئەویش ڕۆژانە پڕیەتی لەنەخۆشیو برینداری ، چونکە ژیانی کۆچەرەکانیان کە لەو دەوروبەرە فراوانانــەدایە هەمیشە وان لەڕێی ترسو لەرزی ڕاوکردندا، هەروەها شەڕکردنی نێوان شوانەکان یاخود نێوان ڕەزەوانو دوکاندارەکان . ئەمانە هەموویان ئەبنە هۆی لێدانو بریندارکردن بە تایبەتی کــورد کە ڕەوشتێکی توڕەو کەللە شەقی هەیەو هەمیشە خەنجەرەکەشی وا بە یەخەیەوە هەروەها لەوانەیە کە بەهۆی ئاژەڵیشەوە توشی مەترسی ببن ، وەکو گازگرتنی سەگو گورگ ، مارو دوپشك پێوەدان ،

* ئاشکرایە کە ئێــتا باری تەندروستی لە کوردەواریدا گۆڕاوە ، نەخۆشخانە زۆر بووەو تەنانەت زۆربەی دێهاتەکان تیمارخانەیان تیایە •

* لە کوردەواریدا بەم خوێیە ئەڵێن (ئینگلیزدۆزی) •

شۆقی بەرانو مانگا •

هەروەها بەهۆی بەکارهێنانی چەکو تەقەمەنیشـەوە هەندێ کارەسات ڕوئەدات ، با سوتانیش لەولاوە بوەسـتێت • سـەختی ئاووهەواو بـاری سـروشتی ناوچەکەشیان دانیشـتوانی توشی جۆرەها نەخۆشی ئەکات • بێگومان ئاشکرایە کە ئەم ولاَتە ئەبێتە شوێنی نەخۆشیو لەخزمەتگوزاری تەندروستیشدا هەژار ئەبێت• نەبونیو کەمی خواردەمەنیش هەر دەوری تایبەتی خۆی هەیە لە مردنی ٥٠٪ی منالەکانیاندا کە زۆر ترسناکەو لەسـاڵێکدا ڕادەی ئەگاتە ٢٥٪ تا ٤٠٪ بەلاَم ئەمەیان وەکو شتێك پێی ڕاهاتـونو خۆیانی ئەدەن بەدەستەوە •

تەمەنی ژیانی گەورەکانیشیان هەر لەسنوری ٣٠ ساڵدایەو هەندێ جاریش هەتا ٢٨ ساڵیە ، ئەمەش لەسەر قـسـەی هەندێ لە شارەزاکانیانە •

هەروەها چاوێشەش هەر زۆرە : وەکو شەو کوێری ، (گەورە بونی پەردەی چاو)ئاوسـانی ناوچاو یاخود گلێنەی چاو، تەراخوما ، هەروەها جارجاریش کوێر ئەبن • سـیلیش هەر کەتنی خۆی ئەکاو قوربانی زۆری هەیە • بە پێچەوانەوە نەخۆشی [سفلس] ـ مرض الزهری ـ سوزەنەك کە لەسەرەتادا لە کوردستاندا نەبوەو هەموو عەرەبەکانی جبوری هەر لەمناڵیـەوە توشی بوون ، هەمـوو ئەو کوردانەش کە لەسـەر ڕۆخەکانی هەردوو زێو ڕوبـاری دیجلە دائەنیشن توشی ئەم نەخۆشیە بوون • مەلاریـا (لەرزوتا) گەلێ زیانی لێداون :ـنانەت هۆی چواریەکی سـردن ئەدەنە پاڵ ئەو ، بەلاَم بەهـۆی هەنـدێ لـەو ئیشوکارانەوە کە لـە ناوچەکانی کوردسـتانی عیراقدا کراوە تا ڕادەیەك قەلاچۆ کراوە •

لەسـاڵی ١٩٥٢ و لەساڵەکانی دوایـدا پزیشکێکی ئیتالی کە

ناوی (لویجی مارا) بوو هات بۆ عێراق • ئەم پزیشکە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ناردبووی‌و لەڕوی چارەسەرکردنی مەلاریاوە زۆر شتی سەرسوڕهێنەری کردوە ، بەشێوەیەك کوردەکان ناویان نابوو (دکتــور مەلاریا) • هەروەهــا ئاولەش هەر قوربانی خۆی ئەسێنی‌و هەتا ئێستاش هەندێ لەکوردەکان پاشماوەی ئەم نەخۆشیە وا بەدەم‌و چاویانەوە •

نەخۆشی‌و تای ڕیخۆڵە هەمەچەشنەو زۆرن ، کرمی ڕیخۆڵەش شتێکی ئاسایی‌یەو ئەو بێگانانەش بەو ناوانەدا تێ‌ئەپەڕین زۆر بە زوویی توشی زەحیری‌و سك‌ئێشە ئەبوون •

گیان‌دارە لولەییەکان لەگیان‌دارە یەك خانەییەکان زۆرترن • جێگای سەرسوڕمانیش بوو کە هەندێ ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی‌و ئەوروپی کە لەکارەساتەکانی ٩٦٣ ـ ٩٦٤دا لەکوردستانی عیراق خۆیان خستبوە مەترسیەوە ، توشی گەلێ نەخۆشی‌و ئازارو زیان بوون • نەخۆشی جگەریش هەر هەیەو ڕۆماتیزمە* زۆربڵاوبۆتەوەو لەڕاپۆرتێکی ڕەسمیدا دەرکەوتوە کە ئەو نەخۆشیانەی بونەتە هۆی مردنی زۆری دانیشتوانی شاری سلیمانی‌و لەساڵی ١٩٥٢دا ئەم نەخۆشیانەن •

١ ـ ئاوسانی سیەکان (نەخۆشیی سیی) ٦٩ کەسی کوشتوە •
٢ ـ مەلاریا (لەرزوتا) ٦٦ کەسی کوشتوە •
٣ ـ کەم خوێنی (فقر الدم) ٥٧ کەسی کوشتوە •
٤ ـ نەخۆشیەکانی دڵ ٣٤ کەسی کوشتوە •

---

* ڕۆماتیزم : لــە کوردەواریدا پێی‌ئەوتــرێت (باداری) چونکە ئەگــەر یەکێك شوێنێکی لــەشی توشی ئەم نەخۆشییەبێت ئەڵێ فلان‌شوێنم تــوشی بادارە، بوە یاخود باداری داویەتە فلان‌شوێنم ••• هتد •

٥ ـ ئاوسانی گورچیله ٣٠ کەسی کوشتوه •
٦ ـ گرانەتا ٢٢ کەسی کوشتوه •
٧ ـ سـیل ٢٣ کەسی کوشتوه •
٨ ـ سكچون (زەحیری) ١٧ کەسی کوشتوه •
٩ ـ ئەو نەخۆشیانەی کە بەتەواوی نەزانراون
٢٦٤ کەسیان کوشتوه •

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم هەڵژماردنە بەتەواوی جێگای بڕوا نیە ، بەڵام هەرچۆن بێت شێوەیەکی وامان ئەداتێ کە بەبێ بێنەو بەردە خۆمانی بدەین بەدەستەوە •

٢ ـ چارەسەرکردن (داودەرمان) : ـ

هەرچەندە نەخۆشیش هەبێت کۆمەڵ خۆی ئـەو ڕێگایانەمان پیشان ئەدات کە خۆی پێ بپارێزێت • لەناو کوردەواریشـدا ئەم ڕێگایانە زۆرن • یەکەمیان پەنابردنە بەخواو پیاوە پیرۆزو دەستو پێوەندەکانیانو پیاوچاکو موسوڵمانان ، هەروەها بەکـارهێنانی دۆعاو جادوکردن • داودەرمانی تاقیکراوەو سروشتیش بەکـار ئەهێنن لەهەندێ چارەسەرکردندا •

لەم دواییەشدا کوردەکان دەستیان کردوە بەسەردانی پزیشکە خاوەن شەهادەکان •

نەخۆشی لەخواوەیەو چاکبونەوەشی بەدەستی ئەوە • لەبەر ئەوە لەپێش هەموو شتێکداو بەهۆی پێغەمبـەرەوە (د • خ) ئەبێ پەنا ببرێت بە خوا ، عائشە کە باشـترین ژنی پێغەمبەر (د • خ) بووە (خـوای لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتـەوەو ئـەڵێ (هەر کاتێك پێغەمبەر (د•خ) شـوێنێکی لەشی بیەشایە سـوورەتی (قل هوالله احد) و سـوورەتی (الفاتحـە)ی لەسـەر بەری دەسـتی ڕاستی ئەخوێندو ئەیهێنا بە شوێنە ئێشاوەکەدا •

ئاوی دوعاخواردنەوە کەئایەتێکی قورئانی لەسەر نووسرابێ

له هەموو جۆره نەخۆشیەکی ڕۆژانــەدا بەکاری ئەهێنن ، تەواف کردنو چوونه سەر گۆڕی پیاوه ئاینیەکان که نرخی ئاینیان هەیه له ڕەوشته میللیه پەیڕەوکراوەکانه • ئیتر گرنگ نیه گاور بێت یان موسـوڵمــان ، بۆ نموونه گــۆڕی باوکــه پۆلدو (لیــو پۆلدو سولدینی) که پەیامبەری کۆنی دومنیکانیەکانەو زانایەکی ڕوەکی چاكو پزیشــكێکی شارەزا بــووەو ساڵی ۱۷۷۹ مــردووه وا له زاخۆو هەتــا ئێستاش کوردو گاورو جوولەکەکان لــه نەخۆشیی گرانەتادا ئەچنه سەریو داوای چاكبوونەوەی لێ ئەکەن •

باوکان منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان ئەهێنن بۆ سەر ئەم جۆره گۆڕانه ، لەتێ نانو سەلکێ پیازو تۆزێ خوێی لەگــەڵ ئەهێنن بۆ قوربانیی گۆڕی پیاوه ئاینیەکەو لەوێ بەجێی ئەهێڵن ، هەروەها جامێك ئاو بۆ شوێنی نەخۆشەکه • دوای ئەمانه جامی ئاوەکه له سەر گۆڕەکــه ئەشکێنن • خۆڵی ســەر هەندێ لەم گۆڕانــه زۆر بەکاره لەچاككردنەوەی هەندێ نەخۆشیدا •لەناو یەزیدیەکاندا ئەگەر یەکێك ئازاری خوراندن یاخود نەخۆشیەکی پێستی هەبوو ئــەوا جامێك ئاو ئەبــاتو ئەچێتــه ســر گــۆڕی شــێخ موســا سورەو ئاوەکه ئەکاته سەر خۆڵی گۆڕەکەو به قــوڕەکەی شــوێنه نەخۆشەکه چەور ئەکاتو جامەکه ئەشکێنێ •

هەندێ لــەو مەشایەخانــەی که لــه شتی پڕوپــووچدا زۆر شارەزان کەڵــك لەم خەڵکانه وەرئەگرن ، بەوەی کــه قووتووی خۆڵ هەڵئــەگرن لەهەمــود جۆره پــیرۆزەکانی ، چونــکه هەر جۆرەیان ســیفەتی تایبەتی خۆیان هەیه ، هەیانه بــۆ چاویەشەو هەیانه بۆ ســەر ئازارو قەبــزیو ڕەوانی ، یاخــود لەنــاو ئاودا ئەیتوێننەوەو ئاوەکــەی ئەخۆنــەوه بــۆ سكئێشه یــان بەکاری ئەهێنن بۆ ئازارەکانی دەرەوەی لەش ، یاخود دوای ئەوەی حەوت

ڕۆژنوێژو ڕۆژووی بەسەردا ئەخوێنن و ئەیکەن بە دەرمانێکی کاریگەر .

سەرداری یەزیدیەکان [ئیسماعیل بەگی چۆلو] لە بەکار هێنانی توانای تایبەتی خۆیدا بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشی هیچ چەندوچوون ناکات ، بەشێوەیەك ژنە سادەکانی هێزی جمال‌الدین لەسەر سنووری ئێرانی ـ تورکی والیکردووە کە وا ئەزانن ئەگەر هەر ئاوێك ئەم تفی تێ بکات و بیخۆنەوە ، ئیتر نەخۆشیەکانیان چاك ئەبێتەوەو ئەوانەی منالیان نابێت سکیان پڕ ئەبێت و ئەوانەی تۆراون خۆشەویست ئەبن و ئەگەڕێنەوە لای مێردەکانیان . خۆڵی سەر گۆڕی عبدالقادری گەیلانی لە هەرچی شوێنێکدا هەڵی گرێت و بیهێنێ ئەو منالانە تەمەن درێژ ئەکات کە زۆر ناژین . لەبەر ئەوەو بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشیی لەرزوتا پەتێکی سوور* ئەکەنە مل یاخود قۆڵی منالە نەخۆشەکە .

بەڵام لە ڕووی ئەو زیادە گۆشتانەی سەر پێستەوە کە کاتێك قاچیان بە میزی بۆق تەڕ ئەبێت دروست ئەبن ، چارەسەریان وا ە «بەعشیقە» لە محرابەکەی پاشای ـ میراندا ، کە لەم ڕووەوە پسپۆرە ، ئەمەش بەوە ئەبێت کە پارچەیەك بەلەك لە قوماشەوە بێچن و بیخەنە ناو کانیەکەوە هەتا ئەڕزێت و هەر کاتێکیش ڕزی ئەوا زیادە گۆشتەکانی سەر پێستیش* ئەڕۆن و نامێنن .

سەرەڕای ئەم هەموو ڕێگایانەی کە وەکو جادوو وان ، داوو ەرمانی سروشتی و تاقیکراوەش هەر هەیە کە کاریگەرو ەسپاون . هەموو هۆزێك پزیشکی تایبەتی خۆی هەیە ، [حکیم کرمانجی] بە پشتاوپشت شارەزایە لە بەکارهێنانی ڕووەکی

★ هەر لە کۆنەوە لە کوردەواریدا وا ڕاهاتووە کە ئەم پەتە سەوزبێت .

★ لە کوردەواریدا بەم زیادە گۆشتانە ئەڵێن بالوکەر . وا ئەزانن هەرکەس ناو یاخود میز بکات بە بشیلەدا تووشی ئەبێت .

سروشتی تاقیکـراوەداو بۆ بەدەست هێنانی دەســکەوتی باشیش پشت بە پیرەژنە شارەزاکانی ئەم ئیشە ئەبەسترێت ، لەوانەی کە ئەم داوودەرمانانەیـان بەگەرمی یاخود لەگەڵ پـەڕۆی گەرمدا بەکار هێناوە ٠

لە کوردستانو لە سەدەی هەژدەهەمدا پەیامبەرەکانی یەکەم جار لەم ڕووەوە دەسەڵاتدارو شارەزا بوون ٠

باوکـە (گارزونی) (Garzoni) لـەم ڕووەوە زمانەکەمانی دەوڵەمەند کردووەو بە ( باوکی ڕۆژهەڵاتناسانی کوردەواری ) ناویان بردووە ٠ هەروەها بـاوکە ( کامپانیل ) ( P. campanile . ئەوەی نیشـانداین کە کوردەکان لە داوودەرماندا جۆرەهـا گژو گیایان بەکار هێناوەو ئەڵێ کوردەکان بۆ بەهێز کردنی ددان بە ( galange ) غەرغەرەیان کردووە،کووزەڵەش ڕووەکێکە عارەق زۆر ئەکاو نەخۆشیی سەکتە ئەوەستێنێ ٠ هەروەها حەبی زەعفەرانی یەمەنی «درەختی ئیبراهیم» زۆر کاریـگەرە بۆ کاتی بێنوێژیی کچی گەنج ٠ هەروەها گەڵای گوڵاڵەسوورە چیکڵدانە ئەکاتەوەوسکی ئەوانە پڕ ئەکات کە منداڵیان نابێتو خەوێکی خۆشو بێدەنگ ئەخات لەو کەسانەی کە خەویان لێناکەوێتو ترشەڵۆکی ناوسك لائەباو گەدە ئەکاتەوە بۆ خواردن ٠

(نینوفر) یاخـود (نیلوفر)* تای ناوسك لائەبـات ، بەڵام ڕەگی ( السحلب ) کە ڕووەکێکی وەرزییـە چالاکیو جموجوولی ئاسایی زیاد ئەکات ٠ گژنیژەش (کزبرە)* ڕووەکێکی زۆر کەمەو بۆ نەخۆشیی دڵ باشە ٠ هەروەها ڕووەکی ڕێحانەیی هەمەچەشنەو کوردەکان زۆری بەکار ئەهێنن بۆ بەهێزکردنی گەدە ، کەڵك لە ڕۆنی گەرچەك وەرئەگرن بۆ بۆیاخکردن یاخود لە باتی ڕۆن بۆ

---

★ ئەمە جۆرە گوڵێکە پێیئەڵێن هەنگکوژە یان شلێری ئاوی ٠
★ لە زۆر ناوچەی کوردەواریدا بەم ڕووەکە ئەوترێ رازیانە

ئاوی شەکر یان بۆ ئاوسانی ڕیخۆڵەکان بەکاری ئەهێننو کەڵك لە ( القیصوم ) وەرئەگرن بۆ پاراستنی ماسی لە دەرەوەی ئاوداو لە نزیك ئەو کەسانەوە کە ئاگاداریان ئەکەن • هەندێ جار دۆشاوێکی تێکەڵاو لەگەڵ دۆشاوی ترێی کوڵاودا بەکار ئەهێنن بۆ ڕەوانی ، هەندێ کەمێتر لە جیاتی ئەمە شەربەتی گوژاڵك بەکار ئەهێنن کە زۆر تاڵەو بەکارهێنانی مەترسی زۆری لێ ئەکرێت •

لە دوای ئەمانە هەموویان (Mandragore) یە کە ئەبێ زۆر ئاگاداری بیتو ، واش ناسراوە کە زۆر بەکارە بۆ هێزی شەهوەت (القوة الجنسية) •

لەم داوودەرمانانەشدا هیچی تیا نیە تەنها گۆوگیا پزیشکیەکان نەبێتو لەم ڕووەوە پزیشکێکی فەرەنسی ناوی [دکتۆر مارکیز] بوو لە ساڵی ١٩٤٨دا لە کوردستان بەتایبەتی لە دیاربەکرو ئەرزرومو خاربوت بۆی دەرکەوتووە کە هەندێ ئافرەتی زیرەك پێش دەرکەوتنی کەڵکی پەنسلین ، نانی کەنیویان* بەکار هێناوە بۆ چارەسەرکردنی هەندێ برینو نەخۆشیو زۆر بە باشی کەڵکی ئەمەیان زانیوە • زۆر جاریش پەنا ئەبەنە بەر شتی گەرم ، وەکو ئوتوو ، دەرمانەکە یاخود گەرمەکەی کە گەرم ئەکرێت هەویری زەردێنەی هێلکەو خوێ یاخود کەرەو خوێو هەنگوینەو بە گەرمی ئەخرێتە سەر برینەکە، پلیتەشیان بەکار هێناوە بۆ دەرهێنانی کێم لە هەندێ برین • برینی گوللە بە گیاو بارووتی هاڕاوەی گەرم چاك کردۆتەوەو بۆ دەرهێنانی گوللەکەش گۆشتەکەیان هەڵدڕیوە • خۆ ئەگەر ئێسقانی تیا شکابێت ئەوا چاککردنەوەی وا لە ئەستۆی شارەزایانی ئێسك گرەوەدا (جراح) ، ئەمانە هەمیشە خەریکنو لە

* لە کوردەواریدا بەم دەرمانە ئەڵێن (نیوەنمەك)و تەنها بۆ برین بەکاری ئەهێنن •

ئیشەکەیاندا زۆر شـارەزانو زانیاریی باشیان هەیـە • هەندێ ماسیی بچـووك بچووك بـەکار ئەهێنن لـە باتیی مەرهـەم هەتا ئەگەنێت ، ئەبێ ئەو ئێسکانەی کە زۆر شکاونو بە باشی یەکیان نەگرتۆتەوە تەڕبکرێنو ئەگەر هـەر یەکیان نەگرتەوە ئەتوانن جارێکی‌تر بیگرنـەوە • بـۆ چاككردنـەوەی ئیشی پشت کـە لە ئەسپ کەوتنـە خـوارەوەدا تـووشی ئـەبن ، پێستە بـزنی تازە داماڵراو ئەخەنـە سەر گورچیلەو* وازیلێ‌ئەهێنن هەتـا ئەگەنێ ئیتر چاك ئەبێتەوە •

ئەو پزیشـکانەی حەزیان لـە ئیشەکەیانـە زۆر بەجەرگنو پێشکەوتوون لە ئیشوکارەکانیاندا • باوکە ویگرام Wigram لە [بەرزان] تووشی جادوگەرێکی یەزیدی ئەبێ ، سەیر ئەکات بە کوردێك ئـەڵێ ــ کە چاوی نەخۆشیی تەراخومـای ئەبێت ــ بۆ لابردنی ئەو گۆشتە زیادانەی پشت پێڵووی چاوت ئەبێ هەر کات نا کاتێ شیشی سوورەوەکراوی پیا بهێنیت !!

کوردێکی‌تـریش بـۆ تـاقی کردنـەوەی تفەنـگە تازەکەی گوللەیەکی نابـوو بە نەرمایی ڕانییەوە ، بە چیلکەیـەکی باریك برینی گوللەکەی پڕکردبوو لە کەرەو شیاکە •

مەرهەمی شـیاکەو قیر بۆ چاكبوونەوەی سـووتاندن بەکار ئەهێنن •

لە هەنـدێ ناوچەدا نـەبێ وردە وردە کـوردەکان دەستیان کردووە بە سەردانو هاتووچۆی پزیشکە ڕەسمییەکان یاخود ئەو برین پێچانـەی کە لـە شـارە گـەورەکاندا سـێری تیمارخانەی خستوونەتە ژێر دەست • یان ئەچنە لای شارەزا تایبەتییەکان کە لەم ڕووەوە مەشقیان کردووە• ڕێزی ئەم پزیشکانە زۆر ئەگیرێ.

---

★ مەرج نیە ئـەم پێـستەیە بخرێتە سـەر گورچیلە ، بەلکو ئەخرێتە سـەر شوێنە شکاوەکە •

بەڵام زۆر گوێ نادەن بە قسەکانیان ، بەڵکو کاتێك باوەڕی زیاتر پێ ئەکرێت کە دەرمانی زۆرتریان بداتێ · هەروەها باوەڕیان بە باشیی دەرمانەکانیان نیە ئەگەر تامیان خراپ نەبێت · تەبیعەت‌و ڕەوشتی کورد پزیشکایەتیەکی کاریگەرو تەواوی ئەوێت ، بۆ نموونە ئاشووریەکان سێ کەوچك خوێی ئینگلیزی ئەخۆن ، بەڵام کوردەکان پێنج کەوچك ئەخۆن · هەروەها ئۆقنە کردنیش هەر باوە ، چونکە زۆر زوو کاری خۆی ئەکات · پزیشکی هۆزەکان پارە وەرناگرن هەتا چارەسەرکردنەکەیان سەرنەکەوێت بەڵام لە عێراق لە خەستەخانەکانی میریدا بە شێوەیەکی گشتی چارەسەرکردن بەخۆڕاییە · کوردەکان هیچ کاتێ چاکەی ئەو کەسانەیان لەبیرناچێت کە چارەسەری کردوون‌و دیارییان پێشکەش ئەکەن ·

زۆر لە کوردەکان ـ لە عێراق ، زۆرتر لە تورکیا ـ ئەوانەی کە لە زانکۆکان‌داو وان لە کۆلێجی پزیشکی‌دا ئەخوێنن هەوڵ ئەدەن لە ئیشەکانیاندا شارەزایی پەیدا بکەن بۆ ئەوەی کەڵکی هاووڵاتیەکانی خۆیان بگرن ·

ئەوەی خێزانە شێخەکان کە بوون بە پارێزەر ، کارێکی ڕاستەقینەیان کردۆتە سەر گەلەکەیان ·

### ٣ ـ مردن ڕێگای هەموو کەسە :

بڕوا بە دوعاو نوشتەو پاڕانەوەو کاریگەریی ئەو داوو دەرمانانەی کە بەکاری ئەهێنن هەرچۆن‌بێت پەیڕەو کراوە ، کوردیش وەکو هەموان هەر ئەمرێت · جا لێرەدا لە جیاتی گۆرانی‌و خۆشی ، دەنگ‌و هاواری ماتەمینی‌و دڵگرانیان لێ بەرز ئەبێتەوە ·

لە مردن‌و ماتەمینیشدا کوردەکان خوو ڕەوشتی تایبەتی خۆیان هەیە · کورد لە بەرانبەر مردندا زۆر بەهێزو توانایە ،

ئەزانێت کە چۆن بە ئازاییەوە ڕوو بــە ڕووی مردن ئەبێتەوە ٠ هەروەها لــە پەندەکانیــاندا ئەڵێــن : (ئــەوەی بــاش لــە ژیان گەیشتبێت لــە مردن ناتــرسێت) ، یاخــود ئەڵێن (کاتێــك مردن کوتەکی خــۆیت لێ‌ئەوەشێنێت ، بێ پەشیمانی‌و هەتــا کۆتایی بەرگەی ئــەو کوتەکە بگرە ، چونکە لەویا هیچی تیــا نامێنێتەوە تەنها ئەو کاتــە نەبێت کــە جیات‌ئەکاتــەوە لەوانــەی بەجێیان ئەهێڵیت) ٠

کورد مــردنی مەیدانی شەڕی زۆر زۆر لا خۆشــترە وەك لە مردنی ناو جێگا ، بەتایبەتی ئەگەر نەخۆشییەکەی درێژبوو !

(مردن بابێت بــەڵام پیری نەم)(١٩) ، (مردن ، مردنــە ، لنگە فرتێی بۆ چیە ؟!) ٠

لەناو یەزیدییەکاندا باوە ، کە ئەبێ ئەو کەسەی لە گیان‌دان دایە براکەی یارمەتی بداتو بیگرێت ، بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە ئازاری گیــان دەرچوون ، ئەگــەر گیان‌دەرچوونــەکەی زۆری پێ بچێت ٠

زۆر بــە پەلە مردووشۆر مــردووەکە ئەڕازێنێتــەوە لەسەر پارچە تەختەیەکی* تایبەتی ٠ لەناو یەزیدییەکاندا پیاوێکی پیر یان شێخێك ئەیشۆرێت ٠ لاشــەکە ئەشۆن‌و بە گژوگیای بۆندار ئەیهەنوون ، دوای ئەوە بە کفنێکی قومــاشی لۆکە بەبێ دوورین ئەیپێچنەوە ٠ یەزیدیەکانیش لاشــەکە ئەدروونە کفنەکەوە ، لە کۆندا ئەگــەر مــردووەکە گــەنج بوایــە ، ئەوا لــە ژوورێکدا پەیکەرێکیان بــۆ ئەکرد بۆ ئــەوەی یادگاری مــردووەکە بێت ٠

---

(١٩) پەندێکی کوردی هەیە ئەڵێ (مردن هەبایە ، پیری نەبایە)* ٠

★ لەم ڕووەوە هەلبەستێکی فۆلکلۆریی کوردی هەیە ئەڵێ :

خۆزگە لەم دنیا سێ شت نەبوایە
فەقیریو پیریو مردن نەبوایە

★ لە کوردەواریدا بەم پارچە تەختەیە ئەڵێن تەتەشۆر ٠

ئەمەش داری شینی پێ ئەڵێن و کاتی چوون بۆسەر قەبران ئەخرێتە سەر ئەو بەرزاییەی کە خوالێخۆشبوو خۆشی ویستووە •

هەروەها ئەبێ لە کاتی پرسەکەدا سێ ڕۆژ ئاگر بگرێت • کاروباری ناشتن هەر لەڕۆژی مردنەکەدا ئەکرێت ، ئەمە ئەگەر مردوەکە کوژراو نەبێت ، خۆ ئەگەر کوژراو بوو ئەوا نای نێژن هەتا حەقی کوشتنەکەی نەسەنرێت ، ئەویش بە کوشتنی پیاو کوژەکە ئەسەنرێت* •

لاشەکە ئەخەنە سەر دەستەبەرەیەك لەجیاتی ئەوەی بیخەنە سەر تابوت و ئینجا هاوڕێکانی بە سەرشان هەڵی ئەگرن و ئەی بەن بۆ سەر گۆڕستان ، هەموو خزمو دراوسێکانی لەگەڵیدا ئەچن بۆ سەرقەبران و ئەو ژنانەش کە پەیڕەوی ڕەوشتێکی ڕەسەنی کۆن ئەکەن زۆر بە کوڵەوە هاوار ئەکەن و ئەگرین •

بەڵام ئەگەر مردوەکە پیاوێکی ناوداری گرنگ بێت ئەوا ئەسپەکەی ڕەشپۆش ئەکەن و لەگەڵ جەنازەکەدا ئەی بەن بۆ سەرقەبران •

بەڵام دەربارەی مناڵ ، مناڵە مردوەکە لەبەرماڵێکی نوێژ کردنەوە ئەپێچن و مریشکێك سەرئەبڕن و سەرەکەی لەگەڵ مناڵەکەدا ئەنێژن ، بۆ ئەوەی خێزانەکەی لەناخۆشی تر دور بکەوێتەوە •

لاشەکە ئەخەنە ناو گۆڕەکەوە ، بەمەرجێك لەسەر لای ڕاست بێ و ڕوی لەقیبلەوە بێت ، قوڵی قەبرەکەشی بەقەدەر درێژی پیاوێکە ، مەلاش تەڵقینی ئەخوێنێ و زۆرجاریش شینی بەسەردا ئەکەن ، هەر بۆ نمونە لەم شینەدا ژنێك خوڕەوشتی مردوەکە دەرئەخات •

---

*ئەم ڕەوشتە زۆر کۆنەو ئێستا وا نەماوە ، مردوو کە مرد ، کوژرابێت یان نا ، هەرکاتێ ڕێككەوت ئەینێژن •

کۆمەڵێك بەرد لەشوێنی کوشتنەکەیدا کۆ ئەکەنەوە بۆ پاراستنی یادگاری خوالێخۆشبو ڕێبواریش هەندێ بەردی تری بۆ زیاد ئەکەن ٠

بەشێوەیەکی گشتی گۆڕستانەکانیان وان لەدەرەوەی شارو دێداو وان لەسەر گردێكو باشتریش وایە کە داروودرەختی تیا بنێژن بەتایبەتی درەختی جودی کە مردوەکان لەژێر سێبەرەکەیدا ئەحەوێنەوەو شێوەکەشیان وا لەگۆڕستانەکە ئەکەن کە ترسناك نەبێت ٠ گۆڕستان بەگوێرەی ناوچەو شوێن ئەگۆڕێت ٠ لەسەر گۆڕی دەوڵەمەندەکان گومەزی دائەنێنو شتێکی ئاسایشە لەهەردوو سەری گۆڕەکەدا دوو کێل دائەنێن ، ئیتر ئەمە هەموو ڕازاندنەوەیەکەو بەهیچ جۆرێکیش نوسین نیەو لەگەڵ ئەوەشدا لەناو یەزیدیەکاندا ئەبینین کە بەزمانی عەرەبی لەسەر گۆڕەکانیان ئەنوسنو دەریئەخەن کە فلان کەس لە فلان ڕۆژدا مردووە* ، زۆرجار لەسەر گۆڕەکە وێنەی تیا هەڵئەکەنن ، وەکو خەنجەرو تفەنگو کەرەسەی ئیشکردن ، بازنەو شتی خرخر لە شێوەی ڕۆژدا ، ئەگەر مردووەکە پیاو بوو بەتایبەتی ئەگەر شەڕکەر بووبێ ، ئەوا بۆ ئەوەی ژنان یادی زیندوو بکەنەوە ، وێنەی گوڵو شانەو بازنی تیاهەڵئەکەننو هەندێکیان حەز ئەکەن لەم وێنانەدا پاشماوەی زەردەشتی تیا بەدی بکەن ٠ زۆر جار کوردەکان چاڵی بچووك بچووك ئەکەنە سەر گۆڕەکانو پڕی ئەکەن لە ئاو بۆ ئەوەی چۆلەکەو گیانلەبەرە تینووەکان لێی بخۆنەوە ، بۆ خێرو چاکەی خوالێخۆشبوو !!

---

★ لەم دواییەدا لە هەموو کوردستاندا نوسین بە کوردی لەسەر گۆڕستانەکان بووە بە باو ، هەموو گۆڕێك ناوی مردووەکەو ڕۆژی مردنیو تەمەنەکەیو هۆی مردنەکەی لەسەر ئەنوسن ٠ جارجاریش بەگوێرەی شێوەی مردنەکەی چەند هەڵبەستێکی بۆ ئەنوسن ٠

بەشی زۆری گەشتەوەرەکان زۆرجار بینیویانە ژنی مردوەکە یاخود دەستگیرانەکەی قژی خۆیان بە داری جەنازەکەوە گرێداوە بۆ بارمتەی خۆشەویستیو بەوەفایی بەرانبەر مردوەکەیان •

لەسەر گـۆڕی هەموو پیاوێکی پیرۆزو موبـارەك دەستێکی ئاسنین دائەنێن ، بۆ ئەوەی لای نـەوەی داهاتوو ببێتە نیشانە بۆ دەستی پیرۆزی مردووەکە •

هەندێ بیروباوەڕیان وایە کە شێوەی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ ڕێزگرتنی مردوەکانیان • لەناو کوردەکاندا ــ بەشی کەلوڕ ــ لە هۆزی حەقەکان بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر جۆرە گۆڕستانێکیان لە بەردی هەلکەنراو هە ، کە وێنەیان تیا هەلکەندوون لە وێنەی ژنێك دوو منداڵی هەلگرتووە ، یاخود کوردێك‌و تفەنگەکەی لەلای مەڕو ئاسکەکانیدا• لەناو ، ختیاریەکانیشدا لەسەر گۆڕی هەموو پیاوێکی ئازا پەیکەری شێرێك دائەنێن •

[مادام ساغینیان] لە ساڵی ۱۹۵۲دا گەشتێکی کردووە بەناو ئەرمینیای سۆڤیەتیداو لە گۆڕستانی دێیەکی یەزیدیدا زۆر سەری سوڕماوە کـە (وێنەی ئەسپی بەرزبەرزو گەورە گـەورەی هەمە ڕەنگ‌ی تیا دیوە ! شین ، سوور ، ڕەش‌و سپی ، لە بنکی کێلەکاندا دانراون‌و لـە هەوڵی غارکردنـدان • هەر چوار پەلیـان بەرەو یەکتری نوشـتاوەتەوە لەســەر شـێوەی ژمـارە ( ۸ ) سەریشیان بەرەوخوار بەسەر ملیاندا شۆڕبۆتەوە بۆ سەر سنگیان‌و کلکیان لە شـێوەی کەوانەدا بـەرز بۆتەوە بـۆ سەرەوە ! ئـەم پەیکەرە سەرسووڕهێنەرانـە پڕن لە تونـدو تیژی‌و بەهێـزی)و ئەوەش ئەگەیەنێت کـە ئەمانە گۆڕی کوردن ، بەڵام ئەم ڕەوشـتە کە لە هەندێ دێهاتی‌تردا هەر ماوە ، خەریکە بەرەو نەمان ئەچێت • لە بەرانبەر ئەمانەدا گۆڕی ژنانیان هیچی پێوە نیە تەنها خشتێك یان

چوارگۆشـەیەك نـەبێ لەگـەڵ وێنـەی پێشـکەیەکدا ، ئەمەش (ڕواڵەتێکی خەیاڵاویی جوان) ئـەدات بە گۆڕستانە کۆنەکان ٠

بە شێوەیەکی گشتی ماتەمینیو عازیەتباری ساڵێکی تەواو ئەخایەنێت ، لە ماوەی سێ ڕۆژی یەکەمدا کەسوکاری مردووەکە بە هیچ جۆرێـك لە ماڵ نایەنـە دەرەوە ، بۆ ئـەوەی پێشوازیو بەخێرهاتنی سـەرخۆشیکەران بـکەن ٠ ئەو وشەو قسـانەی لەم کاتانەدا بەکاریـان ئەهێنن نمـوونەیە بـۆ ملکەچ کردنیـان بۆ ویستو فەرمانەکانی خوا ٠ هەر لەو کاتەدا داوای تەمەن درێژی ئەکەن بۆ کەسوکاری مردووەکە کە لەژیاندا ماوون ٠ بۆنموونە : (خۆتان خۆشبن ، خوا دڵت خۆشکـات) ، وەڵامی ئەمانەش (خوا بتانپارێزێت ، خوا تەمەنت درێژکات) ، یاخود (ئێوە خۆشبن) ، ئەگەر مردووەکە کوڕ بوو ئەڵێن (خوا پاداشتان بداتەوە)و چەند وشەو قسەیەکیتر لەم نموونانە ٠

بەڵام لەنـاو کـوردەکانی ئەرمینیـای سۆڤیەتیـدا هەرچی نیشانەی ئـاینی هەیە نەماوەو سەرخۆشیکردنیـان زۆر ساردو وشکە ، وەکو :

(کۆمەڵی کرێکارانی ڕۆژنـامەی (ریاتازە)(٢٠) پرسـەی خۆیـان ڕائەگەیەنن بە فلان کەس کە کرێکارە لەبەشی نوسـین بەبۆنەی مردنی مامیەوە) ٠

یاخود (ز ، ێ ، ف ، پرسەی خۆیان پێشکەش ئەکەن بە م ، ب ، س بە بۆنەی مردنی ك ی باوکیـەوە) ئا ئەمانە ئەو ڕستەی سەرخۆشـیانەن کە ماونەتەوە ٠ سـەرێشم سوڕنامێنێت ئەگـەر سەرخۆشی کردنی دەمی بەزۆری تەنها لاسایی کردنەوە بێت ٠

لەماوەی عازیەتباریدا کەسوکاری مردو هاوبەشی جەژنو

---

(٢٠) ریاتازە : یاخود ڕێگەی تازە ، یەکەم ڕۆژنامەی کوردی سۆڤیەتیە سالی ١٩٣٠ لە یەریڤانی ئەرمەنی لە یەکیەتی سۆڤیەت دەرچوە ٠

ئاهەنگەکان ناکەن ، هەموو ڕەنگێکی سور لەماڵەکەیانــدا دور ئەخەنەوە ٠دراوسێکانیشیان برنج لێ ئەنێن کە بەشێوەیەکی گشتی بەخــواردنێکی چاکی دائــەنێن ٠ خواردنی پرســەش لەڕۆژانی سێیەمو* حەوتەمو هەروەها چوارەمیشدا ئامادە ئەکــرێت ٠ لەم ڕۆژانەدا ئەچنە سەر گۆڕەکانو گۆشت دابەشــ ئەکەن بەســەر ڕێبوارەکاندا ٠ لەیادی ساڵانەی مردودا هەموو خەڵــکی دێکە لە ژەمێك خواردنی تایبەتیدا کۆ ئەبنەوەو هاوبەشی ئەکەن ٠

یەزیدیەکان ، ئێوارەی نەورۆز ئەچنە ســەر گۆڕستان ، بە تەپڵو شمشاڵ لێدانو ژنانیش ئەگرینو لەسەر سنگی خۆیان ئەدەن وە لەسەر هەر گۆڕێك تەختێك خــواردەمەنی بەجێ ئەهێڵن کە لە دوایدا دابەش ئەکرێت بەسەر ڕێبوارو هەژارەکــاندا ٠ ژنانی کورد ئێوارانی پێنجشــەممە یان هەینییان کــردوە بە عادەت کە بچنە سەر گۆڕستان ٠ ئەوانەی تازە مردویان لێ مردوە بۆیان هەیە دڵتەنگی خۆیان بەگریانو لاڵانەوە لەدڵ دەربکەن ٠

چونە سەر قەبران تا ماوەی پێنج ساڵ ئەخایەنێت،دوای ئەوە ئەو گۆڕە لەبیر ئەچێتەوە . بەلام هیچ شتێك ئەوە لەبیر ناباتەوە، ئەگەر گۆڕەکە گۆڕی منــاڵێك بێت لەتەمەنی تازەپێگەیشــتندا مردبێت کە پێی ئەڵێن (تەمەنی گوڵان) ٠

---

★ ئەم خواردەمەنیەی کە لەڕۆژی سێیەمدا ئامادە ئەکرێت ، شتێکی سادەیە وەکو نانوساجی یان شیرینیەو پێی ئەڵێن (سێڕۆژگانە) ٠

# ئاینی کوردەواری

با ئێستا باسێکی ئاینی کوردەواری بکەین ، هەروەکو ئەزانین کوردەکان بەشێکی گرنگی جیهان پێك ئەهێنن (بەلای کەمەوە ۹ تا ۱۰ ملیۆن کەسن) ، بەڵام ئەمانە لەجیهانی ئیسلامدا دیار نین ، چونکە لەگەڵ شیعەی ئێرانو سونی عەرەب لەعێراقو سوریادا تێکەڵاو بوون ٠

ئێستا ئەتوانرێ کە لەرێگا جۆراو جۆرەکانی ئیسلامەتیدا، ئاینی کوردەواری بە شێوە تایبەتیەکانی لەدراوسێکانی جیا بکرێتەوە ٠ هەر ئەمەش بە نەناسراوی ئەیانهێڵێتەوە هەروەها زانراویشە کە لەناو کوردەکانی عێراقو ئێراندا زۆر لە نەسرانیەکان کە زۆریان ئاشورین لەسەدەها دێهاتی ئەوێدا ئەژین، کە بە تەواوی جلوبەرگو خوو رەوشتیان وەکو یەك وایە ٠

ئاشوریەکانیش زمانی نەتەوەیی خۆیان (سوریت)ە بەڵام بەکوردی قسە ئەکەن ، هەروەها هۆزەکانیان لەپێش شەری جیهانی یەکەمدا لەناکۆکیو شەری نێوان هۆزەکانی کوردا هاوبەشیان کردوە ٠

## ١ ـ لەبت پەرستیەوە بۆ ئیسلام : ـ

ئایین لەولاتی میدیەکاندا کە پێی ئەڵێن کوردستان مەجوسیە، نەخشو نیگاری گۆڕی (داریۆس) لەپێستون ـ کە فارسەکان ئەمڕۆ پێی ئەڵێن نەخشونیگاری ڕۆستەم دیارەو وا ئەزانن هێزێك بوە لەسەر خوای گەورەیان (ئاهورا ـ مزدا) یاخود زانای گەورە کە بە هۆی چاکەی ئەوەوە داریۆس توانی سەرکەوێت بەسەر هەموو ئەو نەتەوانەدا کە بەزۆری باسکراون • ئەم خوا گەورەیە بە تەنها نەبووە ، بەڵکو سەرەڕای ئەو خوای تریش هەبوە وەکو ، مترا ، خوای ڕۆژو پەیمانو ڕزگاربوون ، ئەناهیتاو خوای ئاوەکانو خوای بەپیتیو منداڵبوون •

هەموو هێزەکانی سروشتیان ئەپەرست لەڕێگای قوربانی دانی خوێناویەوە ڕێزی خواکانیان ئەگرتو ، بەبێ پارمەتی مەجوس نەیانئەتوانی ئەم قوربانیە بدەن • کۆمەڵە ئایینەکانیان کە لەوانەیە بگەڕێنەوە بۆ بنەڕەتێکی میدی هەندێ دەسەلاتی سیاسی تایبەتی ئاینیان پاراستوە • مەجوسیەکان باوەڕیان بە ەبدەئی چاکەو خراپە [الخیر والشر] هەبووە (ئاهورا ـ مزدا) یاخود (ئورمزدو ئەهریمەن) • لاشەی مردویان پیشان ئەداو خواردنەوەیەکیان ئەخواردەوە کە سەرخۆشی ئەکردن • (haoma) بەشێك لەخواپەرستی ناو ئاینی فارسەکان پێك ئەهێنێت ، بەبۆنەی جەژنەکانیانەوە لەدەرەوەو ناو هەوای پاکدا ئاهەنگ ئەگێڕن • هەندێ پەرستگایان هەیە لەشێوەی برجێکی چوارگۆشەدان ، تەنها ژورێکی بەرزی تیایە کە مەجوسیەکان ئاگرە پیرۆزەکەیانی تیا ئەپارێزن •

ئەم ئاینە سەرلەنوێ لەسەردەمی ئەخمینیەکاندا سەری هەڵداوەتەوە ، بەهۆی ئەو پێغەمبەرەوە کە فەرەنسیەکان پێی

ئەڵێن (زەردەشترا) یاخــود (زورواسترا) ، کوردەکان پێی ئەڵێن (زەردەشت) ئەم پێغەمبەرە لەئێرانی کۆن لە وڵاتی موکــریو لە ساڵی (٥٨٣) پێش زاینی لەدایك بووە، بەگوێرەی قسەی یەکێکیان هەتا ساڵی (٦٦٠) ژیاوە ٠

نەسیحەتەکانی زەردەشت لە (گاتا)داو (Gathas) لەئاڤێستادا کە پەڕاوی پــیرۆزە نووسراونەتەوە ٠ ئەمانە چەنــد نووسینێکی شیعری گۆرانــیو بیروباوەڕی چاکە بڵاوئەکەنــەوە ٠ قوربانیە خوێناوییــەکانو بەکارهێنــانی (Haoma) ئەداتــە لاوە ، بەڵام باوەڕی بە قوربانیی ئاگر هەیە (نیشانەی دادپەروەریو خەبات لە دژی هێــزە خراپەکان) ٠ لەڕاستیدا هەموو کەس بۆی هەیــە کە ڕووناکی یاخود تاریکی هەڵبژێرێت ، لەنێوان چاکەو خراپەدا ، یان لە نێوان [ئاهورامزدا و ئەهریمەن]دا ، هەروەها ئەبێ لەگەڵ گیانلەبەرەکاندا بە بەزەیی بن ٠

«بیرکردنەوەی چاكو قسەی خــۆشو کرداری چاکە ئەو سێ خشتەکیەیە کە لە زانیارییەکانی زەردەشتا هەیە» ٠ بیرو باوەڕی زەردەشتی بووە ئاینی ڕەسمیی فارسەکان لەژێر فەرمانڕەوایی ساسانیەکانــدا (٢٢٤ـ٦٥٢) هەتا ئــەو ڕۆژەی ئــاینی ئیسلام شوێنی خــۆی تیاکردەوە ٠ بەڵام ئەمە بێ ناکــۆکیو پیاهەڵگژان نەبووە ٠ لە ڕاستیدا هەر لە ساڵی (٦٣٧)و لە کاتی داگیرکردنی تکریتو حەلوانــەوە ئیتــر ئیســلام پەیــوەندیی هەبــووە بــە کوردستانەوە ٠ سەعد کوڕی ئەبی وەقاس ڕووی کردۆتە موسڵو ناوچەی کوردەکانی داگیرکردووە لەگەڵ ناوچەی (المرج) یاخود شاری (مەرگە)و ناوچەی(Ba — Nuha — dra) (Ba — Adhra) (Dasen) Hibtun ٠٠٠٠ هتد ٠

بەڵام ئەمداگیرکردنە نەبووە هۆی ئەوەی کە وڵاتەکە هەمووی

ببێت بە ئیسلام • هەروەها هێزەکانی خەلیفە عومەر لەگەڵ کوردەکاندا بەیەکدا هاتن و لە ساڵی ٦٤٣دا کاتێك شارەزووریان داگیرکردو لە ساڵی ٦٤٥دا کە Balardjan (Berud) یان داگیرکرد بووە هۆی خوێنڕژان •

کەوتن و ڕوخاندنی دەوڵەتی ساسانی لە ساڵی (٦٥٢)دا توانەوەی ئاینی میری میرانی (ملك الملوك)و ژێردەستەکانی ئاسان کرد ، مەسەلەی چۆنیەتی شێوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی خزمەتێکی زۆری کرد بۆ ئەوەی ببێتە سووچێکی گۆڕان لە ئاگر پەرستییەوە بۆ ئاینی نوێ •

لە عێراق لە ناوچەی سورداش هەتا ئێستاش پاشماوەکانی پاشای جولندی هەر ماوەو ئەمەش ئەو پاشایە بووە کە وتوویەتی من لەگەڵ شەیتاندا یەکم گرتووە بۆ بەرەنگاری کردنی سوپاکەی خەلیفە عەلی • هەروەها حەجاج لە ساڵی (٧٠٨)داو لە سەردەمی ئەمەویەکاندا هات بۆ ئەوەی سزای ئەو کوردانە بدات کە سوارێکیان ڕووت کردبووەوە ، بەڵام هەر ئەم کوردانە خۆیان دژی ئەو کەسانە وەستان کە لەژێر ڕکێفی مەروانی دووەمدا دەرچوون (٧٤٤ــ٧٥٠) کە دایکی کوردبوو •

بەشێکی زۆری کوردەکان موسوڵمان بوون ، بەڵام زۆریشیان لە جارێك زیاتر لە دژی خەلیفەو سەربازەکانی هەڵئەسان •

لە ساڵی (٨٣٩)دا جەعفەر کوڕی فەهرەجی کە کورد بووە جارێکیتر گەڕاوەتەوە بۆ چیای [داسن] کە یەکەمجار لە (Ba Bayhas) ڕایکردوو تێشکا• هێزەکانی خەلیفە موعتەسەمی بەزاند • وە لە ساڵی (٨٦٦)دا کوردەکانی موسڵ پەیوەندییان کرد بە یاخیبووەکانی (المصوره)وە (musawir) لە ساڵی (٨٩٤)دا هاوکارییان لەگەڵ حەمدان کوڕی حەمدونی عەرەبیدا

کرد ، کە لەوەوپێش موسلی داگیر کردبوو ٠ بەلام لە سالی (٩٠٦)دا محمد کوڕی بیلال ـ کە لە هۆزی حەدبانی کورد بوو ناوچەی نەینەوای وێرانکرد ، لەدوایدا عەبدوللا کوڕی حەمدان هەر وەکو حەمیدیەکانو دانیشتووەکانی داسن شکاندنیو گێڕانیەوە دواوە ٠ هەروەها دیسام کوڕی ئیبراهیم کە تەنیا دایکی کورد بووە ، لە سالی (٩٤٠)داو لە شەڕەکانیدا لە ئازربایجان شەڕی بە کەس نەکردووە بە کوردەکان نەبێت ٠ لەم هەموو ڕووداوانەدا ، ئەوە بەدی ئەکرێت کەوا کوردەکان لە سەرەتای ئیسلام بوونیاندا یاخیبوونیان زۆر لا چاکتر بووە ، تەنانەت هەندێکیان بیروباوەڕی شیعەیان وەرگرتووە ، لەگەل ئەمەشدا ، لەم دواییەدا لە سەدەی دەهەمو پانزەهەمدا هەموویان بە تەواوی موسولمان بوونو هەمووشیان بوون بە سوننی ٠

## ٢ ـ کوردەواریو پێنج پایەکانی ئیسلام :

سەرەڕای ئەوەی کوردەکان موسولمانێکی بیروباوەڕ ڕاستن، [ارثوذکس](٢١)، سەربەقوتابخانەی زانایەتیی‌شافعیشن[٧٦٧ـ٨٢٠] ئەم قوتابخانەیە ڕای تایبەتیو خۆییو حەزی سانەوی خۆیی ئەداتە دواوەو ، چاکە کردنو بەرژەوەندی گشتی بە چاکتر ئەزانێت ، لە پێناوی پشت بەستن بە بڕواهێناندا ، نەك تەنها بۆ زاناکانی شار بەلکو بۆ زانایانی چەرخێك لەو چەرخانەی کە تیایاندا موسولمان بوون ٠ ئەم قوتابخانەیە هەمیشە بە دوای بیروباوەڕی لێكدانەوەی کراوەدا ئەگەڕێت ، بۆ بڕوا کردن بە ڕازی بوونو بڕوا کردنی تەواو ، بۆ ئەمانەش پەنا ئەباتە بەر ئایەتی قورئانو سوننەت ، هەروەها بۆ سەلماندنیشیان پەنا ئەبەنە بەر بەراورد کردن ٠

کوردەکان زۆر بە توندی ئاینی ئیسلامیان گرتووەو گەلێك

---

(٢١) ارثوذکس :ـ بیروباوەڕ ڕاست ، بەلێرا

قوتابخانەیان کردۆتەوە بۆ فێر بوونی قورئان ، ئەوەندە مەلایان هەیە کە ناژمێــررێن ، لەوانــەی کــە زانیــاری لاهــوتو یاساو زانیارییەکانی مێــژوو لێك ئەدەنەوە • لەوانەش وەکــو مەولانا محیّ ئەلدینی ئەخلاتی کە لە سەدەی سیانزەهەمدا هاویەشی دانانی ئاسمان ناسی یەکی کردووە • هەروەها کوڕی سەلاحی شارەزووری (ابن الصلاح الشهرزوری) دانەری جیــاکەرەوەی بەناوبانگ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د•خ) (التصنیف الشهیر عن الحدیث)و بە ڕەسمی قوتابخانەی (الاشرفیه) یاخــود قوتابخانەی پاشماوەی پێشینان لە دیمەشق لە دەوروبەری ساڵی (٦٣٠) یان (١٢٣٠)دا کردۆتەوە •

هەروەها مامۆســتا حاجی خەلیفە (١٦٥٨) ئــەوەی دووپات کردۆتەوە کــە زانیارییەکان هەتا سەردەمی ســلێمانی گەورەش (١٥٢٠ـ١٥٦٦) هــەر لای تورکە عوسمانییەکان بــووە ، دوای ئەوە نووســیویەتیو ئەڵێ (هەتا ئێستاش تەنها لــە کوردستاندا فەلسەفەو زانیاریــە سروشــتییەکان گرنــگیی پێ ئــەدرێت) • نیشانەشمان لەسەر ئەمە ئەوەیە کە زیاتر لە(٢٠٠٠) نووسراویان ماوەتەوە کــە (سوڵتان حســێن) سەرداری بادینــان (١٥٧٦) لە قوتابخانەکەی (قبــان)* لــە عەمادیــە هەڵی گرتــوون ، هەروەها نووسراوەکــانی [عبدالخان] ســەرداری بەتلیس ، کە لــە ساڵی (١٦٥٥)دا بە مەزات فرۆشتیان ، چونکە سەری دانەنەوان بۆ ئەو والی یەی سوڵتان لە (وان) داینابوو •

ئیتر جێــگای سەرسوڕمان نیە ئەگەر کوردســتان توانیبێتی ژمارەیەك زانایــانی ئیسلامو موفتیــە ڕەسمیەکان بنێــرێت بۆ ئەستەموڵو بۆ سوڵتان خۆشی •

---

* ئەم قوتابخانەیە ناوی قوتابخانەی قوبادە نەك قوبان •

هەتا ئێستاش زانکۆی ئیسلامی بەناوبانگ ــ زانکۆی ئەزهەر ــ لە قاهیرە ــ بەشێك لە دەستەی مامۆستایانی هەر کوردن ٠

ئەگەر ئەمانە هەڵبژێرراویان بن ، ئەبێ جەماوەریان چۆن بێت ؟

ژیانی ڕۆژانەی کورد پڕە لە کردەوەی ئیسلامەتی ، پێش ئەوەی دەمی بکاتەوەو فێری قسەکردن ببێت ئەمەی تیا بەدی ئەکرێت ، کاتێك کە داوای ئاشتیو پاڕانەوە ئەکات ، هەمیشە باسی خوا ئەکات ، ئیتر بە عەرەبی (الله)و بە کوردیش (خوا) لەگەڵ هەموو شتێکدا بەکار ئەهێنن ٠ بۆ نموونە ، ئەم دوو نموونەیەی خوارەوە نیشانەی بڕواکردنو گرنگیدانی تەواوە بە بوونی خوا :

(خوا هێلانەی چۆلەکەی کوێر دروست ئەکات) ٠

(خوا خواردنی میوان ئەدات)* ٠

نموونە لەم ڕووەوە زۆرە کە گیانی بیروڕاو ئیمان هێنان بە خوا ئەچەسپێنێ ٠ هیچی تێناچێت تەنها ڕاهاتن نەبێت ، بەڵام کوردەکانی ئەرمینیای سۆڤیەتی بڕوایان بەم وتانەیان نیە ، هەر وەکو لە سروشتی ئەفسانەکانیاندا بەدی ئەکرێن ٠

بۆئەوەی کوردەکان بەئاسانی بتوانن دروشمە ئاینیەکانیانو پێنج پایەکانی ئیسلام بهێننە جێ ، هەندێ لە دانەرە کوردەکان ــ بە زمانی کوردی ــ هەندێ پەڕاوی بچکۆلەیان لەسەر نوێژ داناوە ، بۆ فێربوونی ئاینو وان لە شێوەی سروودی درێژداو بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام ٠ لەوانە نەناسراوێك لە دەورووبەری ساڵی (١٨٧٣)دا ٠ هەروەها شێخ عەبدوڵا کوڕی ئەلنەدا کە لە

---

* لەم ڕووەوە پەندێکی کوردی هەیە ئەڵێ (میوان میوانی خوایە) ٠

سـالی (۱۸۱۰)دا کـۆچی دوایی کـردووە کورتـەیەکی بـیرو باوەڕەکانی ئیسلامی داناوە • هەروەهـا لێکۆڵینەوەی یاساکانی شەریعەت کـە سەردار کامـەران بەدرخان لە سـالی (۱۹۳۸)دا دایناوە، هەروەها سەدەها وتەی پێغەمبەری (د•خ) وەرگێڕراوەتە سەر زمانیکوردیو بەتایبەتی قورئـان کە بەشێکی کەمی نەبێت شتێکی وای لێ بلاو نەکراوەتەوە •

گۆڤاری [کوردسـتان] لە تاران دەربـارەی ڕۆژوو بەرانبەر کردنی ئیسـلام لەگەڵ سروشتی ئادەمیزادا گەلێك بابـەتی بلاو کردۆتەوە •

کورد دوای ئەوەی فێری ئەرکـە ئاینیەکانی سەرشانی بوو هیچی لەسەر نایێت جگە لە بەجێهێنانیان ، ئیتر پێویست ناکات باسی چاك فێربوونو ڕەوان کردنی شایەتمانیان بکەین کە تەنها نیشانەی جیاکەرەوەیە بۆ موسولمانان •

ئەبێ ڕۆژی پێنججار نوێژ بکرێت ، کورد بەش بە حالی خۆی باوەڕی هەیـە بە نوێـژەکەی ، بـە گوێرەی توانـا هەنـدێ لە ژنەکانیشیان هەروان ، ئەگەر شێوەی ژیانی تازە نەبێت بە گیرو گرفت لە ڕێگەیاندا • بەلام کچـە بچووکەکانیان بە هیچ جۆرێك نوێژ ناکەن •

نوێژی نیوەڕۆ لە ڕۆژانی هەینیـدا پلەیەکی تایبەتی هەیە ، کە موسولمانان ئەچن بۆ مزگەوت ، مزگەوتیش لە شارە گرنگەکاندا نەبێت نیە ، بەلام لە دێهاتەکاندا تەنها مزگەوتی بچکۆلە بچکۆلە هەیە • هەروەها چونکە ڕۆژی هەینی پشووی ڕەسمیە ئیتر ئامادە بوونی نوێـژی هەینی ئاسانـە • هەرکەسێك توانـای هەبێت ، پێویستە (زەکات) بـدات ، لەوانەیە ئەمە هۆی ئەوە بێت کـە لە ولاتە ئیسلامیەکاندا ژمارەیەکی زۆر سوالکەر هەبێت* •

★ (زەکات) لە شەریعەتی ئیسلامدا لەسەر هەموو موسولمانێکی دەسـەلات دار دانراوە ، ئیتر پەیوەندی بە زۆرو کەمی سوالکەرەوە نیە •

بەلاَم ڕۆژوو لەمانگی ڕەمەزاندا، تەنانەت ژنانیش ئەیگرن•
لە ماوەی ژیاندا ئەبێ بەلای کەمەوە جارێك سەربدرێت لە مەکەی پیرۆز کە پێی ئەلێن (حەج)* کردن •

ئەگەر ئەوانە ئەو کوردانەبن کە لەسەردەمی سولتان عەبدول حەمیدا (١٨٧٦ــ١٩٠٨)و لە سەر ڕێگای حەجدا سەربازەکانی ڕێگای حەج پەلاماریاندان ، ئەوا ئەو کوردانەی ئەمڕۆ ئەچن بۆ حەج ، تا ڕادەیەك ژمارەیان لە جاران کەمترە ، یاخود بەلای کەمەوە ژمارەی حاجیەکان زیاد ناکەن •

ئەو ژنە کوردانەی کە حەجیان کردووەو چوون بۆ ئەو جێگا پیرۆزە ، ئیتر سەری خۆیان دائەپۆشن ، تەنانەت لە بەردەم مێردەکانیشیاندا •

ئەمانە ئەو ئەرکانەن کە پێنج پایەکانی ئیسلامیان لێ پێك دێت • بەلاَم هێشتا هەر هەندێ پێویستیو ئەرکی‌تر هەن کە موسوڵمانەکان ئەبەستنەوە ، وەکو ئەوەی کە کورد ئەبێ هەمیشە کوڕەکانیان خەتەنە بکەن • هەرچەندە ئاشوورییەکان گۆشتی بەراز ئەخۆن ، بەلاَم بۆ کوردەکان حەرامەو ناخورێت • بەلاَم هەندێکیان لە مەی خواردنەوەدا کەم‌تەرخەمی ناکەن ، وەکو شەراب خواردنەوە ، هەروەها بەتایبەتی عارەق کە پێی ئەلێن ئاوی ژیان ، شەراب لە هەندێ بیروباوەڕی یەزیدییەکاندا ڕێگە دراوە • هەروەها بە گوێرەی بیروباوەڕ زۆر بە گرنگییەوە دەست نوێژ ئەگرن • بە پێکەنینەوە بەو پیاوانە ئەلێن کە بە زۆری پەیوەندییان بە ئافرەتەوە هەیە (حەز لە حەمامکردن ئەکات) ، بەلاَم ژنێك کە لە بێ‌نوێژیدا بێت [حیض] مافی ئەوەی نییە کە

---

★ حەج کردنیش وەکو زەکات دان وایە تەنها لەسەر ئەو کەسانە پێویستە کە دەسەلاَت دارن‌و توانای تایبەتیان هەبەو دەولەمەندن‌و لەئیسلامدا مەرجی تایبەتی بۆ دانراوە •

بچێته شـوێنه پیرۆزەکان ، وەکو مزگەوتو شوێنـەکانی حەجو هەروەها نـابێ دەست بدات لە قورئان ، لەبەر ئـەوە قورئان لە ژووری نووستندا لەناو توورەکەیەکی بچووکدا کە بەتایبەتی بۆ ئەوە دووراوە هەڵئەگیرێت •

ئاهەنگ‌گێران بە بۆنەی جەژنی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە (د • خ) زۆر کۆنە ، کوردەکان دەستیان پێ‌کردوە هەتا گەیشتۆتە سەلاح‌ئەلدین خۆیشی‌و ئەبێ بش‌زانین کەوا (مظفرالدین کولبوری) کە زاوای سەلاحەدین بووە • سورەیایەکی سەرسوڕهێنەری دابویە بۆ ئەوەی کوردەکان فێری ئەوە بکـات کە لەیادکردنەوەو باسـی معجزەکانی محمدا (د • خ) باسی بکەن • گەلێك لەشێخە کۆنەکانو مەلاکان هەڵبەستی ئاینی درێژیان بەزمانی کوردی داناوە کە پێ‌ی ئەڵێن (مەولود) ، لەوانە : ـ مەلایـانی (١٤١٧ ـ ١٤٥٩) وە لە تازەکانیشیان عوسمان ئەفەندی(١٩٠٠)و ئەحمەد رامز(١٩٠٤)و شێخ محمـدی خاڵ (١٩٣٧) وە مەلا محمد رەشـاد مفتی هەولێـر (١٩٥٢) • ئەتوانین بڵێین کە بەرهەمەکانیان ساڵ بەساڵ بەرەو زۆر بوون ئەڕوات بەڵام بەشی زۆریان لەچاپ نەدراون •

وەکو ئەبینرێت زۆرجار شـێوەی ژیانی تازە لەڕێگەی ئـەم دروشم‌و کردەوە ئاینیانەدا ئەبێتە گیروگرفت • ئەو کوردەی کە لەناو کۆمەڵەکەی خۆیـدا نەژی ، یاخود ئەگەر هاتو لەکۆمەڵێکی بێگانەدا ژیا ئـەوا نوێژ ناکاو لەڕەمەزانیشدا بەڕۆژو نـابێت ، ئەگەر بە ڕێ‌کەوتیش پێویستی کرد ئەوا ئەخواتەوە •

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان چاك ئەزانن چۆن موسوڵمانەتی خۆیـان دەرخەن ، بـەڵام ئـەبێ ئەوەشـی بزانیـن کە کـوردە پێش‌کەوتووەکان ، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە وڵاتە بێگـانەکاندا ژیاون دوو دڵن لەباوەڕی ئیسلامەتی‌و خواپەرستی‌و ئەرکەکانی سەرشانیان •

### ٣ ـ سۆفی‌یه‌تی له کوردستاندا : ـ

ئاشکرایـه به‌کارهێنـانی زمـانی عـه‌ره‌بی به شـێوه‌یه‌کی سه‌رزاره‌کی بۆتـه کۆسپێك له ڕێگای نیمچـه خوێنده‌واره‌کاندا به‌جێ‌هێنانی کاروبارو ئه‌رکه ئاینیه‌کانیان هه‌ر به‌ناوه ٠

کورده ئاین‌داره‌کان ئه‌یانه‌وێت ئه‌و شتانه‌ی که له‌کیسیان چوه به‌ده‌ستی بهێننه‌وه ، ئه‌مه نه‌ك له‌ئاهه‌نگه ئیسلامیه ڕه‌سمیه‌کاندا ، که هیچی تێ‌ناگه‌ن ٠ به‌ڵکو ئه‌چن بۆ فێربوونی سۆفی‌یه‌تی لای ئه‌و کۆمه‌ڵانه‌ی که زۆر به‌خێرایی هاتنه کوردستانه‌وه ٠ به‌شی زۆریان دوایان کـه‌وتن‌و په‌یوه‌ندیان پێوه کـردن ، به‌تایبه‌تی له‌چینـه نزمه‌کانی کۆمه‌ڵ ٠

سۆفی‌یه‌تی توانی زۆر به‌خێرایی له‌ناو کورده‌کاندا بڵاو ببێته‌وه٠ وه له‌سه‌ده‌ی دوانزه‌هه‌مـدا زۆر گه‌شه‌ی سـه‌ندوه مێژوو نوسـی مه‌قده‌سی ، که له‌ساڵی (٨٨٠)دا هاتووه بۆ کوردستان (٤٠)سۆفی بینیوه که به‌رماڵیان له‌به‌ردابووه‌و به‌ڕویان خواردوه ٠

ئه‌بو محه‌مه‌د کوڕی شونبوکی چه‌ته‌یه‌کی کـوردی کۆنه‌و له ڕێگه لای‌داوه ، بوه به سه‌رۆکی گیانی‌ی کوردێك له (کالمینی) که ئـه‌ویش [ابـو الـوفا الحلـوانی] بووه ، (١١١٠م) ٠ هـه‌روه‌ها له‌عێراق به ئه‌بو محه‌مه‌دیان ئه‌وت(تاج العارفین)واتا(سه‌رکرده‌ی زانایان) ئه‌مه (٤٠) مریدی کۆکـردبوه‌وه که (١٧)یان سه‌رۆك بوون ٠

زۆر له‌سۆفیه کورده‌کان له‌کوردستاندا دامه‌زراون‌و ، دانه‌ری [وه‌رگێڕی پیاوه ئاینیه‌کان] گه‌لێکیان لێ‌باس ئه‌کات ٠ له‌وانه‌یه ده‌رکه‌وتنی ئه‌م کۆمه‌ڵه سۆفیانه له‌چیاکانی کورده‌واری‌دا ـ بوبێته هۆی دروست بوون‌و پشت گرتنیان له (لاش) له‌چیاکانی هه‌کاری ـ وه هه‌ر ئه‌مه‌بـوو شێخ عدی(٢٢) والی‌کردبوو کـه پێیان نه‌زانێ‌و

(٢٢) یاخود شێخ (نادی) ٠

دەسەلاتیشی نەبێ بەسەر ڕەقیی ڕەگەزی یەزیدییەکاندا ، هەر وەکو لە دواییدا ئەیبینین •

ئەم موسولمانە خەلوەکێشانە تەنها بە قورئان لەبەرکردنو دەرهێنانی زانستی لاهوت لەقورئانداو حەزکردن لە زانستی ئاینو بەجێهێنانی ئەرکەکانی ناو ئاینەکە وازیان نەهێناوە ، بەلکو ویستویانە لەو لێکۆلینەوە ڕوتوقوتە یاخود لەو یاساتەنهایە بچنە دەرەوە بەهیوای ئەوەی بەهۆی سۆفییەتیو خەلوەکێشانو دەستپێوەگرتنەوە بگەنە ئەوپەڕی لوتکەی پێگەیشتنی گیانیی (ڕوحی)و لەدوای ئەوە بگەن بە خواو لەگەلیدا یەك بگرن •

ئەمانە زانستیو تیورە سۆفیەتیەکەیان لەگەلێ هەلبەستدا دەرئەبڕی کە بەشێکی کەمیان نەبێت کەسیان لێی تێناگەن • لە هەلبەستە ڕەمزیەکانیاندا هەمیشە بابەتی خۆشەویستی مرۆڤایەتی تیا ڕەچاو ئەکرێت ، لەوانەی کە لەبابەتەکانیاندا هاوبەشی خوا نیشان ئەدەن لەگەل بانگکردنی بەپەرۆشی شاعیرەکاندا •

بەگوێرەی نیشانەی خواردنەوەش ئەبێ قسەی لێبکرێت وەکو ئەوەی کە پەرداخێك (ئەرجوانی) بێئاگایی لەش دێنێتە سەرخۆ ، لە قوتابخانەکانی سۆفییەتیدا پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابییەکانی بە شێوەیەکی جیاواز لێك ئەدرێتەوە ، کە خۆشەویستیەکی جیاوازە بۆ شێخێکی پیرو مریدەکانی کە بە کوردی شاگرد Shagird یان پێ ئەلێن •

گەلێ شوێن ئامادەکراوە وەکو ژێرزەمین بۆ پیاوێکی ئاینی پیرۆزی کۆنو دەستو پێوەندو دواکەوتەکانی کە لەژێر دەستی ئەوا ئەخوێننو لەگەل ئەودا خزمەتی خوا ئەکەن بۆ ماوەیەك کە جاری وا هەیە درێژەو جاری واش هەیە کورتە •

فێربوونی سەرەتای نهێنیەکانی سۆفی‌یەتی بە لەبەرکردنی کراسێکی تایبەتی دەست پێ ئەکات کە نیشانەیە بۆ یەك‌گرتن‌و هەر لەو کاتەشدا هاوبەش کردنی خزمەت گوزاری‌و خواپەرستی، کە پەیمانەکانی پەرەبەرە بەرز ئەبێتەوە هەتا ئەکاتە محەممەدی پێغەمبەر (د۰خ) ۰

ئاربێری — (Arberry) ئەڵێ :

لە سەدەی دوانزەهەمدا ، شێخەکان لە کۆمەڵێکی گەورەی سۆفییەتیدا یەکیان گرت‌و باوەڕیان هێنا بە یەك سەرۆکی هاوبەش‌و پەیڕەوی یەك یاساو کاروباری ئاینییان ئەکرد ، بەهۆی جێگەدارەوە یاساکە لەنەوەیەکەوە ئەچوو بۆنەوەیەکی‌ترو ئەبوایە بڕواهێنان بەم جێگەدارە لە سەرۆکی لقەکانی‌ترەوە کە لە جێگاکانی‌تردا بوون هەر لە بنەڕەتەوە دانی پیا بنرایە ۰ بەشێکی کەم لەوانەی کە ئەم کارە ئەکەن لە خانووی تایبەتیدا کە بۆ فێر بوونی خوا پەرستی تەرخان کراوە دائەنیشن‌و پێیان ئەڵێن (خانەقا ، یاخود تەکیە)و کاروباری خۆئامادە کردن‌و (جەزبە) لێدانی لە ئاهەنگێکدا کە شێوەو یاسایەکی تایبەتی هەیە تیا ئامادە ئەکەن ۰

هۆی جیاوازیی ئەم‌کۆمەڵانە ئەگەڕێتەوە بۆجۆرە ڕەوشتێکی تایبەتی نەك لە ناخی بیروباوەڕەوە دروست بووبێت ۰

یەکەم کۆمەڵ لەم کۆمەڵانە (قادری)یە کە یەکێك لە کوردەکان دای‌مەزراندووەو ئەویش [عبدالقادری گەیلانی]بووە لە (۱۰۷۸ـ۱۱٦٦)و زۆری نەبردووە کە لەناو کوردەکاندا[1] ڕەگی داکوتاوەو هەتا ئێستاش قادری هەر زۆرن ۰ هەندێ خێزانی ئەم شێخانە خاوەن دەسەڵات‌و بەناوبانگ بوون ، وەکو تاڵەبانی لە کەرکوك‌و برێفکانی لە عەمادیە ، سەرۆکی هەمووشیان لە

بەغدایەو بـە سەروەری ناوداران (نقیب الاشراف) بەنـاو بانگ بووە ٠

کۆمەڵی دووەمیشیان کۆمەڵی نەقشبەندییەو دامەزرێنەرەکەی (بەهادین)ە لـە ناوچـەی بوخاری لـە (١٣١٧ـ١٣٨٩) ، بـڵاو بوونەوەی لە کوردستاندا دوواکەوتوە ٠ بڵاوبوونەوەکەشی بەهۆی مەولانا خالیـدەوە* بـووە ، کـە کوردێـکی هەژارەو لـە هۆزی جافەکانەو لە ساڵی ١٧٧٩دا لە قەرەداخ لەدایك بووە ٠ خەوێکی بینییەو لە ئەنجامی خەوەکەیدا چووە بۆ مەککەی پیرۆزو حەجی کردووە ، هەر لەو خەوەیدا دەروێشـێکی بینییوە کە سووتاندن کاری لێ نەکـردووە ، داوای لێ کـردووە کە بچێت بـۆ دەلهی لە هیندستان٠لەوێ ڕێگای ئاشتیو ئاسایشی دۆزیوەتەوەو پەیوەندی کردووە بـە قوتابخانەکەی شێخ عەبـدوڵاوە(٢٤) زانیارییەکانی کۆمەڵەی نەقشبەندی فێرکردووە ٠ دوای ئەوە لەساڵی (١٨٠٨)دا گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی بۆ سلێمانی ٠ شێخەکانی تر گەلێك ڕێگایان لێ گرتووەو بەرپەرچیان داوەتەوە بەڵام ئەم لەتەواوکردنی ئامۆژگاریو سەرزەنشتەکانیدا هەر سەرکەوتووەو توانیویەتی کە ژمارەیەك لەئەندامانی قادری بهێنێتە سەر ڕێگاکەی خۆی ٠

ئەمـڕۆ شـێخەکانی نەقشبەندی زۆر تـرو دەسـەڵاتیان لە شێخەکانی قادری زیاترەو ئەتوانین بڵێین لەهەموویان دەسەڵات دارتر شێخەکانی (شمس‌الدین)و نەهـریو بەرزانو شـێخەکانی تەوێڵەن ٠

---

(٢٣) ئەمە مەولانا خالیدی شارەزوریە ، کە سۆفیەکی کوردی بەناوبانگە،دیوانێکی هەیە لەساڵی ١٨٤٨دا لە ئەستانە بەزمانی فارسیو کوردی لەچاپ دراوە ٠

(٢٤) ئەمە شێخی بەناوبانگ شێخ عەبدوڵای دەهلوی هندیە ٠

بەربەرەکانێی نێوان ئـەم دوو کۆمەڵە هەمیشـە لەشێوەی ڕواڵەتو قسەدا نامێنێتەوە ـ بەڵکو هەندێ جار وا قوڵ ئەبێتەوە کە ئەگاتە شەڕی گەورە ٠

کۆمەڵی تیجانیش کۆمەڵێکی تازەیەو لەساڵەکانی (١٧٣٧ ـ ١٨١٥)دا لەسـەردەستی ئەحمەد تیجـانی لەئەفریقـای باکـور دامـەزراوە ٠ ئەمانە پەیامبەریان نەبـووە ، ژمارەیەکی کەم لە کوردەکانی ئەنازۆڵ نەبێت ٠ ئەمیش هەروەکو کۆمەڵەکانی تر لە تورکیا ، لە بەیەکداهـاتن‌دا لەگەڵ بیروبـاوەڕە بێدینیەکـەی ئەتاتورکدا گەلێ نارەحەتی چێشتوە ٠

دەسەڵاتی شـێخەکان لەناو کوردەکان‌دا کەم بـۆتەوەو هیچ دەسەڵاتێکی داراییان نەماوەو بەڵام هەندێ جار بڕوای مریدەکان بە شێخەکانیان ئەگاتە سنوری پەرستن ٠ (ئادمۆندز)ئەوەی ڕەچاو کردوە کە هەندێ‌لەئەندامەکانی کۆمەڵی نەقشبەندی لەکوردستان‌دا حەز لەهەندێ ڕەفتاری نەشاز ئەکەن ، ئەمەیان بەهۆی نەبوونی دەسەڵاتی باڵاوە لەناوچەکانی دەوروبەریان‌دا بوە یاخود بەهەڵە فێرکراون‌و تێگەیەنراون ٠

هەرچۆن بێت ، ئەشـبێت هەندێ لەو شێخانەی کـە نیەتیان خراپە ، یاری بە سادەیی ئەوانە بکەن کە دوایان کەوتوون‌و بۆ سوودی تایبەتی خۆیان بەکاریان بهێنن ٠ ئەگەر جارجار توانیمان هەندێ جوولانەوەی تعصبی لە ناو کوردەکاندا دەربخەین ، ئەوە بزانە کە شێخەکان خۆیان لەسەر ئەوە هانیان ئەدەن ، وەکو بانگ کردن بۆ شەڕی پیرۆز [جهاد] لە ناوچـەی ئۆرمیە لە کاتی شەڕی جیهانیی یەکەمدا ، هەروەها زۆر باش هەست ئەکرێت کە بەشی زۆری جوولانەوە یاخی بووەکانی ئەم دواییە چ لە تورکیاو چ لە

عێراق ، شێخەکان هەڵیان گیرساندوون ، وەکو شێخ سەعیدی پیران‌و شێخ مەحموود لە سلێمانی‌و شێخ ئەحمەدی بەرزانی •
بەڵام لێرەدا تەنها ئایین لەناودا نەبووە بەڵکو سوودی سیاسیش بەشی گەورەی بووە تیایاندا •

وا دەرئەکەوێت بیروباوەڕی سۆفی‌یەتی بنەڕەت‌و نرخی نەماوە لە نووسەرە سۆفیە کلاسیکییەکان : شێخ محەممەد ئەمین کوردی نەقشبەندیە، خەڵکی هەولێرەو ساڵی ١٩٠٤ کۆچی دوایی‌کردووە، لە پەڕاوەکەیدا «ڕووناککەرەوەی دڵان ـ تنویر القلوب» چاپی شەشەم ساڵی ١٩٢٩ ، قاهیرە ، بە تەواوی بڕوای بە سۆفی‌یەتی نەماوە • ئەمەش لە خوێندنەوەی ئەو باسەدایە دەربارەی ئەو ڕێگایەی کە لەسەری ئەڕۆن لە بەجێ‌هێنانی زکری سەر دڵدا •

ئا لێرەدا ئاربارى (Arberry) دەقەکەی کورت‌کردۆتەوەو ئەڵێ :

سۆفی‌یەتی دەسەڵاتی نەماوە لە دڵ‌و بیرو هۆشدا بەتایبەتی لای نیمچە خوێندەوارەکان • هۆی ئەم نەمانەش لەناو باسای ژیری‌و تیوری بڕوا پێ‌کراودایە ، هەروەها لە دەرچوونی فەرمانی سەرسووڕهێنەری ناو ڕۆشنبیرە تازە پیاکەوتووەکانەوە ، کە وا ئەزانن پەیامبەری چاکەکەرانی ئایینی‌و کۆمەڵایەتین، زۆرجاریش دەوری ڕۆژانەی ئەمانە بە شێوەیەکی وا کۆتایی دێت کە بەزەییان پیا بێتەوە •

بۆ نموونەش باسی بیروباوەڕی [حەقە] ئەکەین لە ناو شێخەکانی (تۆبزاواو سەرگەڵو)دا لە عێراق کە بە شێوەی هەڵە تاوانبار کراون بە بیروباوەڕی ڕووت‌و قووتی‌و بۆگەن کردنی ڕەوشت (فساد الآداب) •

## ٤ ـ کوردەواریو هەڵهاتن لە ئیسلام :

هەندێ یاخیبوونو لادان لە بیروڕای سۆفی‌یەتی بوون بە بنەڕەتی یاخیبوونی هەندێ بیروڕای‌تر لە ئاینی ئیسلام ، هەر لەو تێڕوانینەوە ئەتوانرێ دوودڵیی تیا بکرێت دەربارەی شێوەی ڕاستەقینەو پەیوەندیی ڕاستیان لەو بیروڕایانەدا کە زۆرتر جیاوازیی هەیێتو ئەمەش لە بنەڕەتدا بیروڕای یەزیدییەکانە کە پێیان ئەڵێن (شەیتان پەرست)و بە تایبەتی ئەوانەی کە بەشی زۆریان کوردنو ئەمڕۆ ژمارەیان ئەگاتە نزیکەی (٥٠٠٠٠) هەزار کەسو لە عێراق لە دۆڵی شێخانو چیاکانی سنجاردا ئەژینو هەروەها لە سوریاش لە هەندێ دێهاتی جەزیرەو نزیکەی بیست دێیەکی‌تر لە چیای سەمماندا هەرهەن ٠ هەروەها هەندێ لە کوردەکانی ناوچەی پەریشانو تەفلیس لە یەکیەتی سۆڤیەت هەر لە ڕەگەزو تیرەی یەزیدیەکانن ٠ چونکە بیروباوەڕەکەیان نهێنیە هەموو جۆرە قسەو باسێکیان بۆ هەڵبەستراوە ، وەکو : ڕۆژپەرستی ، دوولانەیی زەردەشتی ، بت‌پەرستی کوردەواری ، لقێك لە بیروباوەڕی گاورەکان میسرائیەش با بوەستێت بە دەوروبەریدا ٠

لە ڕاستیشدا خۆی یەزیدیەکان لە ئیسلامەتی چوونەتە دەرەوە ٠ بۆ سەلماندنی ئەمەش پێش ئەوەی بچینە ناو بیروڕا ئاینیەکانیانەوە ، تەنها بیرکردنەوەو وردبونەوە لە ڕەوشتو ڕواڵەتی یەزیدیەکان بەسە٠چونکە دەوروبەرو شێوەی ئیسلامەتی لە باسکردنی ناوەکانو مێژوودا دەرئەکەوێت ، لەوانە وێنە کێشانی ئادەمیزادو خەتەنە نەکردن ٠٠٠ هتد ٠ سەرباری ئەمانە سەربڕینی گیانلەبەر بۆ قوربانیو شێخو قەشە پەرستن لەگەڵ وێنەی حەجکردندا بۆ مەککەی پیرۆز کە لای گۆڕەکەی شێخ عودەی هەڵوامراوە،بەڵام کرداری ئیسلامی حاجیەکانو نوسینی

عەرەبی سەرسوورهێنەریش لەناو کوردەکاندا هەر هەیە ٠

دەوروبەر هەمووی هەر سۆفی یە ، شێخە پیرۆزەکانیان سۆفی ناسراوون پلەی ئاینیان سۆفی یەتیە ، نوێژو پەیڕەوە بنچینەییە ئاینی یەکانی تریش پەیوەندییەکی بەهێزیان هەیە لەگەڵ ناوەرۆکو بیرو هۆشە شاراوەکانی سۆفی یەتیدا ٠

لەیەکچوونی سۆفیەکان [المتشین] لە ئیسلامدا لە تێڕوانینی تێپەڕبووندا دەربارەی بنەڕەتی جیهانو ئادەمیزادو خۆیان دەرئەخەنو هەروەها گیان پیاداهاتنەوە [تناسخ الارواح]و بڕوا کردنی تەواو بە شەیتان ٠

سەرەڕای ئەمە لەوەی کە ناوەکەیان وەکو شەیتان پەرست نەبێت ، ئەوا دەرهێنانی ئەو بەردی بناغەیەی کە لە ئیسلامو بیروڕاکانیدا هەیە بەسە بۆ ئەوەی بیروباوەڕی یەزیدیەکان بە تەواوی بدۆزرێتەوە ٠

بەڵام ئەم یەزیدیانە چۆن گەیشتنە ئەم سەر لێشێوانو تاریکاییە لەوەوە کە بە پیاوێکی پیرۆزو موسولمانێکی ڕاستەقینەی وەکو شێخ عودەی ( ١٠٧٣ـ١١٦٢ ) دەستیان پێ کردبێت ٠

ئەم گۆڕانەش بەرە بەرە ڕوویداوە ، هەر لەوەوە دەستی پێ کردووە کە [شمس‌الدین حسام ١٩٧٧ـ١٢٤٦] لە ئایندا ڕێگایەکی لابەلایی لە خوا پەرستندا کردەوە ٠ ئینجا دوای ئەوە پەیامبەرەکانی بوون بە دوو بەشەوە : بەشی یەکەمیان چوون بۆ سوریەو میسر (Qarafa) ، لەوێ ماوەیەکی دووروودرێژ بە باوەڕێکی بەهێزەوە لەژێر ناوی (عدویە)دا جێگیر بوون ٠ بەڵام بەشی دووەمیان لەوڵاتی(نێوان دوو ڕووبار) (بین النهرین) لە ڕۆژهەڵاتی دیجلەدا مایەوە٠ هەتا ڕادەیەکیش پەیوەندیی ژێر بە ژێری لەگەڵ لایەنگرەکانی محمدا (د٠خ) نەبڕی‌بوو٠ بەڵکو لەڕووی

بیروباوەڕەکەوە خۆی دوورخسبووەوە بۆ ئەوەی بە تەواوی ببێتە دوژمنی •

قەسابخانەکانی سەدەی حەڤدەهەم ، کەلکیان نەبوو ، بەڵکو یەزیدییەکانی سوور ئەکرد لەسەر بەجێهێنانی بیروڕاکانیان بە شێوەیەك کە زیاتر سەرسووڕهێنەرو نهێنی بن ، تەنانەت ئیتر یەزیدییەکان بە ئیسلامەتی نەمانەوە ، بەڵام ناشبێت کە بڵێی لە بنەڕەتدا هەر ئیسلام نەبوون • ئەگەر ئاینی یەزیدییەکان لە سۆفیيە سوننیەکانەوە کە دەوریان لە خەلیفە یەزیدی یەکەم(٦٨٠ ـ ٦٨٣) دا بوو دروست بووبێ ، ئەوا ئیتر بیروباوەڕێکی کوردیترە کە لایەنگرەکانی ئاینی حەقەن ، لە بیروباوەڕی شیعەیدا هاندراونو گەیشتوونەتە ئەوپەڕی پلەی گەشەکردن •

ئەم بیروباوەڕە لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمدا لە کوردستان دامەزراوەو گەیشتۆتە ناوچەی شارەزوورو هەورامان، ئەمەش بەهۆی (مبارەك شابابا خۆشێن)ەوە بووە کە ژنێکی خستۆتە پاڵ ئەو حەوت کەسەی کە پەیڕەویان کردووەو ئەمیش (فاتیمەی هەیفام) بووە ، فاتیمەی بەناوبانگ بووە کە خوشکی شاعیری ناسراو [بابا تاهیری هەمەدانی] بووە (٩٣٥ـ١٠١٠) سوڵتان ئیسحاق یاخود (سوهاك) کوڕی (شێخ عزی بەرزنجی)و (دایراك خانم) کچی میر محمدی سەرۆکی جاف ئەم بیرو باوەڕەیان ڕاست کردەوە • ئەم سوڵتان ئیسحاقە لە ساڵی ١٣٢٦دا نیاز خانەیەکی لەهەورامان کردەوەو پێیان ئەوت جێگای قوربانیدانو بەشە گشتیەکەشی لە (پردی وار) دانابوو • ئەمانە سێ کۆمەڵ بوونو هەر یەکەیان حەوت کەس بوون • حەوت کەسی یەکەم ئەمرەکان بوون ، حەوت کەسی دووەمیش بێگوناهەکان بوون ـ ئەمانە منداڵەکانی سوڵتان ئیسحاق خۆیبوون • حەوتکەسی

سێیەمیشیان جێگیربوون ، ئەمانەش لە ۷۲ کەسی پیر هەڵئەبژێران بۆ ئەوەی بکرێنە پاسەوان یاخود ڕێنیشاندەر ٠

شێخەکانی ئێستای [کاکەیی] لەعێراق لەزنجیرەی ئەم خێزانە پیرۆزانەن ٠ حەقەکان ڕێزێکی زۆر لە عەلی ئەگرن بە شێوەیەك بەرزی ئەکەنەوە بۆ ڕیزی خواو ، منداڵەکانیشی بۆ ڕیزی پێشەواکان ٠ بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پەیوەندییان لەگەڵ سونیەکاندا هەر باشەو ئەیپارێزن ٠

هەروەها ڕێزی گەورەش لە (بابا یادگار ۱۵۹٦) ئەگرن کە هەتا ئێستاش گۆڕەکەی قیبلەی حاجیەکانە ٠

ئەمانە هاواریش ئەبەن بۆ(موساو عیسا)و بەتایبەتی (داود)٠ لە ژمارە (۷)دا بڕوایان بە ڕواڵەتی پشتاوپشتی خوایەتی هەیەو هەموو جارێ خوایەتی لە قاڵبەیەکی چوار پێنج فریشتەییدا دەرئەکەوێت ٠

هەروەها هۆزەکانی پشتکۆش لە لوڕستان هەر ئەم بڕوایان بە (گیان‌پیادا هاتنەوە) هەیە ٠ ئەم بیروباوەڕە دێهاتەکانی سەر ڕێگای نێوان خانەقین‌و کرماشانی گرتۆتەوە ، هەروەها هۆزەکانی پشتکۆش لە لوڕستان هەر ئەم ئاینەیان هەیە ، بەتایبەتی (دلفان) ، لە کاتی هاتووچۆ لە زستان‌و لە جەژنی گەورەداو سەرخۆشی کردن‌و حاڵ لێ‌هاتنی ئاینیدا ئەچوون بەسەر ئاگرداو ئازاریان نەئەگەیشت ٠

ئادمۆندز ئەڵێ :

کاکەییەکانی عێراق لە دوانزە دێی ناحیەی داقوق لە پارێزگای کەرکوك‌و لە بیست دێی خانەقین‌و قەسری شیرین‌دا دائەنیشن ٠

بە شێوەیەکی گشتی یەزیدییەکان لە ناوچەکانی عێراقدا

ئەژین ، بەلام حەقە کوردەکان لەســەر سنووری عێراق‌و ئێراندا ئەژین ٠

سەرسوورەکان کــە پێیان ئەلێــن (قزلباش) ئاینێــکی‌تریان هەیەو بە شێوەیەکی گشتی وان لەئەنازۆل لەناوچەکانی سیواس‌و دیاربەکرو خەربووت ، ئەمانە بە شێوە زمانی زازا قسە ئەکەن‌و چیای دەرسیمیشیان هەیــە کە بۆتە شورایەکی ســروشتی بۆیان‌و سەرۆکە گیانیە گەورەکەیانی تیا ئەژی‌و ژمارەیان بەلای کەمەوە ئەگاتە یەك ملیۆن کەس ٠

هەروەها تورکەکان هەر لەژێر ئەو ناوەدا هەندێ بێ‌ئاینیی تریان خستە پالیــان وەکو (Nosairis) یاخــود یەزیدی کــە هیچ سوودێکیان نیە لەگەلیاندا ٠

ئەم ســەرسوورانە خۆیان ناونــاوە (عەلەوی) ، مانای (عەلی پەرست) ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەمانە لە شیعەییدا یەکجار قوول‌بوونەتەوە ٠

هەروەها ئەمانــە هۆی پەیوەنــدیی خواو ئادەمیــزاد بە پێنج فریشتەو دوانزە وەزیری خواو چل پێغەمبەر دائەنێن کە سەلامی نامراوی حەقەکانیشی تیابێت ٠

سەرۆکە ئاینییەکان ڕۆشنبیر کردن‌و باج کۆکردنەوە ئەگرنە دەستی خۆیان‌و ئەمانەش (داد) یاخود (سید)یان پێ‌ئەلێن‌و هەموو سالێك جارێ ڕێ‌نیشاندەرەکان سەریان لێ‌ئەدەن ، بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئاهەنگە ئاینییەکان‌و ڕوون کردنەوەی بیروڕاکانیان کە لە یەکگرتنی ئاینی ئەکات ٠ مزگەوتیان نیە ، دوانزە ڕۆژ تەرخان ئەکەن بۆ ڕۆژوو گرتن‌و بۆ ڕازی بوونی دوانزە پێشەوا (امام)و ســێ ڕۆژیش لەپێش جەژنی حــەزەردا ٠ ئاینەکەیان ڕۆژی یەك جار نوێژی لەسەر داناون‌و هەروەها لە هەلهاتن‌و ئاوابووندا ڕۆژ ئەپەرستن ٠ ئاگریان لا پیرۆزەو قوربانیش ئەکەن بۆ سەرچاوەی

ڕوبارەکان • هیچ پەڕاوێکی پیرۆزیان نیە کە تایبەتی بێت بە خۆیانەوە ، بەلام ڕێزی گەورەیی تەواو لە تەوراتو ئینجیلو قورئان ئەگرن • گەشتەوەرەکانیش هیچ زانیارییەکی تەواویان نیە لەم سەرسوورانەو جاری واش هەیە هەر دیارنین ، چونکە لەوانەیە پەیامبەری ئاینە جۆراوجۆرەکانی تریش لەناو ئەمانەدا هەبێت • هەروەها چەند کردارێکی ئاینی گاورەکانیان لە ناودا بینراوە • لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ بەکتاشیەکاندا لە گەلێ خاڵدا یەك ئەگرنەوە • ئەمەش تەنها ئەو کۆمەڵە دەروێشەیە کە لە تورکیا خەریکی خوێندنو لێکۆڵینەوەی ئاینی شیعەین • بە شێوەیەکی تایبەتی ئەمانە لەناو خۆیاندا ئەچنە سەر شوێنەوارەکانی حەج •

هەروەها لەپاڵ ئەم بیروباوەڕانەدا کە گرنگیەکی تایبەتیو تا ڕادەیەك ناوبانگیان هەیە ، هەندێ کۆمەڵی لادەری بچووك بچووکی‌تر لەناو کوردەکاندا هەیە کە تا ڕادەیەك جیاوازیان لە گەڵ ئەماندا هەیەو کردارو هەندێ شتی تری هاوبەشیان هەیەو بەزۆری بەلای شیعەکاندا دائەتاشن ، وا ئێمەش ئەمانەیان لێ باس ئەکەین •

لەدەوروپشتی موصل کۆمەڵێك هەن (شاباك)* یان پێ ئەڵێنو ژمارەیان نزیکەی (١٠٠٠٠)کەس ئەبێتو ئەمانە هەوڵی یەك گرتنی یەزیدیەکانو شیعەکان ئەدەن •

---

★ لە کوردستانی عێراق بەم کۆمەلە ئەڵێن (شەبەك) •

دوای ئـەوە (سارلی) لەســەر ڕۆخی زابداو پەیوەندیان بە کاکەیی‌و بارجورانیەکانەوە هەیەو هەر لەناوچەی سنوری ئێرانیدا دانەنیشن ، هەروەها پێشیان ئەوترێت ڕۆژپەرست ، چونکە ڕۆژ ئەپەرستن‌و لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا لەماردین دەرکەوتوون‌و ئێستاش وا دەرئەکەوێت کە بە تەواوی نەماوون‌و بەڕواڵەت بوون بەگاوری یەعقوبی ٠



# بەشی نۆیەم

## ئەفسانەو شتی پڕوپوچی ناو ئەشابینی
## کوردەواری

# ئەفسانەو شتی پڕوپوچی ناو ئاینی کوردەواری

لەبەشەکانی پێشودا زۆر جار باسی منداڵبوونو ژنهێنانو جەژنەکانمان کرد ، وتمان ئەمانە خووڕەوشتێکن هیچ پەیوەندییەکیان بە ئایینەوە نیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەر زۆر بە وردی پارێزگارییان ئەکەن، هەروەکو ئەوەی کە بەڕاستی پیرۆزبنو ئەگەر هاتو ئەو بیروباوەڕو ئایینانەی کە باسمان کردن نەمانو لەپەیڕەوی ئیسلام چونە دەرەوە ئەوە لەبەر ئەوەیە کە سەربەستی تەواو نەدراوە بە پەیامبەرەکانیان بەتایبەتی لە بەجێهێنانی کردارە تایبەتیەکانیاندا کە جادوگەری ئەستێرەناسیو نوشتەکردنیان پێ ئەڵێن .

کورد ئایینداد نیە ، بەڵام ژمارەیەکی کەم لەگەڕۆکەکان لە سەر ئەوە ڕێکەوتون کە بڵێن گوایا کوردەکان بیروباوەڕی پڕوپوچیان هەیە ، ئەمەش هەر زۆر زوو لەبیروباوەڕی پڕوپوچو بەکارهێنانی گەلێك نوشتەو شتی دروی تردا دەرئەکەوێت ،

هەروەها لەجۆرەها جادوگەری‌و تافی‌کردنەوەی سەرسورهێنەردا دیارن‌و هەندێ کەسیش ڕایان وایە کە گەلێ لەپاشماوەکانی بت پەرستی لەو شتانەدا پەدی ئەکرێن •

### ١ - بیروباوەڕی پڕوپوچ : -

شاعیریەت بەسەر ڕەوشتی کوردا زاڵ‌بوەو ، هەموو سروشتێکی جوانی دەوروپشتی خۆی خۆش‌ئەوێت ، چونکە هەمووی دەست کردەکانی خوای گەورەیە • فریشتەکان بەزۆری وان لەسەر کانیەکانی ناو چیاکان‌دا • ئاشوری‌و کوردو یەزیدیەکانیش بڕوایان بە جنۆکە* هەیە ، لای‌ئەمان جنۆکەی خێرو جنۆکەی شەڕ هەیەو هەریەکەیان ئاینی تایبەتی خۆیان هەیە ، جنۆکەی خێر جار جار کلاوێکی سور* لەسەر ئەکات بۆ ئەوەی نەیبینرێت‌و لەدۆڵە قولەکانیشدا ئەگەڕێت • بەڵام جنۆکەی شەڕ لەچاڵ‌و کونە بەردو بن ئەشکەوتدا خۆی ئەشارێتەوە • هەندێ‌کەسی ئازاو بە غیرەت بەنیازی شارەزابون پاڵیان بە خۆیانەوە ناوەو هەوڵیان داوەو چونەتە ناو ئەو جۆرە ئەشکەوتانەوە، بەڵام بەشێتی هاتونەتە دەرەوە ، کە لەپێش چونە ژورەوەشیان‌دا ئەمەیان لێ‌چاوەڕوان کراوە •

جنۆکە حەز ئەکات لەناو دەرگای ماڵ‌دا بێت ، لەبەرئەوە ئەبێ ئاوی گەرم بکەی بەو شوێنەدا بۆ ئەوەی ئازاریان بدەیت‌و خۆت بپارێزێت • هەرچەندە جنۆکە خۆی لەئاگر دروست کراوە ، بەڵام بۆ ئەوەی بژی هەروەکو خەڵکانی تر ئەبێ خواردن بخوات •

---

★ بەم کلاوە ئەڵێن (کلاوی سەخری جن)و بڕوایان وایە هەرکەس ئەم کلاوە لەسەر کات ئیتر نابینرێت •

★ کورد وا ڕاهاتووە ، ئەگەر ناوی جنۆکە بهێنێ ئەڵێ [خێو] یاخود لە ترسانا هەر ناوی ناهێنێ بەڵکو ئەڵێ [ئەوان] ، هەروەها لەزۆر شوێن‌دا هەر لەگەڵ ناویان هێنان ئیتر [بسم‌الله] ئەکەن ، چونکە ڕایان وایە کە جنۆکە لە [بسم‌الله] ڕائەکات •

شێخێکی یەزیدی لەسنجار جنۆکەیەکی ڕاهێناوەو بەهەوەسی خۆی لەهەموو جێگایەدا لەگەڵیا بووە ، شێخێکی ئاسوریش جنۆکەیەکی تری والێ‌کردوە بە جۆرێك کە لەدوایدا لەئیشــوکاری ناوماڵدا یارمەتی ژنەکەی داوە •

هەر لەم جۆرانە شتی سەرسوڕهێنەری تریان هەیە ،هەندێکیان وا بڕیاریان داوە کە لەفریشتەو پەریەکــان ژن بهێنن‌و مێژوش سەلماندویەتی کە (ئەمیر محەمەد) ســەرداری بۆتان کە لەســاڵی (١٧٥٠)دا کۆچی دوایی‌ی کردوە ، فریشــتەیەکی هێناوەو گەلێ منالی لێ‌بووەو دوای ئەوە هەر ئەم ڕوداوە لەهەژارێکی یەزیدیش لەسنجار ڕوودەدات بەڵام لەمەیاندا مەسەلەکە پێچەوانە دەر ئەچێت وە هەژارەکە شــێت ئەبێت • هەرچۆن بێت هەنــدێ لەشــێخەکان دەسەڵاتی باشیان هەیە بەســەر جنۆکەداو لەدەسەڵاتەکەشــیاندا بەناوبانگن‌و خەڵکیش ئەچن بۆ لای ئەم شێخانە بۆ ئەوەی لەگیانە پیسەکان دوریان بخەنەوەو دۆعاو نوشتەیان بۆ بکەن •

باوەڕیشیان بە تارمای‌و شەوە لەشەودا شتێکی بــاوە بەشی زۆری ئەو کەسانەی لەم ڕووەوە ڕایان ڕەق‌و وشــکە تێك‌چوون • هەروەها خەو بینینیش دەسەڵاتێکی تەواوی هەیە لە خەیاڵیانداو زۆریان ڕوناکی ڕێگای دوا ڕۆژیان لەخەوەکانیاندا بەدی ئەکەن • هەندێکی تریش وەکو شێخ گامۆی یەزیدی لەخەودا بەدی ئەکەن (کوچك یەزیــدی) کەســاتێکن کە لە لێك‌دانــەوەی بیروهۆشــ‌و ماناکانی‌دا پسپۆرن‌و ئاسایشە کە ئەم کارە دەسەڵاتێکی گەورەیان ئەداتێ بەتایبەتی لەناو کۆمەڵە سادەکاندا • هەروەها گیانداری پیرۆزیشیان هەیەو ئینکاری ناکرێت•هەندێکیان سەرسوڕهێنەرن وە خۆشیان ئەوێن وەکو کەڵەشێر کە ڕۆژ ئەکاتەوەو بەختیاری بۆ بوك‌و زاوای تازە ئەهێنێت ، یاخود تاووســ کە یەزیدیەکان بــە نیشانەی فریشتەی ڕونــاکی دائەنێن ، بە پێچەوانەوە ڕقیان لــە

هەندێکی تریانە ، وەکو مار کە لەزۆر سەرگورشتەو چیرۆکی کوردیدا باسی کراوە • لەم ڕووەشەوە بەختیان باشە کە هەندێ شێخی مارگریان هەیەو بەتایبەتی لەناو یەزیدیەکاندا بەدی ئەکرێن‌و هەشیانە کە مار ئەخوات‌و شێخەکانی سەر بەخێزانی شێخ مەند مار ئەگرن‌و بەخێوی ئەکەن ، هەندێکی تریش لەخێزانی هومەرمەندان ( ئۆمەرمەندان )* لە نزیک ڕێگای کەرکووك‌و تەقتەقدا مارانگاز چاك ئەکەنەوە •

گیانداریکی‌تر هەیە کە لەبەرچاوی کوردەکاندا نامۆو سەرسووڕهێنەرە ، ئەویش (حربام)ە کە (ماری ئاسمان)ی پێ ئەڵێن • لەڕاستیشدا هەمیشە باسی ئەوە ئەکەن کە هەرگیز ئەم مارەیان نەدیوە بخواتو بخواتەوەو بخەوێ‌و ئیش بکات‌و ڕاشیان وایە کەلە ئاسماندا لەدایك بووەو لە ڕۆژی بەختدا کەوتۆتە خوارەوە ، چونکە ئەم مارە ڕەنگی خۆی ئەگۆڕێت‌و تەنها لە بیری ئەواندا نەبێت نابینرێت •

هەروەها لە کوردستاندا هەندێ ڕووەکی سەیر سەیر هەیە کە شێوەیەکی ئاساییان هەیە • لەپێش هەموشیانەوە ڕووەکی (سراج القطرب)ە (Man.dragore) کە زۆر چاك ناسراوەو بەرەکەی (سێوە) جنۆکانە)ی پێ ئەڵێن‌و لە ئینجیلیشدا باس‌کراوە کە بەهێزکەرو ئالۆزێنەری شەهوەتە • جۆرە ڕووەکێکی‌تر هەیە کە لە شەودا بریقە ئەداتەوەو گەڵاکانی زیوییە • ئەگەر لێی نزیك ببیتەوە ئەچێتەوە بەناو زەویداو هەر هەوڵێك بدەیت‌و بگەڕێیت بەدوایدا یەکسەر خۆی ئەشارێتەوە • ئەڵێن ئەگەر ژنێك چەند دڵۆپێك میزی پیابکات ئەوا ئیتر ناتوانێ بجووڵێتەوە • هەر لەبەرئەوەی نەیەڵن بجووڵێتەوەو چەسپاو بێت لە دەوری ڕووەکەکەدا بە ماوەیەك هەندێ شتی پڕوپووچی لەو جۆرە شتانە ئەکەن • گەڵای

---

* وا ئەزانم ئەم جێگایە (هۆمەمەندانە)ر وا لەبەینی سلیمانی‌و ژاڵەدا •

ئەم ڕووەکە نەختێك لە گەڵای مێو ئەچێتو ڕەگەکانی وەکو لاشەی پیاو یاخود ژن وایەو ڕەنگەکەشی گۆشتییە •

کوردەکان ئەیگێڕنەوەو ئەڵێن : ئەگەر یەکێك دەستی بەم ڕووەکەوە گرت ، ئەوا ڕەگەکانی دەنگێکیان لێ بەرز ئەبێتەوە کە وەکو هاژەی با وایەو هەرکەسیش ڕەگەکانی هەڵبکەنێت یان بیبڕێت ئەمرێت !!

هەر لەبەر ئەمەو دوور کەوتنەوە لەو ترسە ، کوردەکان بە دەوری ئەم ڕووەکەدا چاڵ هەڵئەکەننو سەری حەبلێك بە ڕەگەکەوە ئەبەستنو سەرەکەی تری ئەبەستن بە ملی سەگێکەوە یان چاڵەکەوە ، دوا ی ئەوە بەگوێرەی توانا دوور ئەکەونەوەو سەگەکە ئەدەنە بەر بەرد ، ئیتر ئەو داماوەش لە ترساندا ڕائەکاتو ڕەگەکان ڕائەکێشێتو ئەکەوێت هەتا وای لێدێت کە ناتوانێ بجوولێتەوە •

ئەم باسەی سەرەوەمان لە (کامپانیل)ەوە وەرگرتووە •

هەروەها ڕووداوی تری والەو جۆرە ئەگێڕنەوەو باسی جۆرێك گژو گیای جوانی چیای ئامێدی ئەکەن ، کە هەرکەس بۆنی بکات کوێر ئەبێت • هەر لەگەڵ ئەمەدا چەشنێکی تریان دۆزیوەتەوە کە بە تەواوی کاریگەرە لە دژی ژەهرەکەی ئەمو پێی ئەڵێن (ترياق السموم) •
هەندێ لە ڕووداوە سروشتییەکان زۆر سەیر لێك ئەدەنەوە ، بۆ نموونە ، لەکوردستانو لەناو کۆچەرەکاندا کەس نیە کە نەزانێت هۆی مانگگرتن ئەهەنگێکی گەورە یاخود (تنين)ە کە هەوڵی خواردنی مانگ ئەدات • بۆ دوور خستنەوەی ئەم گیاندارە

---

★ زۆر باوە کە هەر لەکۆنەوە کوردەکان ڕۆژگیرانو مانگ گیرانیان بە دەسەڵاتی خوا لێك داوەتەوە •و تەبڵو دەفیان لێداوەو قورئانو هەندێ شیعری ئاینیان خوێندوە بۆ ئەوەی بەر بێنو واشیان زانیوە ئەگەر بە سور گیران نیشانەی شەڕو خوێن ڕژانەو ئەگەر بە ڕەشیش گیران ئەوە نیشانەی گرانیە •

نالەبارە ، بە دەنگی بەرز دەست ئەکەن بە قیرەقیڕو* دەوری‌و سینی‌و قانۆن لێدان بۆ ئەوەی بیترسێنن •

بوومەلەرزەش بەوە لێك ئەدەنەوە کە ئەڵێن زەوی لەسەر پشتی گایەکی سوور وەستاوە ، ئەم گایە جارجار کوێەکانی یاخود کلکی ئەجوولێنێتەوە ، یان وەکو هەندێکی‌تریان ئەڵێن مێشێك بە دەوری گاکەدا ئەسوورێتەوە ، کە لە چاوەکانی نزیك ئەبێتەوە گاکە چاوی ئەترووکێنێ بۆ ئەوەی مێشەکە دەربکات‌و ئیتر زەوی ئەلەرێتەوە* ، خۆ ئەگەر هات‌و ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم مێشە لەسەر پشتی گاکە نیشتەوە ئەوا ناچار ئەبێت خۆی بلەرێنێتەوە ، ئەوکاتە جیهان هەمووی کاول ئەکات !!

خوا خۆی بەهۆی سلێمانی داناوە کە سەرۆکی هەموو گیان لەبەرەکانە ، باران ئەبارێنێ‌و ئەینێرێت ، ئەو فەرمان ئەدات بە (هوما) کە باڵندەیەکی خەیاڵییە وەکو باڵندەی (عەنقا) ، ئیتر هوما دەم‌ودەست هەموو باڵندەکان کۆئەکاتەوەو پێیان ئەڵێت بە دەنووك ئاو لە ئۆقیانووس‌و دەریاکان هەڵبگرن‌و لە ئاسماندا بەرز ببنەوەو بە دەنووکەکانیان ناوچەی دیاری‌کراو ئاوبدەن ، ئەگەر هات‌و دڵۆپی بارانەکە لە قەوارەدا گەورەو بچووکیان هەبوو ، ئەوە هۆی جیاوازیی قەوارەی باڵندەکانە •

بینینی گەردوون ئەوەم بیر ئەخاتەوە کە کوردەکان دەربارەی ئاسمان‌و بینراوە سروشتییەکان بیروڕایەکی سەیریان هەیە ، ئەمانە مانگ‌و ڕۆژ بە خوشك‌و برا ئەزانن ، وا ئەزانن هەمیشە وان بە شوێن یەکەوە • مانگ برای ڕۆژە • بۆیە ڕۆژ ئەگیرێت

---

* لە کوردەواریدا زۆر باوە کە زەوی لەسەر پشتی گا ڕەش وەستاوەو گا ڕەشیش وا لەسەر پشتی ماسیەك‌و ماسیەکەش وا لەناو دەریایەکدا ، شاعیری خوالێخۆشبوو مامۆستا قانع هەر کات ئەوەیان باس ئەکرد ئەی ووت بەخوا ئەم کەلەکە تڕی هەر سەرناگرێ‌و ڕۆژێك ئەڕوخێ •

چونکە ئەم خوشکە ناز پێدراوە ڕووی خۆی لەبرا خۆشەویستەکەی ئەشارێتەوە ، بۆ ئەوەی تامەزرۆیی خۆی بۆ بینینی بسەلمێنێت •

کوردەکان ڕایان وایە کە هەموو پیاوێك لە ئاسماندا ئەستێرەیەکی درەوشاوەی هەیەو لەکەلیشیدا ئەمرێت • هەروەها ڕۆژگیرانو مانگگیرانو ئەستێرە کشان* بە نیشانەی داهاتی ناخۆشو نالەبار لێك ئەدەنەوە •

مادام شانتر ( Mme Chanter ) ئەڵێ :

بە شێوەیەکی تایبەتی ئافرەتی کورد باوەڕێکی پتەوی هەیە بە بەخت خوێندنەوەو فاڵگرتنەوە ئەچنە لای ئەو ژنە قەرەجانەی کە زۆر بە چالاکیەوە ئیسقانی شانی مەڕێك یاخود لم یان شێوەکانی تری فاڵ گرتنەوە بەدەستەوە ئەگرن بۆ فاڵگرتنەوە •

بەلام سەرباری ئەم هەموو بیروباوەڕە پڕوپوچانە بیرو باوەڕێکی تر هەیە کە زۆر بلاوەو بڕوایان زۆر پێیەتی ، ئەویش بڕوایە بە چاوپیسی • لەڕاستیدا ئافرەتی کورد وەکو هەموو ئافرەتانی ڕۆژهەلاتی خۆیان لەچاوی پیس ئەپارێزن • ئەمان بڕوایان پێچەوانەی ئەو بڕوا گشتیەیە کە لەڕۆژهەلاتدا بلاو بۆتەوە دەربارەی ئەوەی کە چاوی شین زیانی هەیە ، ئەمەش لەو پەندەیاندا دەرئەکەوێت کە ئەڵێ •

« هەرکەس چاوی زەرد بێت ، چاوی پیسە » •

ئەوانەی کە چاوی پیس کاریان تێ ئەکات ، بێگومان بەشی زۆریان ئافرەتی سك پڕو منالانن ، کەواتە نابێت لەنزیك چاو پیسەوە ئیشو کار بکەنو تەشی بڕێسن • هەروەها ئەبێ هەر

---

★ لە پێشەوە لە لاپەڕە ٢٢١دا باسی ڕۆژگیرانو مانگگیرانمان کرد ، بەلام هەر لەزۆر کۆنەوەو بەتایبەتی لەسەردەمی هاتنی ئاینی ئیسلامەوە کوردەکان ئەستێرەکشانیان بەوە لێك داوەتەوە ، کە پیاو چاکێك ئەمرێتو لەئیسلامیشدا زۆر ڕوونو ئاشکرایە کە خوای گەورە لەقورئاندا فەرموویەتی [وزين السماء الدنيا بمصابيح وجعلناها رجوما للشياطين] واتا شەیتانی پێ ڕەجم ئەکرێت•

ئافرەتێك منالّی بوو تا چل ڕۆژ نەچێتە لای چاو پیس ، چونکە چاوپیس ڕقی لێیەتیو بەخراپی ئەزانێ • سەرەڕای ئەوە ئەگەر هاتو دوو ئافرەت تازە منالّیان بوویێتو پێش چل ڕۆژ بەڕێکەوت توشی یەکتر بوون ئەوا ئەبێ دەرزیو منالّەکانیان* بگۆڕنەوەو دوای ئەوە بگەڕێنەوە بۆ مالّەوە بێ ئەوەی هیچ کامیان پێش ئەوی تریان بکەوێت •

**٢ ـ دۆعاو نوشتە کردن : ـ**

بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ خۆپاراستن لەچاوی پیسو ، بۆ دور کەوتنەوە لە شەڕەکانیانو بە پێچەوانەشەوە بۆ بە دەست هێنانی کرداری چاکەو بەخت باشی ، ئایا پێویست ئەکات پەنا بەرنە بەر هێزە شاراوەکانی سروشت یاخو گیانەکان (الارواح) ، بەهۆی دۆعاو نوشتەوە کە وا ئەزانن توانای هەیەو کاریگەرە ؟!!

هەندێ دۆعا لەخشلی ڕاستەقینە دروست ئەکرێن ، وەستا خۆمالّیەکانی ناو بازاڕ دروستی ئەکەن ، وەکو ملوانکە دروست ئەکەنو • کاریگەرییو جۆری پاراستنەکەی لە ڕەنگەکەیایەتی • ئەبێ ڕەنگەکەی شینو شێرەکەی (سەدەف ، یا هێلکە شەیتانۆکەو ، دەنگیشی زەنگێکی بچوك یان لەرینەوە بێت ، لە ئاقیقو بەردی پیرۆز ئاقیقی یەمانی دروست ئەکرێن) •

هەندێ نوشتەی تریان هەیە کە تورەکەیەکی بچوکەو شێخێکی گەڕۆك دروستی کردوە ـ ئاشکراشە کە بە پارەیە ـ خۆ ئەگەر بە پارە نەبێ خەلّکی هیچ بڕوای پێ ناکەن •

ئەمانەش پارچە کاغەزی بچوك بچوکن بە مرەکەبی سور چوارگۆشەی بچوك بچوکیان تیا ڕەسم کراوە ئەم

---

* لێرەدا تەنها دەرزیەکانیان ئەگۆڕنەوە نەك منالّو دەرزیەکانیان •

جادووگەرە ژمارەو وشـەی تیا نوسـیوەو هەروەها لەسەر پشتی کاغەزەکەش هەندێ وێنە ئەبینی وەکو وێنەی شێرێك یان خاڵی سور سور • ئەم کاغەزە لەشێوەی سێ گۆشەدا ئەپێچرێتەوە ، زۆر جاریش دەرزیەك ئەشکێنن و ئەیکەن بەدوو پارچەوەو ئەیخەنە ناوی ئەمە هەمووی ئەخرێتـە ناو پەڕۆیەکی بچوکەوەو ئەگەر هاتـو ئەختێك قژی پیاوێکیان خستە ناوی ئەوا ژنی ئەو پیاوە سور ئەبێت لەسەر ئەوەی کە پیاوەکەی خۆشی ئەوێت •

کاری گەری هەندێ لەو دۆعایانە وەکو (گوللەبەند) وا لـە خاوەنەکەی ئەکات کە لە گوللە پارێزراو بێت •

هەندێك لە شێخەکان لەنوشتە کردن‌دا پسپۆری پەیدائەکەن بۆ هەرچی‌شتێك کە بیانەوێت • ئەتوانن لەهەموو شتێك نوشـتە دروست بکەن تەنها ئەوەندە بەسە کە ئەو شتە بۆ ئیشـوکاری تر بەکار نەهێنرێت وەکو : دانی گورگ ، ڕەگی بەلاَلوك‌و هەنـدێ پارچە تەختە یاخود ، لۆ لوۆ ، • • • • هتد

هەندێ لەم نوشتانە ئەکرێن بە کلاوی منالە بچوکەکان‌دا یاخود قۆلی کراس‌دا ، شـتێکی ئاسایی‌یە کە ئافرەتیش ئەمانە بەکار ئەهێنن‌و هەنـدێ جاریش پیاو بەکـاری ئەهێنن ، بەتایبـەتی لە لادێ‌کان‌داو لەهەموو ناوەنـدەکان‌دا ، بەلاَم خەلکی شـارەکان‌و دێهاتە پێش‌کەوتوەکان* ئەم کردەوە ناشیرینانەیان لا ناپەسەندەو نایانەوون •

٤ ــ کردەوەو دروشمی جادوگەری : ــ

بە تەنها نوشتە هەلگرتن ئاسانجی تەواو بەجێ‌ناهێنێت، بەلکو ئەبێ هەندێ کرداری سەیر سەیریشی لەگەڵ‌دا بکرێت ، بەتایبەتی بۆ بەدەست هێنانی ئەنجام بەو ڕێگایانەی کە نهێنی‌زانەکان ئەیان زانن‌و بەهۆی توانای زەلامە ئاسایی‌یەکانەوە دەسـت ناکەون •

---

★ تا ئێستاش هەندێ کەس لەشارەکان‌دا بڕوایان بەم شتانە هەیە •

بە تەواوی ئەم کردارانە بریتین لەجادوکردنو شتی پڕوپوچ بۆ نمونە ئافرەتی وا هەیە ، بڕوای وایە کە ئەتوانێ مێردەکەی بە هەوەسی خۆی لێ‌خوڕێت‌و دەسەلاتی هەبێت بەسەریدا • ئەگەر هاتو بێ‌ئەوەی پێی‌بزانێت بتوانێت مێشکی کەری دەرخوارد بدات !! • ئەم کردەوە پڕوپوچە لەناو کوردا زۆر کەمە •

لەناو کوردا شتێکی زۆر سەیر تر هەیە ، ئەویش بەکارهێنانی بازنەی جادوگەری‌یە (الدائرة السحرية) •لەهەستی هەندێ کەسدا وا زانراوە کە ئەم بازنەیە پیرۆزەو شێوەیەکی جادوویی هەیە ، لەچونە ناو جیهانێکی تردا خەڵك ئەپارێزێت‌و ئەمەش لەهەموو کات‌و شوێنێکدا زانراوە • هەروەها لەکوردستانیش ، کورد بۆ ئەوەی خۆی لەگیانە پیسەکان بپارێزێت ، بازنەیەك بەدەوری خۆی‌دا ئەکێشێ‌و لەشوێنێکی چۆڵوهۆڵدا خۆی ئەشارێتەوە •

ئەگەر قەترانیش بەدەورو پشتیدا بڵاو بوەوە ئەوە ئیتر شەیتان زەفەری پێ‌نەبات‌و خۆی نەگەیەنێتێ • هەندێ لەشێخەکان لەکاتی خەڵوەدا ئەم بازنەیە بەخوێنی مەڕێك ئەکێشن کە بۆ قوربانی پێش‌کەشیان کراوە ، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە شەیتان‌و جنۆکەکان نەیەن‌و پەستیان نەکەن •

هەندێ شێخی جادووگەری تر هەن بۆ ئەوەی لەئازارو دەرد بپارێزرێن ئەچنە ناو بازنەکەوە • هەروەها یەزیدیەکانیش لە چارەنوسی داهاتودا باوەڕیان بە جادووگەری هەیە • ئەگەر هاتو یەکێکیان بە گاڵتەوە دەرگای بازنەکەی داخست ئەوا ئەو یەزیدیە داماوەی ناو بازنەکە لەناو ئەو بازنە داخراوەدا ئەمێنێتەوە هەتا یەکێکی دەروون‌پاك دێت‌و بازنە نالەبارەکە ئەکاتەوە • ئیتر هەر لەخۆیەوە لەو بازنەیە نایەتە دەرەوە ، ئەگەر لەبەردەمیشیا جنێو بە شەیتان بدەن !!

گۆرانەکانیش لەسەر زەوی بازنەیەك ئەکێشنو سێ بەردو خەنجەرێكو پارچە تەختەیەکی تێ‌ئەخەن ، ئەم شتانە نیشانەن بۆ شوێنەواری (دوکــانی داودو زولفەقار) یاخود شیرەکەی عەلیو درەختەکانی باپا یادگار ٠

هەندێ کــردەوەی جادووگــەریتر هەیە کە کــوردەکان بۆ بارانبارین یاخود وەستانەوەی باران ئەیانکەن ٠ شتێکی ئاساییە کە لەکاتی بارانبارینــدا نوێژی بــۆ ئەکەن ، هەر لــەم ڕووەوە (تۆفیق وەهبی) پێمــانئەڵێت ئەم (نوێژە بارانانە) لــە دەرەوەی شارو دێهاتەکاندا ئەخوێنرێن کە خەڵوەتگاو تەکیەی دەروێشو دێوانەکانی تیایــە ٠دێوانەش هەر دەروێشن بەڵام ئەمــن دڵنەرم ترنە ، ڕووی خۆیان ڕەش ئەکەنو ئەچنە سەر گۆڕی شێخێك کە لە ناوچەکەیاندا بەناوبانگە ، دوای دوعاکــردنو پاڕانەوە ئیتر دەست ئەدەنە زکر کردن ، هەروەها ژنانیش هاوبەشی بارانبڕان ئەکەن ٠ ئەچن بۆ کانیو بەیەکەوە خۆیان ئەشۆرن یاخود دەست بە عارەبانەیەکەوە ئەگرنو ئەیبەن بۆ سەر ڕووبارێكو ئاوی پێ دەرئەهێنن ٠ یاخود جوانترین جل لەبەر ئەکەنو بە کۆمەڵ ئەچن بۆ دێیەك کە درەختێکی پیرۆزی تیابێت ٠

دوای ئامادە کردنی کاسەو کەوچکی چێشتلێنان ، بە دەوری قابلەمەی چێشــتەکەدا دەست ئەکەن بە هەڵپــەڕکێو چاوەڕوانی کولانی چێشتەکە ئەکەن ، دوای ئەوەی لە نانخواردن بوونەوە ، ئاوپرژێنی جوانتــرین جلوبــەرگی یــەکێ لە ئامــادە بووەکان ئەکەنو ئیتــر چاوەڕوانی بــارانبارین ئــەکەن ٠ ئەگــەر پێش ڕۆیشتنەوە بە سەعاتێك باران نەباری ئەوا هەموویان ئاو ئەکەن بەسەر جلەکانیانداو بەتەڕی ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە ٠ لە کەرکوك ئافرەتان لەسەر شەقامەکان لەژێر پلوسکدا کۆئەبنەوەو خواردن دابەش ئەکەن بەسەر هەژارەکانداو جۆرێك ئاویشیان ئەدەنێ ٠

ـەدێهاتیش ، پیاوێکی ئاینیی خواپەرست ئەخەنە ناوحەوزێکەوە• لە هەندێ ناوچەیتردا ئەگەر بـاران نەباری ئەوا بەردێکی سەر گۆڕی شێخێك فڕێئەدەنە ناو ئاوەوەو وازی لێئەهێنن •

هەروەها منالانیش بـە دەوری خۆیـان بەخۆشـیەوە بووکە بارانە دروست ئەکەنو هاوبەشی ئەکەن • دوو پارچە تەختە لە شێوەی خاچی لاتینیدا دروست ئەکەنو جلی لەبەر ئەکەنو مێزەری بۆ ئەبەستنو دوو منالّ بە هەردوو دەست هەڵئەگرنو منالّەکانی تریش لەگەڵیاندا ئەگـەڕێن بەناو مالّـەکانداو هەموویـان ئەم گۆرانیە ئەڵێن* :

هەنارو مرەبەکان*
خوایە داکاتە باران
بۆ هەژارو نەخۆشان
خوایە باران بیارێ
کەچەڵە سەری بەهارێ
ئەی بووکە بارانەکان
ئاو بهێنن بۆ درەوان
وەك ڕۆژە ڕابوردووەکان

ئەم بووکە ئەخرێتـە حـەوزی هەمـوو ماڵێـکەوەو خاوەن ماڵەکەش گۆزەیـەك ئاو ئـەکات بەسـەر بووکـەکەداو هەندێك

---

★ لەناو کوردەواریداو لەزۆر کۆندا بار بوە کە منالان بوکە بارانەیان کردوەو لە زۆر ناوچەدا منالان ئەم گۆرانیەیان بەم شێوەیە وتورە :

هەنارانو مەناران
یاخوا داکاتە باران
بۆ فەقیرو هەژاران

★ ئەم هەلبەستانە عەرەبی بوون ، هەر لەشێوەی هەلبەستدا کردومانن بە کوردی ئەگینا خۆی لە بنەڕەتدا وا نەوتراوە •

شیرینیش بەسەر منالەکاندا ئەبەخشێتەوە ، بە پێچەوانەشەوە بۆ وەستانی باران‌بـارین لە کاتێکدا کە بۆ بەروبووم خـــراپ بێت ، منالان بووکێـکی وەکو ئـەوی‌تر هەڵئەگــرن‌و ئەسوورێنەوەو گۆرانیی (کۆدۆ ، کۆدۆ) ئەڵێـــن ، هەروەها دیـاری‌و شیرینییان بەسەردا دابەش ئەکرێت ·

گرێیەك بە نـاوی کەچەڵێکەوە ناو ئەنێن‌و حەبلەکە ئەخەنــە ناو ئاگرێکەوەو ئەڵێن :

«ئاگرمان ئامادە کردووە بۆ کەچەڵــەکان ، دەبا ڕۆژیش بە ئاگری خۆی بمان‌سووتێنێ !» ·

جارجاریش چل* ناوەو حەبلەکە بە گوێرەی ژمارەی ناوەکان گرێ‌ئەدەن‌و بــە پلوسـکێکەوە بـەرەو ڕووی مەککــەی پــیرۆز هەڵی‌ئەواسن · ئەو شێوەیە ئاسان‌تر ئەبێت ئەگەر هات‌و ناوەکان لەسەر پارچە کاغەزێك نووسرایەوەو بە درەختێکدا هەڵواسرا ·

## ٤ ـ پاشماوەو شوێنەواری بت‌پەرستەکان :

ئەم هەموو بیروباوەڕە پڕوپووچ‌و خووڕەوشتە جادوگەرییانە تەنها تایبەتی نیــە لە ناو کوردەکاندا ، بەڵکو لەنـــاو هۆزەکانی نزیك ئەنــازۆڵ‌و قەفقاسیشدا هەر هەیە · لە نـــاو کوردەکاندا هەندێ کــردەوە هەیە کە بە پاشماوەی بت‌پەرســتی دائەنرێن‌و هەتا ئێستاش سەرەڕای تێپەڕبوونی چەند سەدەیەك هەر ماوون· بە بیانووی ئەوەی کە ئاینی کورد لەمەوپێش زەردەشتی بووە ، هەندێ لە ڕۆژهەلاتناســەکان‌و کــوردەکان خۆشــیان هەوەسیان هەبووە کە بە ڕۆژپەرستی‌و ئاگر پەرستی بمێننەوە ، ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی لەنــاو هەموو کوردەکانداو بەتایبــەتیش لەناو یەزیدییەکاندا باوبووە ، ئیتر لەمە زیاتر هیچ شتێکی‌تر نیە ئەوە بسەلمێنێ کە ڕۆژپەرستەکان‌و یەزیدییــەکان لە نوێژکردندا ڕوو

* لە کوردەواریدا ئەمە بە ناوی [چل کەچەلە]وە بەناوبانگە ·

ئەکەنە ڕۆژ لەکاتی هەڵهاتن‌و ئاوابووندا - هەندێ لەگاورەکانیش کە نوێـژ ئەکەن ڕوو ئەکەنە ڕۆژهەڵات • بەڵام لـە ڕووی ئاگر پەرستییەوە ئەتوانرێت کە هەندێ تێبینی بخرێتە ڕوو ، ئاشکراو چەسپاوە کە لە کوردەواریدا ماڵ پـیرۆزەو ئاگریش لەناو ماڵدا نیشانەی بەردەوامیی خێزانەکەیەتی ، وەکو [موحەممەد موکری] باسی ئەکات لە کوردستاندا خۆڵەمێشی هەندێ ماڵە سۆفی یاخود هەندێ ماڵی حەقە تواناو هێزێکی جادووگەری ئاینیی هەیەو لە هەندێ ناوەندا بڕوایان پێی هەیە • هەر ئەم سەلماندنە لای (مادام سانتر)یش هـەر هەیـەو گەلێـك درێژتـر ڕوونی کـردۆتەوە (کوردەکان ڕێزێـکی گەورە لە ماڵە باوکان‌و ماڵـە شێخەکانیان ئەگرن) ، ماڵەکانیان لا پیرۆزەو ئەو ئاگرەشی تیـا ئەگرێت بە شتێکی پیرۆزو پـاکی دائەنێن • تف ڕۆکـردن گـوناهێکەو لێی خۆش‌نابن ، هەروەها (کورد بە ماڵەکەی سوێند ئەخوات) ، کوڕی تازەبوو بـە دەوری ماڵدا ئەگێڕن ، هەروەها کچێکیش کـە ماڵە باوانی بەجێ‌ئەهێڵێ‌و ئەچێت بۆ ماڵی مێردەکەی ، ئەبێ بە دەوری ماڵەکەدا بـسوورێتەوە ، دایکیش کە کچەکەی شوو ئەکات ، لەماڵی باوکیەوە ئاگر ئەبات بۆ ئەو ماڵەی بووك‌و زاوا تازەکەی تیایە •

ئاگر خواستن لەماڵە دراوسێ شتێکی نەویستراوەو بەکارێکی خراپ دائەنرێت • بە ڕۆژوشەو لـە بەهارداو هەتا مانگا ئەزێت پارێزگاریی ماڵ ئەکەن • هەروەها لە کاتی شیر گەرم‌کردندا نابێ ئاگر لەژێر قاپلەمەکە دەربهێنرێت ، هەروەها نابێ گاگەل بەرەو ڕووی شەوق‌و گڕ لێ‌خوڕرێت •

ڕێزگرتنی ئاگـر لەناو یەزیدیەکان‌و قزلباشـەکانیشدا کە (سەرسوور)یان پێ‌ئەڵێن هەر باوە •

سەرەڕای ئەم هەموو تاقی‌کـردنەوەو تێبینیانە ، بە واتای تەواو هیچ پاشماوەیەکی ئەم پەرستنانە نابینین ، نە نوێـژو نە

نوشتەی ئاسایی‌و نە نیشانەی بچوکیش بۆ ئەو بت‌پەرستیانەیان نابینین • لەکاتی شەڕی جیهانی یەکەمدا فەرمان‌بـەرێکی قۆزاقی بڕوای وابوە کە هەندێ پاشـماوەی ئاگر پەرسـتی لە خێوەتێکی کوردا لەسـەر سنوری تورکیـاو ئێران بینراوەو لەخێـوەتێکدا ئەمانەیان دۆزیوەتەوە : ـ

سێ پایەك قابلەمەیەکی لەسـەر دانراوە • هەروەهـا زنجیرێکی ژەنگاوی کە سەرێکی لەژێر چەند شاخێکدا هەڵواسراوەو سەرەکەی تریشی لەژێر سـێپێکەدا درێژ بۆتـەوەو بەدەوری ئەم خێوەتەدا بەردیان ڕێك‌خستوە کە وێنەو نیشانەو نوسـینیان پێوەیەو ئەم خێوەتە کەسـی لەژێردا نـاژی ، لەهەمووانیشەوە پارێزگـاری ئەکرێت‌و لەڕۆژانی ئاهەنگەکاندا ئەچن بۆ ئەم شوێنە بەتایبەتی لەکاتێکدا کە هۆزە پێشینەکان قوربانیەکانیان لەسەر ئەم ئاگرە پێش‌کەش ئەکەن •

نیکیتین ئەڵێ : ( Nikitine )

ئایا پێویست ئەکات ڕونی‌کەینـەوە کە ئێمە واین لەبەردەم میحرابێکدا یاخود شاخی بەرانی نیوە سوتاودا کە وان لە بەینی بەردی دیـواری خانووەکاندا ؟ ئایا بەڕاستی ئەمانـە پاشماوەی قوربانیەکانن یاخود پاشماوەی خواردەمەنی شوانەکانن •

ئەگەر بەردی خانوەکەش نەخشو نیگاری پێوەبێت ، هێشـتا توخمـە مادی‌یەکـانی هـەر لاوازن • لەم ناوچانەشـدا گەلێك پاشماوەی کۆن هەیە ، کە لە هەموو شتێکدا هەر بەردیان بەکار هێناوە ، بەجۆرێـك کە من خۆشـم دوو دڵم کە ئایا لەسـەرچی بناغەیەك ئەو بەڵگە ئەرمەنیە ئەوە ئەچەسپێنێ کە گوایـە ئەمە نیشانەی محرابێکە ؟ • ئەمە هەر بە نەزانراوی ئەمێنێتەوە ئەگەر ئەو کەسانەی ئەم شتانەیان دروست کردوە خۆیان خەیاڵەکانیانمان لە دروست‌کردنیاندا بۆ لێك نەدەنەوە •

پەرستنی هێزە سروشتیەکان زۆر ڕوون تر دەرئەکەون هەروەکو ئەزانین لەهەموو کونو قوژبنێکی جیهاندا پێشینان وایان ئەزانی کە جنۆکــە بەزۆری دێنە سەر هەنــدێ داروردەخت یاخــود سەر کانیەکان • ئەم بیروباوەڕانە هێشتا بە تەواوی لەناو نەچوونو هەتا ئێستاش لەکوردستاندا کانی یاخود درەخت بەچاوێکی پیرۆز سەیر ئەکرێن •

بەلام (درایفر)و خەلکی تریش هەرچەندە بنوسن کە گوایە پەرســتن ـ ئەگەر پەرســتن هەبووبێ ـ لەوانەیــە کە زۆرتر بۆ درەختەکە بوبێت نــەوەك بۆ ئەو جنۆکەیەی کە لەســەریەتی ! ! ئاسایی‌یە کە درەختی پیرۆز لەنزیك گۆڕی پیاوێکی پیرۆزەوەیە وەکو شــێخێك‌و هەروەهــا نــاویشی هەیــە • بۆ نمــوونە لەناو یەزیدیەکاندا (خاتو نەفیسە) دارهەنجیرێکە لە دێی بەعشــیقە لە (Kharabek) • درەختی توش هەر بەڕێزە • هەرکەسێك بەلای درەختێکی پیرۆزدا تێ‌پەڕێت ئەوا پارچە قوماشێکی پیاهەلئەواسێت لە جیاتی قوربانی یان بۆ تەندروست چاکی •

مادام هانسن ئەوەی تێبینی کردوە کە ئەو پارچە قوماشانەی بەم درەختانەدا هەل‌ئەواسرێن شتێکی جیاوازە لەو پارچە قوماشەی کە بە ســەری دارێــکی ڕێکی درێژەوەیەو لەنزیك گــۆڕی پیاو چاکێکەوە چەقێنراوە• یەکەمیان لەپاشماوەکانی بت‌پەرستیە بەلام ئەمی تریان وا نیە •

هەروەها گەلێ کانیاوی پیرۆز هەیە ، کە لەتەنیشت مزگەوت یاخود تەکیە یان گۆڕستانەکانەوەن • ئەچنە سەر ئەم کانیانە بۆ چاك‌بوونەوە لەنەخۆشی ، بۆ نمونە لەناو یەزیدیەکانی شێخاندا کانیەك هەیە ناوی (کانی زەرکێ)یە مانای کانی زەردکە ، هەر بە ناوەکەیدا دیارە کە خەلکی لەنەخۆشی زەردۆیی چاك‌ئەکاتەوە •

بەلام کـــانی زەمزەم لەلای گۆڕی شـێخ عدەی یەکســەر لە مەککەوە دێتو منالیشی تیا ئەشۆرن • هەندێ لەم کانیانە ماسیان تیایەو پیرۆزنو ڕاوکردنیشیان نارەوایە ، هەروەها کانی تریش هەیە وەکو کانیەکەی نزیك گۆڕی شێخ بیکۆوە لە (Bahzani) لە شێخانو کانی شێخ عبدالقادر لە (Turunde) لەچیای سەممان ئەشکەوتی قوڵو بەردی وەکو کورسیو بەردی بەرزو کانی جوان جوانی پڕ لەماسیو دارســـتانی بچوكو پڕ لەگۆڕی کـۆنو دارو درەختی پیـــرۆز کە نایەڵن لقو پۆپەکانیـــان ببڕێتەوەو تەنانەت شکاوەکانیشیان ئەم هەموو شوێنانە جێگای جنۆکەی ناو سەوزایو ناو ئاوون ، ئەمانە لە هەموو قونوقوژبنێکی کوردستاندا زۆرنو لە هەمـــوو لایـــەکدا هـــەر ڕێزیـــان لێ ئەگـــیرێتو لـــە هەمـــوو چەرخـــە دواکەوتـــوە نەزانینەکانیشـــدا هـــەر وا بوون • شـــتە پیرۆزەکانیشیان پەرستوە کە لەوانەیە لەجیاتی پەرستنی هێـــزە سروشتیەکان دانرابنو ئەمانەش لەدڵی کۆمەڵە ساکارەکاندا هەر ماوون ، سەرەڕای ئەوەی کە لەئیسلامدا زۆر بەتوندی دراونەتە دواوە •



## ئـــەدەب

لەوانەیە ئـەم ناوونیشـانە سـاکارەی ئـەم بەشـە هەندێ لـەو خوێنـەرانە سەرسـام بـکات کـە هەرگیـز پەڕاوێـکی کوردی‌یان نەدیوەو پرسیار ئەکەن کە ئایا ئەمە بەڕاستی هەیە ؟٠ بەبێ خۆ خەریك‌کردن پێیان ئەڵێین ئەمانە بە هەڵـەدا چوون ٠ ڕاستیشە کە هەندێکیان گەیشتونەتە ئەوەی بی‌سەلمێنن کە تەنانەت زمانی کـوردی هەر نەبووە ، کـوردەکان بەجـۆرە دیالکتیکێك قـەیان کردوە کە نزیکەی نیوەی وشەکانی تورکی بـون‌و تاکە تاکەکانی تریشی لەزمانی عەرەبی‌و فارسیەوە یاخود زمانەکانی ترەوە کە لەناوچەکەیاندا هەبووە وەکو ئەرمەنی‌و کلدانی‌یەوە وەرگیراوون ٠

لەڕاستیدا بەتەواوی زمانی کوردی هەیەو لەپێش زیاتر لە سەدەیەکەوە گەلێك زانایان کە دانیان بە ڕەســەنێتی زمانەکەدا نـاوە لێی کۆڵـراوەتەوە ٠ بـۆ ئەمەش باسـی تـازەترین لێکۆڵینەوەمان بەسە وەکو : ـ

( ی٠ ن٠ ماکاروس ) ساڵی ١٩٥٨ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ٠ E.N. Macaros

(د . ن . مەکەنزی) سالی ۱۹٦۱و سالی ۱۹٦۲ لەئۆکسفۆرد
(ئای. تسۆکرمان) سالی ۱۹٤٦ لە یەکیەتی سۆڤیەت I Tsukerman
لە سالی ۱۹٦۱دا (کوردۆ) K. Kurdo لە مۆسکۆ هەر لە سالی
۱۹۵۷دا فەرهەنگێکی (کوردی ــ ڕووسی) بــە «۲۰٬۰۰۰» وشە
لەچاپ داوە .

پێش ئەوەی باسی ئەدەبی سەرزاری خەلکیو فۆلکلورو نوسراو بکەین با دەربارەی زمانی کوردی نەختێك بدوێین .

## ۱ ــ زمانی کـــوردی : ــ

کورد بەشێوە زمانی هندۆ ــ ئەورووپی قسە ئەکەن کە لەزمانی فارسی تـــازە ئەچێت . بەلام ناتوانرێ لە موفـــرەداتو فۆنەتیكو دروستکردنی ڕستەدا [الاعراب والنحو] تێکەلاو بکرێت .

دوو شێوە زمـــان هەیە* : کرمـــانجی سەروو ڕۆژئـــاوا کە کوردەکانی تورکیاو سوریاو ولاتەکانی سۆڤیەتو سەرووی عێراق قسەی پێ ئەکەن . شـــێوەی دووەمیش کرمـــانجی خـــواروە کە سۆرانیشی پێ ئەلێـــنو کوردەکانی ئێـــرانو ڕۆژهـــەلاتی عێراق قسەی پێ ئەکەنو ئەم ولاتەش ئەکەوێتە ناوەڕاستەوە ، هەروەها ڕووباری زێی گـــەورە ئـــەم دوو شـــێوە زمانە کرمانجییـــە جیا ئەکاتەوە .

هەندێ لە کوردەکان وەکو زازاکان بەشێوە زمانێکی تایبەتی قسە ئەکـــەنو (گـــۆرانی) پێ ئەلێـــن . هـــەر یەکێ لـــەم شێوانە جیاوازییەکی بێ پایانیـــان لەگـــەل یەکتـــردا هەیە ، بـــە جۆرێك

★ چوار شێوە زمانی کوردی هەیە وەکو :
۱ ــ شێوە زمانی کرمانجی سەروو .
۲ ــ شێوە زمانی کرمانجی خواروو .
۳ ــ شێوە زمانی گۆرانی (بەشی هەورامیشی هەیە) .
٤ ــ شێوە زمانی لوڕی .

ئەتوانین بڵێین هەموو هۆزێك‌و هەمـوو ناوچەیەك خوورەوشت‌و شێوەی جیاوازی تایبەتیی خۆیان هەیـە • ئەم دیاردەیەش لەناو هەموو چیا نشینەکاندا هەیە •

هیچ پێویست بەسەرسوڕمان ناکات ، کە عەرەبی مەغریب زۆر بە ناڕەحەت لە عەرەبی عێراقی تێ‌ئەگەن‌و میسرییەکانیش هەمیشە بەتەواوی لە لوبنانیەکان تێ‌نـاگەن ، بە پێچەوانەشەوە لەکاتێکدا کە شێوە زمـانی نەتەوایەتییـان بەکـار ئەهێنن هەر تێ‌ناگەن • موفـرەداتی زمانی کـوردی لە بنەڕەتـدا ئێرانییە • بەڵام زمـانی عەرەبیش هەر وەکو زمانی فارسی‌و تـورکی کاری تێ‌کردووە ، بەتایبەتی لە ناوەندی ئاینیدا ، چونکە ئەم نەتەوانە هەموویان ئیسلامن‌و ناتوانن واز لە زمانی قورئان بهێنن • هەر لە سـەرەتاوە کوردەکانیش بەتەواوی وەکو فـارس‌و تورکەکان پیتی چاپی عەرەبییان لە نووسینەوەی زمانەکەیاندا بەکار هێناوە بەڵام ئەم پیتانە بەگوێرەی شێوە زمانەکانی‌تر کە قەڵەوی‌و درێژە پێدانیان تیایە هەر کەمن • بەتایبەتی هەندێ پیت هەن کە بە لێو ئەوترێن‌و ئەمانە لای عەرەبەکان هەر نەزانراون •

هەروەها ئێرانیەکانیش هەندێ پیتیان خستۆتە سەر ئەلفبای عەرەبی بۆ هەندێ شێوەی دەنگی پیتەکان وەکو ( ژ ـ ل ) و (ڤـ V ) کە بە هیچ جۆرێ لە زمانی پێغەمبەردا (د•خ) نەبوون •

لانەبردنی پیتـە بزوێنـەکان یەکێکە لـە تەنگ‌چەڵەمەکانی نووسینی عـەرەبی ، کوردەکانی عێـراق بە شێوەیـەکی تایبەتی گەلێك نیشانەیان خستۆتە سەر ، هـەروەکو تورکەکان لە کۆندا خستبوویانە سەری ، خوێندنەوەش گیروگرفتی لەمە کەمتر نەبووە لەبەر ئـەوە هەندێ لـە ڕۆشنبیرە کـوردەکان بەتایبـەتی ئەمیر بەدرخان هیچ دوودڵییان نەکردووە لـە لاسایی کردنەوەی مستەفا

کەمال ئەتاتورك باوکی تورکەکاندا ، کە هەوڵی ئەوەی داوە زمانی نەتەوەکەی بخاتە سەر شێوەی لاتینی ·

ئەو کوردانە پیتەکانی زمانی کوردییان لەسەر شێوەی زمانی لاتینی دەرهێناوە لەگەڵ نیشانەی تایبەتیدا بۆدەنگە تایبەتیەکان· هەروەها دەنگێکیش ناتوانرێ لابرێت بە هۆی نیشانەیەکەوە · بەم شێوەیە ئەلفبایەکی زمانی سادەو باوەڕپێکراویان بۆ دروست بووە · وە هەر لەماوەی زیاتر لە ٤٠ ساڵ لەمەوبەرەوە بەڵگەی سەلماندنیان هەبوە ·

ئەش توانرێت بوترێت کە ئێستا توانایەکی پاسایی لەناو کوردەکانی سوریاو لوبنانو تورکیادا هەیە ·

نووسینی زمانی کوردی بیستو شەش پیتی بەسە · پیتە بزوێنەکان پێنجن ، A·E·I·O·U· ئەو پیتانەی نیوە بزوێنن دوانن ، P·W· بەڵام پیتە نەبزوێنەکان ئەمانەن * :ـ

B — C — D — F — G — H — J — K — L — M — N — P — Q
R — S — T — V — X — Z

ئەو پیتە بزوێنانەی نیشانەیان لەسەر دانراوە بۆ درێژ بونەوەی دەنگی پیتەکان سیانن û — î — ê ئەو دوو پیتە نەبزوێنەی نیشانەیان خراوەتە ژێر ئەمانەن ç — ş ·

---

★ پیتەکانی زمانی کوردی ئێستای ئێمە ئەمانەی خوارەوەن :ـ
پیتە نەبزوێنەکان ـ ٢٩ ـ پیتن و ئەمانەن :
ئ ، ب پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ڵ ، ل ، م ، ن ، و ، ه ، ی ·
پیتە بزوێنەکانیش هەشتن و ئەمانەن :ـ
ا ، ە و ، و ، وو ، ۆ ، ی ، ێ ، ی ·
پیتێکی بزوێنی زۆر کورتی ترمان هەیە کە لە نووسینی کوردیدا دەرناکەوێت . بەڵکو تەنها لە نووسینی لاتینیدا هەیە وەکو ( من ـ بە لاتینی ئەنووسین ـ min واتە بۆ ئەو پیتە بزوێنە زۆر کورتە پیتی ـ i ـ ئەنووسین و ژمارە پێنجی لەسەر دائەنێین ·

دوانی تر هەیە کە یەکی دوو خاڵیان لەسەر دانراوە ئەوانیش ئەمانەن Ü — ï •

ئەم پیتانەی تریش هەر ئەو دەنگانەیـان هەیە کە لەزمـانی فەرەنسیدا هەن بێجگە لە پیتە بزوێنەکان •

| | | | |
|---|---|---|---|
| A | = | A | درێژ • |
| A | = | E | زۆر کورت ( کورت کراوە ) • |
| E | = | I | بێ‌دەنگ • |
| OU | = | U | |

بەڵام دەربارەی ئـەم دوو بزوێنە G — S — ئەمانـە بە تەواوی نەجوڵاوو بێ‌دەنگن وەکو لە وشەی (gâteau) (گاتۆ) وە (Saucisse) ( سۆسیس )دا دەرئەکەوێت •

هەر لەسەر ئەم پێنج پیتـەش لەم کتێبەدا وشـە کوردیەکان نوسراونەتەوە وەکو : ــ

DJ = C
TCH = C
CH = S
KH = X عەرەبی •
= X غەینی عەرەبی (غ) •

کوردەکانی ئەرمینیای سۆڤیەتی لەسەرەتادا نوسـینەکانیان بە پیتی لاتینی لەچاپ داوە ، تەنها هەندێ گۆڕانیان لەپیتەکاندا کردوە ، ئەمەش نەختێك لەپێش شەڕی جیهانی یەکەمـدا بووەو ئەلف‌و بێ‌ی سـلاڤی [سـیریلیەك] یان تێ‌کەڵ کردوە بە هەنـدێ بەرانبەر کردنـەوە بـەڵام هەرچۆنێـك بێت ئـەم نووسینەوەیە ئاسانترەو ڕوونتریشە لەو نوسـینە عەرەبیەی کە بە شـێوەیەکی گشتی کـوردەکانی عێراق بەکـاری ئەهێنن • واش چـاوەڕوان ئەکرێت کە هەموو کوردەکان هەوڵ بدەن بۆ بەکارهێنـانی پیتی

لاتینی ٠ چونکە خوێندنەوەو نوسینەوەی بەلای منالە بچوکەکانەوە ئاسانترە ٠ هەروەها ئەم گۆڕانە هەر لەخۆیا یەکگرتنی زمانو بیر ئاسان ئەکات ٠

## ٢ ـ ئەدەبی سەرزارو ناو خەلکی (فۆلکلۆر) : ـ

هەروەکو لەناو هەموو ئەو گەلانەدا کە هەتا ئێستا خوێندنی قوتابخانە لەسەردەمی گەشەکردندایە ، لەناو کوردەکانیشدا ئەدەبی سەرزاری زۆرەو زۆریش دەولەمەندە ٠

هەروەها هەر بەم شێوەیەش باسی پێشکەوتنی فۆلکلۆرییان ئەکرێت ٠

ڤیلچیڤسکی — Viltchevsky ئەڵێ :

لەڕاستیدا ئێمە خۆمان لەبەردەم کۆمەڵە ڕایەکدا ئەبینین کە لە سەرەتادا کۆکراونەتەوەو لە دواییدا لەلایەن بێگانەوە چاپ کراوون وەکو (ژابا Jaba ) ، (لیرخ Lerch ( پریموسوتسین Prymetsocin ) ، (ماکاش Makas ) ، (مان Mann (هادنگ Hadank ) ، ( نیکیتین (Nikitine) ) ، (لیسکوت Lescot ) و (مەکەنزی Mackenzie

تا ڕادەیەك هەندێ لەم نوسراوانە کۆنن و ئەگەڕێنەوە بۆ سەدەی پانزەهەمو شانزەهەم ٠

گەلێك لە کوردەکان هەر لە ٣٠ ساڵ لەمەوبەرەوە دەستیان کردووە بە دانانو چوونەتە لای ئەو پیرانەی کە بیری بەهێزو تواناو پاکیان هەیەو گەلێك گۆرانیو سەرگورشتەی میللیان کۆکردۆتەوە ، وەکو :

حاجی جندی Hadji Djindi

ئەمین عەبدال Amin Avdal

جاسم جەلیل Djasim Djalil

ئەمانە هەموویـــان لــەم ڕووەوە گــەلێ کـــردەوەی چاکیان کردووە • دەوڵەمـــەندیی فۆلکلۆر لە ـەرەتادا لە پەنــدو قسەی نەستەقی میـــللیو هەندێ مەتەڵــەوە دەرکەوتووە ، هەروەهـــا لە گۆرانیو چـیرۆكو هەندێ سەرگورشـــتەشدا • نمـــوونەو پەندە کوردییەکان هەتـــا بلێی زۆرنو بـــە زۆریش مانـــای شتیتـــریان هەیەو لێرەشـــدا ماوەمـــان هەیـــە کە لـــەم تێڕوانینانـــەوە باسی هەندێکیان بـــکەین • لە ڕاستیشدا کورد حەزئەکات وتـــەکانی بە ڕستەی ڕێكخراوو ئاوازدار بڕازێنێتەوە ، کە تێبینی لە هەستی ڕاستەقینەدا ئەکات • دیمەنەکانی سروشت ، چالاکیی ڕۆژانە ، بەتایبەتی هەڵوێستی ئەو گیانلەبەرانەی کە بەخێویان ئەکەن ، یاخود ئـــەو گیانلەبەرە دڕندانـــەی کە ڕاویان ئـــەکەن • ئەمانە هەمووی وایـــان لێ ئەکات کە لەیەكچوون وا دروست بـــکەن جێی سەرسووڕمـــان بێو هـــەر خـــۆیشی کورتـــە پەندێـــکی زانیاری پێك بهێنێت •

چیای بەرز نیە بێ بەفرو ، دۆڵی قووڵیش نیە بێ ئاو •
بەرد لە شوێنی خۆیا سەنگینە •
ئاو گەییە تەنگەبەری هاوار ئەکات •
مریشکی برسی خەو بە ئاوەوە ئەبینێ •
مریشك کە ئاو ئەخواتەوە سەیری خوا ئەکات •
مریشك لاسایی (حەبرەجی)[٢٥] کردەوە کۆمی دڕا* •
هاوڕێی قەلەڕەشکە هەمیشە دەنووکی لەچۆڵیدایە •
گۆزەیەك بە دەستی کەیبانوو بشکێت تەقەی نایەت •
ئـــەوەی لای کـــوورەی ئاســـنگەرەوە دانیشـــێت پریشـــکی بەرئەکەوێت •

---

٢٥) حەبرەج ــ جۆرە باڵندەیەکە •

★ لە کوردەواریدا باوە ئەڵێن : ــ مریشك لاسایی قازی کردەوە کۆمی دڕا •

هەروەها قسەی نەستەقو پەندەکان بە وەرزە جۆراو جۆرەکانەوە بەستراوون ، وەکو :

لە هاویندا :

چۆلەکەکان هاوار ئەکەن : مەیدان •

ڕۆژانی ڕەمەزان تەواو بوو !

لە مانگی ئازاردا :

ڕەزەوانەکان ئەترسنو هیلاکن [دوودڵن] •

لە پاییزدا :

بەپەلە خۆت بشارەوە •

لە بەهاریشدا بەپەلە وەرە دەرەوە •

بارانی کتوپڕ لە نیساندا •

گەنجینەی خۆراسانە •

هەروەها کوردەکان هەمیشە حەزئەکەن مەتەڵی کێشو قافیەدار پێشکەش بکەن :

دڵاوێکی خڕی پڕ مارومێرو چیە ؟

وەڵامەکەی ـ هەنجیرە •

کاتێك کەر ئەزەڕێنێ ـ شیاکە ئەدزرێت •

وەڵامەکەی ـ گوللە تفەنگە •

دوای ئەمانە ئەی دەربارەی گۆرانیوتن چی ؟

ئەمەشمان لە بەشی شەشەمدا باسکرد ، لە ڕاستیدا باسکردنی هەر تەواو نابێت • لە کێڵگەدا ، لە ماڵدا ، لە کاتی ئیشکردنداو لە هەموو جێگایەکدا هەر دەنگی گۆرانی وتنی کرێکارو ماستاو فرۆشو لایلایەی دایك بەرزئەبێتەوە • گۆرانییان زۆرە ، وەکو گۆرانیی خۆشەویستیو شەڕو هەڵپەڕکێ کە بە دەنگی شوان یاخود کەیبانووی ناوماڵ ئەوترێن • هەروەها (لیسکۆت Rlescot

باسێکی جوانی گۆرانیی پایزی کردووە [پێ‌هیزۆك] • لەسەرەتادا پێ‌هیزۆك جیاوازیی نیە لەگەڵ دروست بوونی هەستە خەڵەتێنەرەکانی‌تردا ، بەتایبەتی لە مەسەلەی گۆڕانکاری‌یەکاندا (خۆشەویستییەکی بێ‌هیوا ، لێك‌جیابوونەوە ، پەیمانی ئەوانە)و ئەمانە هەموویان کراون‌و نموونەن • هەروەها ئەو ڕێگایەی کە لە گفتوگۆی نێوان دوو خۆشەویستدا بەکار ئەهێنرێت • شتێکی ئاسایی‌و سروشتییە کە لە چوارچێوەیەکداو خۆی لەخۆیدا ڕادێت‌و ئاوازێکی تایبەتی ئەدرێتێ ، هەمــوو دێڕە هەڵبەستێك بە بانگ کردنێکی کورت بۆدیمەنێکی پایزانە دەست پێ ئەکات، کە مەلوولی‌و بێ‌هیوایی ئـەهێنێ بۆ شاعــیرەکە • ئەم چیــاکانی داپۆشیوە ، دۆڵەکان پڕن لە ئاوی تاوە بارانەکان کە یەکــەم جار ئەبارێن‌و ئاوەکانیان قەڵبەزە ئەبەستن •

بەفریشــ لوتکــە بەرزەکــانی گرتــوەو نزیك ئەبێتــەوەو کۆچەرەکانیش دەوارەکــانیان ئەپێچنــەوەو لەوەرگاکانی هاوین بەجێ ئەهێڵــن‌و ئەچنە پەنای دەشــتەکان • دەوارنشــینەکان لە چیاکان دێنە خوارەوە بۆ ئەوەی لەباوەش دۆڵەکاندا بحەوێنەوە • تا ئەوەتا لــەزەتی ڕۆژە جوانەکــان کۆتــایی هات‌و پاشــماوەی شەیدایی‌و خۆشەویستیش دەرکەوت ، ئەمە کاتێ ماڵ‌ئاوایی‌یەو بەداخەوە کە نەتوانرا دان بەهەموو شتێکدا بنرێت‌و بوترێت •

ئەمە گۆرانیەکی کورتەو ماوەی ســی ساڵە لەبەرم کردوە ، دەربارەی (مریەمۆك)ەو مانای مریەمە بچوکە یاخو مارییت • کە پڕیەتی لەزیرەکی‌و لێ‌هاتویی •

ئەم گۆرانیەش هەروەکو بەشی زۆری گۆرانیە کوردیەکانی تر گفتوگۆی نێوان جوانێك‌و زەرنگەرێــکە ، جوانەکە داوای لێ

ئەکات گوڵێکی ئاڵتونی بۆ دروست بکات ، وەکو ئەو گولانەی ژنان ئەیکەنە کونە لوتی چەپیانەوە * •

ـ هۆ لالە سەید حەننا ، گوڵێکی ئاڵتونم بۆ دروست بکە •
بە مەرجێ بە مقاش نەیگریتو نەیخەیتە سەر دەزگا * •
بە چەکوشیش لێ‌ی نەدەیت •
پشت بە خوا پەشیمانیش نابمەوە •
ـ گوڵە ئاڵتونەکەتت بۆ دروست ئەکەم •
بێ‌ئەوەی بە مقاش بیگرم •
بێ ئەوەی بیخەمە سەر دەزگا •
بێ ئەوەی بە چەکوش لێ‌ی دەم •
پشت بە خوا پەشیمانیش نابیتەوە •
ئەگەر دوو ماچم بدەیتێ •
ـ باشە ، بەبێ بایی ماچەکە ، ئەگەر ئەمانەم بدەیتێ •
حەوت گاگەل •
حەوت ڕان بزنی موولول •
حەوت پارچە زەوی •
حەوت ئاش •
حەوت ئاش کە کەر بیان گێرێت •
حەوت پەرداخ شیری چۆلەکە •
ئەمە هێشتا هەرزانەو بێ‌نرخە ! • • • •

فۆلکلۆری کوردی لەچیرۆکدا وەکو گۆرانی دەوڵەمەند نیەو منالآنیان حەز لە سەرگورشتە ئەکەن •

---

★ ئەم جۆرە گولە کە ئەکرێتە کونە لوتی چەپەوە ، هەر لەکۆنەوە لەکوردەواریدا باو بووەو هەتا ئێستاش لەزۆر ناوچەو ناوەندی جافیەتیدا هەر باوەتی‌و پێ‌ی ئەڵێن [لوتەوانە]و جیاوازیشی نیە ئاڵتون بێت یاخود زیو •

★ دەزگا ئەو پارچە ئاسنەیە کە ئاڵتونچی‌و ئاسنگەر شتەکانیانی لەسەر ڕێك‌و پێك ئەکەن ، یاخود چەکوش‌کاری لەسەر ئەکەن •

ئەو هۆزانەی کە ڕۆشنبیریان ناوەندیە هەتا ئێستاش هەر بە سادەیی ی خۆیان ماونەتەوەو هیچیان لا خۆش نیە بە قەدەر چیرۆکێکی خۆش کە خەمو پەژارەی نان پەیدا کردنی ڕۆژانەیان لەبیر بباتەوە. چیرۆکێکی زۆر خۆشیان هەیە کە باسی جوانیەکانی سروشت یاخود دروست بونی شێوازە سەیر سەیرەکانمان بۆ ئەکەن . ئەتوانم باسی چیرۆکی ئەمیری بادینانتان بۆ بکەم کە کچە خۆشەویستەکەی خۆی لەدیوارێکدا بەستەوە ، لەکاتی دروست کردنی پردی زاخۆدا ، کە هەتا بە گیان لەبەر قوربانیان بۆ نەدایە ڕانەئەوەستا .

هەروەها بینگول خاوەن هەزار دەریاچە ، کە هەرگیز سەرچاوەی ژیانی هەتا هەتای تیا نادۆزرێتەوە .

لێسکوت لەسالی ١٩٤٠دا کۆمەڵێك چیرۆکی پڕ لە ڕوداوی سەیرو جوانی هەمە چەشنەی بلاو کردەوە،وەکو چیرۆکی ئازایەتی کەچەڵ [کەچەلۆك]و چیرۆکی سلێمانی زەندی‌و هیرزمی گوێ درێژو حاجی بیرم .

کوردەکان تەنها بۆ خۆشی سەرگورشتە ئەگێڕنەوەو هەمیشەش چیرۆكو بەسەرهاتی کورت کورتن . کوردیش لەگیانی داهێناندا لەهیچیان کەم نیەو ئەوانەشی سەریان لەکوردستان داوە بە میوانو گەشتەوەرەکانەوە بەڵگەیان لەسەر ئەمە هەیە .

ئەو کوردانەی کە سوحبەت چین لەشێوەی چیرۆکی هەجویدا ڕەخنە لە لادانو هەڵەی هاوڕێکانیان ئەگرن بە تایبەتی ئەو هاوڕێیانەی کە پەیوەندی قولیان لەگەڵیاندا هەیە .

بۆ نمونە پیاوانی سەر بە قەشەو شێخو مەلاکان هەمیشە وان بەسەر دەمەوەو لەبەر دەستتان . هەندێ جاریش زۆر بە توندو تیژی ڕەخنە ئەگرنو زۆرجاریش هەیە کە ئەو نوکتەیەی ڕەخنەی

پێ گیراوە هەر ئەمێنێتەوەو هەموو کات ئەیگێڕنەوەو ئیتر هەر لە خۆیانەوە وا ڕاهاتون کە بیر لە سەرگورشتە ڕێک خراوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بکەنەوە • زۆر بە ئاسانی جنێو بە سەرۆکو ئەندامی هۆزەکانی دراوسێیان ئەدەن • هەروەکو هەموو وڵاتەکانی جیهان هەموو شارو دێیەك ناوو ناوبانگی خۆی هەیە ، هەروەها لە کوردستاندا هەنـدێ هۆز بـە ئازایـەتیو بەغـیرەتی ناوبانگ دەرئەکەن • لەکاتێکدا کەهۆزیتر هەیە بەهۆی گاڵتەو سەرگورشتە گێڕانەوەی هۆزەکانی ترەوە زیـانی لێ ئەکەوێت • بـەوەی کە هەندێ جار لۆمەو گاڵتەیـان پێ ئەکەن ، بەڵام ئەگەر ئەوانـەی پێیان پێ ئـەکەنن پیاوی باش بوون ئەوە ئیتـر قەی ناکات • ئەو سەرگورشتانەی کـە کوردەکان ئەیانزانن سەرگورشـتەی گیان لەبەرانن ، هەرچی گیانلەبەر هەیە تیایاندا باس ئەکرێن ، ئیتر ئەمانە کەشتیەکی نوحی جیاوازی پڕ لەژیانی تـرن ، مار هەندێ ئیشی خراپو ناپەسەند ئەکاتو شەیتانیش نازی بەهەشتی سەر زەوی ئەداتێ • شێرو ورچو گورگ ڕەوشتو کەموکوڕەکانیان بۆ بەهێزیو گەورەیی یاخود ترسـنۆکیو هەڵخەڵەتاندن بەکار ئەهێنن ، لەمانـە هەموویاندا هەڵبژاردەی ئـەدەبی کۆن ئەبێتەوەو ڕێـوی دەریـان ئـەهێنێت هـەر وەکـو ئـەوەی کـە ئەیبینـین لەگەڵ گورگو شێردا تێ ئەکۆشێت • کەڵەشێرو کەرو کونەبەبوو ژیشکو کەو مشکو کیسەڵو هەژدیها ، هەمیشە ڕێوی هەوڵ ئەدات کە بیان خەڵەتێنێ ، بەڵام ئـەم گیاندارە فێڵبازە هەمیشـەش لە هەوڵەکانیدا سەر ناکـەوێت ، یان هیچ نەبێ بەسـەرهاتەکان بە گوێرەی حەزو فێڵەکانی ئەو ڕونادەن •

شا سلێمان دەست ئەخاتە مەسەلەکانیانەوەو لەئیشو کـارو هەڵسوکەوتیاندا بەدەنگیانەوە دێت • باڵندەش وەکو نموونەیەك کەڵکی هەیـەو لێرەدا ئەگەر ویستمان هاورێ ڕاستەقینەکان کە هەمیشە دڵسـۆزن بزانین ، نابێ بەهیچ جۆرێك بیر لـە ڕیشۆڵەو حاجی لەقلـەقو پۆڕو تەنانەت کـەویش بکەینەوە ، بـەڵام قەلە ڕەشکە ئـەبێ بـیری لێبکرێتـەوە چونکە ئـەم تایبەتی نیـە بە وەرزەکانەوەو لە ڕۆژە ناخۆشەکانیشدا بەجێمان ناهێڵێت •

لەم هەمـوو سەرگورشـتانەدا پەندێکمان بـۆ دەرئەکەوێت لەسەر شێوە چاکەکەی لافۆنتێن ( Lefontaine ) هەتا ئێستا جۆرە بچووکەکان نەبێت باسی هیچمان نەکردووە • خۆ ئەگەر توانای باسکردنم هـەبێت ئەوا ئەڵێـم گۆرانییە کورتـەکان لـە چەند پارچەیەك تێئاپـەڕنو هەمـووان هـەر ئەیانڵێـن ، هەروەهـا سەرگورشتە کورتـەکانیش ئەوانـە نەبێت کـە [لیسکوت] چاپی کردوون بیرکردنەوەی زۆریان ناوێتو ئەوانیش هەروان •

بەڵام ئەدەبی میللی کوردەواری ماوەی زۆرەو هەر گۆرانی ئەڵێو سەرگورشـتە بـۆ خۆشـەویستی ئەگێڕێتـەوە ، هەروەها ڕاستیی ڕووداوەکان بە خەیاڵکـردنەوە دێنێتە پێشـەوە ، وەکو بەسەرهاتی شەڕی هۆزەکان بە گۆرانی یاخود ڕێکخستنی پارچە هەڵبەستیوا کە لەگەڵ سەرگورشتەکاندا تێکەڵاوبوون •
سەرگورشتەو هەڵبەسـتە کوردییـەکان گۆرانیبێـژی میللی (شایەر) ئەیانڵێـن یاخود ئەیانگێـڕنەوەو ئەمانە تایبـەتین بەم ئیشەوەو ژمارەشـیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەم ئەبێتەوەو حیکایەت خوانو دەنگبێژیان پێئەڵێن •

ماناکانیان بە گێڕانەوەی سەرگورشتەکە دەست پێئەکات کە لە شێوەی پەخشانو شیعردایەو هەر کە گەیشتە قسەی یەکێك لە

پاڵەوانەکانی سەرگورشتەکە ئەوا قسەکان لە شێوەی شیعردا بە گۆرانیەوە ئەگێڕنەوە ۰

ئەگەر گۆرانی بێژەکان لەیەکێ زیاتر بوون ، ئەوا یەکێکیان چیرۆکەکە ئەگێڕێتەوەو ئەوانی تریش دەوری پاڵەوانەکانی تری چیرۆکەکە وەرئەگرنو هەرکەسەیان بە گوێرەی شیعری دەورەکانی خۆیان گۆرانی ئەڵێن ۰

بەشێوەیەکی گشتی چیرۆکو ئەفسانەکانیان لەشێوەی پەخشانو گۆرانیدان یاخود بە کێشو سەروا ڕێك خراونو ئاوازەکانیشیان هێواشن ۰کامەران بەدرخان ئەڵێ :ــ لەپارچەیەك لەپارچەکانی ئەم شێوەیەدا گۆرانی بێژ بە کێشو سەروایەك دەست پێ ئەکاتو ئیتر بەردەوام ئەبێت هەتا تەواوبوونی پارچە شیعرەکە هەموو جارێ کە ئەوەستێت وەستای شیعرەکە دێتە پێشەوەو بەردەوام ئەبێت لەسەری ۰ قوتابخانەی ڕاستەقینەیان هەبووە بۆ گۆرانی وتن ، ئەویش بە هاندانی ئاغاو سەرەك هۆزە ژیرەکان ۰ بەڵام ئێستا ژیانیان زۆر گۆڕاوەو شایەرە ڕەسەنەکانیان بەرەو نەمان ئەچن لەگەڵ ئەوەشدا هەر هێشتا هەندێ بابەت بڵاو بونەتەوە کە بە سەرچاوەی دەوڵەمەند دائەنرێن کە بۆ خوێندنو گێڕانەوەی مێژوویی هەرگیز ناتوانرێ وازیان لێ بهێنرێت وەکو مێژووی کورتە چیرۆك ، سەرگورشتەی هۆزەکان ، خووڕەوشتی کۆنی کوردەواری ، شێوەکانی خواپەرستیو ئاینو بیروباوەڕ یاخود شتی پڕو پوچ ، شێوەی سوێند خواردن، ناوی تایبەتی چەكو کەلوپەلی کۆن ۰ ئەمانە هەموویان زۆر بەکەڵك دێن ، هەروەها لە بینینی هەڵوێستە جۆراو جۆرەکانیشدا نمونە هەر زۆرە ۰

نیکیتینیش ئەم لێکۆڵینەوەیەی کردووە (سەیرکـردنی ڕاو شەڕەکانیان ، داواو داخوازی خۆشەویستی ،یەك نەگرتنی هەستی شـاخاوی‌یەك‌و دەشت‌نشـینێك ، شـتی پـڕو پـوچ ، پێ‌ناسـی کارەساتەکان وەکو (لافاوی دەشتەکان‌و ڕەشەبا) تێ‌بینی سـەیر سەیر لەئاینی خوایەتی بونەوەردا(٢٦) (Pantheism) ، (نوێژ کردن بۆ چۆلەکە یاخود ئەسپ یاخود بەفر) ئا لێرەدا توشی هاندەری جۆراو جۆر ئەبین ، کە هەر یەکەیان بە جیا بەلای ئێمەوە شایانی گرنگی پێدانەو کەرەسەی بیرکردنەوەن •

وە شتێکی ئاسایی‌یە کە گەنجینەیەکی گەورە ئامادە کراوە بۆ ناسینی چۆنیەتی بیرو هەستی گەلی کورد •

ماوەمان نیە کە باسـی هەموو سەرگورشـتە چاپکراوەکان بکـەین ، بەلام با بە ناوبـانگ ترینیان دەسـت‌نیشان بکەین ، زۆرجار لە ڕاستیدا ئەم سەرگورشتانە زۆر جوانن• بێ‌هیوایەك لە ناخی چەوسانەوەی ڕۆژانەیـەوە ئەیەوێت خەیاڵـە بەتاڵەکـانی جێ‌بەجێ بکات : ـ برسیەتی تێرکردن گۆڕینی جلە پیسـەکانی‌و خێوەتە خراپەکەی کە بە هیچ جۆرێ بەرگەی با ناگرێت، ئەیەوێ لە پرۆژەکانیدا سەرکەوێ‌و ئەو ئافرەتەی ئەیەوێت مارەی کاو منالی جوانی ببێت •

بەلام هەی هات : ـ ڕاستیەکەی زۆر گرانەو ئەبێ بـڕوا بە سەرگورشتەیەك بکات کە پاڵەوانەکانی بەهۆی سەخاوەتی پەریە باشەکانەوە توشی بەختیاری ئەبن • کەواتە ئەمانە چەند ژەمێکی یەکجار قەشەنگن لەباخچەی بەهەشتدا ، جلوبەرگی حەریرو زێڕو زیوی بەنرخ ، کۆشکی پڕ لەئاڵتون‌و دەوڵەمەندی ، خۆشەویستی‌و گۆرانی‌و پێکەنین لەگەڵ جوانترین کیژۆڵەدا • سەرکەوتنی هەتا هەتایی بەسەر ئەو تەنگو چەڵەمانەدا کە دەستی قەزاو قەدەر یاخود

---

(٢٦) ئاینی ئەوانەی کە ئەڵێن خوای تەنها خوای هەموو بونەوەرە •

پیاو خراپ لەرێگای بەختیاریدا دایان ناون • تا بەم شـێوەیە لە وشەو رستەی هەموو سەرگورشتە خۆشەکاندا رازاونەتەوە • هەر بەم شێوەیە خەیاڵی وا جۆراوجۆر ئەکرێتەوە کە ئەوپەڕی نەبێت•

وە لەم ڕووەوە چیـرۆکی میللی مـەم‌وزین‌و سەرگورشـتەی فولکلوری مەمی* ئالانیان هەیە کە لەوانەیە بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی سەدەی چواردەو پانزە •

دوای ئەوە ئەو سەرگورشتانە یەن کە بەتەواوی شێوازێکی شوانیەتی‌یان هەیەو هەروەها ئەو کوردەی کە گرنگی ئـەدات بە چیرۆکی پەریەکان‌و بەو سامانانەی کە بەشێوەی سەرسووڕهێنەر بە دەست هاتـون‌و هەروەها بەختیـاری بێ‌خاوەن کە لەزەریـدا ئەدرابێـت‌و هەر لێرەشـدا گرنگی ئـەدەن بەو چیرۆکـانەی کە ڕووداوەکانیان خۆشیان ئەختێـك لەمانە کەمترن ، بەڵام هەستی مرۆڤایەتی بۆ خۆشەویستیەکی دڵسۆزانە دەر ئەبڕێت‌و کار ئاکاتە سەر شەرەف‌و ئازایەتی لەهەموو ناخۆشیەکانیدا •

بە کوردی زۆر حەز لە گۆرانیە شوانیە دڵداریەکـان ئەکەن کە ئەمیش لەکێش‌و سـەروادا لەوانی تر کەمتر نیە • هەروەهـا زۆر بەتاسەوە گوێ لەسەرگورشتەی دڵداری‌و خۆشەویستی زلێخاو فاتول‌و شیرین‌و خەسرەو شـیرین‌و فەرهادو لەیلێ‌و مەجنـون‌و خەج‌و سیامەندو خورشیدو خاوەر ••• هتد ئەگرن • هەروەهـا ئەم چیرۆکانە لە ئەدەبی فۆلکلوری ئێرانی‌و تورکی‌و ئەرمەنیشدا هەر هەن •

دوای ئەمانە باسی چیرۆکە مێژووییەکان ئەکەین کوردەکان لەژیانیاندا بەسۆزن‌و لەڕاستیشدا جەنگاوەرن‌و مێشکیان پڕە لە

---

★ مەم‌وزین هەر مـەمی ئالانەو ، ئەحمـەدی خانی زۆر دیمەنی ئەفسـانەیی لە چیرۆکە فۆلکلۆریـەکەدا گۆڕیوەو بە لووتکەی ئەدەبیاتی کلاسـیکیی کوردی دائەنرێت کە بە شێوەی کرمانجیی سەروو نووسراوەتەوە •

شەڕوشۆڕی پاڵەوانە نەمرەکانی مێژووی ئێرانی کە گێڕامانەوە، بە گێڕانەوەی جەنگەکانی تۆڵە سەندن زۆر دڵخۆش ئەبن و هەموو هێرشێکیش هەڵبەستێکی تایبەتی خۆی هەیەو هەموو جەنگێکی ئێوان هۆزەکانیش بە گۆرانیەکی تایبەتی بەناوبانگە ، وەکو ئیشە چاکەکانی شێخ مەحمود کە لە هەڵبەستی شاعیرە ڕاستبێژەکاندا هەیەو لەگەڵیشیدا ڕوداوەکانی باس ئەکەین : شەڕی ئازادی (Şerê Azadî) کە ساڵی ۹٤٦ لە بەیروت چاپ کراوە · هەمیشە هۆ هەبوە کە کوردەکان حەز لە سەرگورشتەی کۆن بکەن · بۆ نمونە سەرگورشتەی قەڵای دم دم (DimDim) کە یەکێکە لەچیرۆکە بەناوبانگەکانی کوردو باسی ئەوە ئەکات کە کوردەکان لەساڵی ۱٦۰۸داو ئەدژی شا عەبباسی یەکەم گەمارۆی ئەو قەڵا قایمەیان داوە ·

هەروەها کوراوغلو ــ Koraglu ــ یەکێکە لەپاڵەوانە ئەفسانەییەکانیان کە بە دۆستی هەژارو داماویان داناوە · بەڵام جولندی ــ Julindî ــ ئەو پاشا میتالیەیە کە لەگەڵ شەیتاندا یەکی گرت بۆ بەرهەڵستی موسوڵمانە لێهاتوەکان ·

ڕۆستەمیش گەلێ شەڕوشۆڕی هەیە لەگەڵ زورروو* Zoraw زەردە هەنگدا (Zerdeheng) * هەروەها عبدالرحمن بابانو عیزەالدین بەدرخان ئیشە باشەکانی [نادر وتوپاڵ]و دوانزە سوارەی مەریوانیان باس کردوە ·

لیستەی تۆماری ئەم چیرۆکانە درێژە، لەگەڵ سەرگورشتەو چیرۆکە فۆلکلوریەکان کە شەخسیاتی مێژوویی دروستیان ئەکات وەکو خەلیفەو سوڵتانو پاشاکان · بەڵام ئەو شەڕو شۆڕەی کە تیایاندا

★ ڕەنگە لێرەدا نوسەر مەبەستی لە زۆراب بێت چونکە لە کوردەواریدا بە ڕۆستەمو زۆراب بەناوبانگە ·

★ ڕەنگە زەردەهەنگیش دێوی مازندەران بێت کە گوایە ڕۆستەم لەگەڵیدا جەنگاوە ·

باس ئەکرێن بە تەواوی ئەفسانەیین‌و شەخسی یەکەم جێگایەکی فراوانی تیا وەرئەگرێت ٠

هەروەها ئێستاش (مەکەنزی D.N. Mackenzie) زانیارییەکی باشمان ئەداتێ کە شێوازێکی میللی ڕاستەقینەی تیایە زۆر بەلەزەتەو باسی ئەو شتانە ئەکات کە زانیاریی کۆمەڵایەتیان تێدایەو کوردەکانی سۆڤیەت بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی بنەڕەتی ئەم گەنجینە زانیارییە بەکار ئەهێنن بۆداستانە کۆنەکان‌و پیائەچنەوە بۆ ئەوەی لە شێوەیەکی یەکسان‌و یەکگرتوودا بیانپارێزن ٠

لێکۆڵینەوەیـەکی ئاوا هیـچ پەیوەندییـەکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی نیـە لەگەڵ دەوڵەتەکانی‌ترداو لەوانەشە بـەس نەبێت بۆ تازە کردنـەوەو زیادکـردنی ئـەدەبی کوردی ٠ بـۆ پێشخستنی خوێندن‌و نووسین گەلێك پێویستە کـە ئەدەبی سەرزارەکی پشت گوێ بخرێت یاخود چاوی پیا بخشـێنرێتەوەو ڕاست بکرێتەوە ، ئەو کاتـەش بەقەدەر ئەوەندەی کە شێوەی باشی تیایـە لە زۆریی ڕاستیی‌و کـەمی جووڵاندا لـە تەڕی‌و بنەڕەتـەکەی ون‌ئەکات ٠ بەهۆی پەیدابـوونی ترانسستۆرەوە لە بچووکترین لادێـداو بە گوێرەی پێویستی‌و بەکەڵکی ـ تا ڕادەیەك شایەرەکان نەماوون٠ ئەمەش یەکێکە لە دیاردەکانی پێشکەوتن‌و بەربەستی لێ‌ناکرێت‌و پەشیمانیش کەڵکی نیە ٠

## ٣ ـ ئەدەبی تۆمارکراو یاخود کۆن :

## لە سەرەتاوە هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی :

با لێشاوی ئـەدەبی فۆلکلۆری ئـەوەمان لەبیر نەباتـەوە کە کە لە سـەد ساڵەوە نەبێ پێمـان نەزانیوەو زانینـەکەش بەهۆی لایەکیش لە سامانی ئەدەبی نووسراو بکەینەوە ، کە تەنها نزیکەی ئیشوکارە باشەکانی ڕۆژهەڵاتناسی پۆلۆنی ( ژابا ـ A.jaba بووە کە مۆمی سەری ڕووسیا بووە لە ئەرزروم ٠ هەر لەوکاتەوە

لێکۆڵینەوە بەردەوام بووەو زانیاریی ئێمەش فراوانترو قووڵتر بووە ٠

دەنگوباسێك وای ئەگەیاند کە باسێکی گرنگ دەربارەی ئەم بابەتە لە مۆسکۆدا هەیەو ئێمەش هەر چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئەو باسەین٠ بەڵام ئەو باسەی کە هەتا ئێستا تەواوبووە باسەکەی عەلائەدین سجادییە بەناوی (مێـژووی ئەدەبی کوردی)و ساڵی ١٩٥٣ لە بەغدا بە زمانی کوردی چاپکراوە ٠ ئەمە پەڕاوێکی گەورەی ٦٣٤ لاپەڕەییەو دانەر دوای نووسینی پێشەکییەك دەربارەی کوردو کوردستان باسی تۆناخو شێوەکانی ئەدەبی کوردی ئەکات ٠ دوای ئەوە چەند تێبینییەکی قووڵمان ئەداتێ دەربارەی ٢٤ شاعیرو ٢١٢ دانەرو نووسەر لەشاعیرەکانی عێراقو ئێران ٠

دانەر باسی ئەو نووسەرانە ناکات کە پەخشانیان نووسیوەو ئەم باسەی هەڵگرتووە بۆ بەرهەمێکیترو لێرەدا گومانی تیائەبێت لەوەی کە من نیازم هەبێت ئەم باسە بەدرێژی تۆمار بکەم ، بەڵام سەری کەسیش سوورناهێنم بەوەی کە بڵێم لەو کۆمەڵە پیاوە ئەدەبیانەدا پیاوە ئاینییەکان جێگایەکی فراوانیان داگیر کردووە٠ ئەمەش شتێکی ئاساییو ڕوونەو هەر لە سەردەمی نەوە کۆنەکانەوەو لە هەموو وڵاتەکاندا ئاینو زانیاریو شیعر لای نووسەرەکان تێکەڵاو بوون ٠ بەم شێوەیەو لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوشتە ئاینییەکانیان لەو لیستە درێژانەدا باس نەکراوونو تەنها هەر ناوی (٥٠) مەلاو (٣١) شێخو (٣) سەییدو (٤) فەقێ یاخود مجەوەری مزگەوتی تیایە لەگەڵ ناوی (٩) خانو (٣) سەردارو (١١) بەگو (٥) ژندا ٠

چۆنیەتی دروست بوونی ئەدەبی کوردی هەر بە نەزانراویو نەسەلماوی ئەمێنێتەوە ٠ لەڕاستیشدا مێژوونووسەکان هەمیشە

ڕێك ناكەون لەسەر ئەو مێژووانەی كە بۆ هەندێ شاعیر دانراون٠
بە شێوەیەكی گشتی نووســەرە كوردەكان حەز ئەكەن بچنە ناخی ڕابوردووەوە ، كە هەمیشە سەلماو نیە ٠ هەروەها لە دانانی ساڵو خاوەنی هەنــدێ شــیعرو نووســیندا وەكــو (سوتسین) كە سەرگورشتەی دمدم بە نووسینی مەلا ئەحمەدی باتی* (١٤١٧ ـ ١٤٩٥) دائــەنێت ، ئەمەش شــتێكی نەگونجاوە چونكە لــە ساڵی ١٦٠٨دا ڕوویداوە ٠ هــەروەها چــۆن ئــەبێت (فــەقێ تەیران (Fegiye Teyran) ) كــە لــە ســاڵی (١٣٠٧ـ١٣٧٥)دا ژیاوە لاوانەوە دابنێت بۆ مردنی مەلای جەزیری (Melay Gaziri) كە لە ساڵی ١٤٨١دا كۆچی دوایی كردووە ٠
لە لایەكی ترەوە چۆن بڕوا بكرێت بەوەی كە عەلی تەرمۆكی (Eli Termuk) (ڕۆنساری كورد)(٢٧) لەسەدەی پانزەهەمدا ژیاوە، سەرەڕای ئەمەش ژمارەیەك لە مێژوو نووسەكان هەر نەیانزانیوە چونكە ئەوانەی لێیان دواون دووبارە كردنەوە نەبێت هیچی تریان نەكردووە ٠ بــە تەنها لێكۆڵینەوەیەكی كارامانە لــە موفرەداتو شێوەكانیدا مــاوەی ئەوە ئەدات كــە مەسەلەكە بیبڕێتــەوە ٠ ئەم نووسراوە ڕەسەنانە لەكاتی تۆپبارانی بەرلیندا لەناوچوون ٠
بەڵا دوای ئەوە هەندێ نووســەری كورد لە تازە كردنەوەی بابەتی دانــەرە كۆنەكاندا هیچ دوودڵییان نەكردووە بــۆ ڕوون كردنەوەی ئەو شتانە لای خوێنەرە تازەكانو هەر بەو كارەشیان ڕێگای هەموو لێكۆڵینەوەیەكی ڕەخنەگرانە لە ئێمە ئەگرن ٠
لەگەڵ ئەوەشدا كە چوارینە سۆفی‌یەكانی بابا تاهیری هەمەدانی (٩٣٥ـ١٠١٠)بەزمانی تێكەڵاوو شێوازێكی كۆن نووسراونەتەوە

---

★ سەرگورشتەی دمدم ، عەرەبی شەمۆ نووسیویتی كە پیرترین نووسەری كوردە لە سۆڤیەتداو ژمــارەیەكی زۆر داستانو چیرۆكی لە بارەی ژیــانی كوردەوە داناوە ٠

(٢٧) ڕۆنسـار : شاعیرێكی فەرەنسی‌یە ٠

کوردەکان هەر بە ئەدەبی خۆیانی دائەنێن* ، وەکو گۆرانیەکانی تۆلەسەندن کە بەشێکن لە ئەدەبی فەرەنسی • بەڵام پێشەکی ئەبێ بە ڕاستەقینەوە خۆ ئامادە بکرێت بۆ ئەوەی ئەم چوارینانە بخوێنرێنەوەو کەڵکیان لێوەربگیرێت • ئەشسەلمێنرێ کە هەندێ لە شاعیرەکانی گۆرانی وەکو شێخ ئەحمەدی تەختیو (١٦٤٠)و مەلا مستەفای بێسارانی (١٦٤١ـ١٧٠٢)و گەلێکی تریش لەسەر ڕێگای ئەم ڕۆیشتوون •

هەرچۆن بێت تەمەنی ئەدەبی کلاسیکی کوردی لە سەدەی پانزەهەمەوە دەستی پێکردووە لەگەڵ پۆلێك شاعیری هەرەچاکداو بە چەند فرسەتێك لەپێش هەمووشیانەوە (شێخ ئەحمەدی نیشانی)یە کە بە مەلای جەزیری بەناوبانگە (١٤٠٧ـ١٤٨١)و دیوانێکی سۆفیانەی هەیەو یەکێکی ئاینی نەبێت کەس لێی تێناگاتو باسی سۆفیگەری تێرانی تیا ئەگێڕێتەوە ، دوای ئەوە (مەلا ئەحمەدی باتی) کە لەپێشەوە باسمان کردو بە پەڕاوی [مەولوودنامە] بەناوبانگە دوای قوتابخانەکەی ئەم کەوتووە •

هەروەها (عەلی حەریری ١٤٢٦ـ١٤٩٥) ، (میر محمد) یاخود (فەقێ تەیران) کە بە چیرۆکی [شێخی سەنمان] بەناوبانگە ، هەروەها (ئەسپە ڕەش) •

دوای بێکەسییەك کە زیاتر لە سەدەیەکی خایاندووە ، لە ئاسمانی ئەدەبی کوردا ئەستێرەیەکی تازە هەڵهاتووە کە

---

★ زۆر ئاشکرایە کە نووسینو شیعرەکانی بابا تاهەری هەمەدانی بەشێکن لە ئەدەبی کورد ، چونکە بابا تاهەر خۆی کوردە ـ بابا تایەر یەکێکە لە (اهل الحق)و ئەمەش تەنها لەناو کوردا هەیەو هەتا ئێستاش مجەورەکانی مەرقەدی بابە تاهەر کوردنو ئەڵێن ئێمە ئەم مجەوریەمان بە پشتاوپشت بۆ ماوەتەوەو وشەی باباش تەنها لەناو کوردا هەیە • جگە لەمانەش لوڕیەکان خۆیان بە کورد ئەزانن فارسەکان قاموسیان بەکار هێناوە بۆ مانای وشەی لوڕی ـ ▪ بەم بەڵگانەو گەلێکی تریش بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە بابا تاهیر کوردە •

( ئەحمەدی خـانی ١٦٥٠ـ١٧٠٦) بـووەو لە ڕەگـەزدا خەڵکی هەکاریەو دانەری چیرۆکی (مەم‌وزین)ە کە ئەتوانین بە تەواوی بە چیرۆکی نەتەوەی کوردی دابنێین • کـە باسی (مەمی ئالان)ی تیا ئەگێڕێتەوەو بە گوێرەی ڕێزمانی ئەدەبی کلاسیکی داینا‌وە •

[ ئیسماعیل بایەزید ١٦٥٤ ـ ١٧٠٩ ] کە دوای ئەو کەوتووە بێجگە لە غەزەل (Ghazel) فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسیی بە ناوی (گوڵزار Gulzar ) بە شیعر ڕێك‌خستووە •

هەروەها (سیاپۆش (Siyapoush) ) نازناوی شاعیرێکی‌ترە کە لە سەردەمی ئەودا بووە •

هەرچەندە سەدەی حەڤدەهەم گەشەدار نەبووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ناوی (شەریف خـانی جولەمەرگ ١٦٨٨ـ١٧٤٨) لە هەکاری دێنـین • هەروەهـا (مراد بایـزید ١٧٣٦ـ١٧٧٨)و (مـەلا Erwas ) کـە سـالی ١٧٩٠ چەنـد بەشێکی لـە لە پزیشکایەتی‌دا داناوە بە جۆرێك کە لە زمانی کوردیدا وێنەی نیە •

هەر لەو سەردەمـەدا ، پارچـە شـیعرێکی ئاینی بـە زمانی گـۆرانی بـڵاو بۆتـەوەو دراوەتـە پـاڵ ( خانـای قوبـادی Khana Qubadi ١٧٠٠ ـ ١٧٥٠ ) بـە نـاوی سـەڵەوات نامـە Selewatname ) ، هەروەها شاعـیری گۆرانی‌ی مەحزونی Mehzûnî لـە ١٧٨٣دا • لەگـەڵ سـەدەی نۆزدەهـەمداو هەتـا شەڕی یەکـەمی جیهانی شاعـیرەکان زۆر بـوونو دوو تەوژمیان لێ‌دەرکەوت : یەکەمیان تەوژمی ئاینیو سۆفی بوو کە لەسەرەتادا بە لاسایی کردنـەوەی ژمـارەیەك شـێخو مەلاکان تـەواو بوو ، ئەوانەی کە حەزیان ئەکرد زانیاریە سۆفیەتیەکان لە ناو شیعری دیوانەکانیاندا بنووسـنەوە ، بێ‌ئـەوەی لە دووبـارە کردنەوەو

لاسایی کردنـەوەی خەلکی‌تر بتـرسن • لێرەشـدا کارتێ‌کردنی شاعیرە کلاسیکیە ئێرانیەکان دەرکـەوت • ئەوەتا هـەر لەوانە (مەولانا خالید ١٧٧٧ـ١٨٢١) کـە ڕێگای نەقشـبەندی هێنایە کوردستانەوە ، هەروەها ( شێخ مەعروفی نۆدێی١٧٥٥ـ١٨٣٧ ) لەگەڵ بیست چاپکراوی ئاینیدا • دوای ئەوە (مەلا خەلیلی سەرتی ١٨٣٠)و (مەلا یەحیای مزوری) کە پرس‌پێکەری (میری ڕەواندزی) بووەو ١٨٢٦ـ١٨٣٩و نـورالدین بریفـکانی کە سـالی ١٨٤٦ کۆچی دوایی کردووە ، وە عەبدولرەحمـان ئەختەری ١٨٨٤ کە ڕێگای خـانی گرتـووەو لە شـیعرەکانیدا سـتایشی پێغـەمبەرو کوردستانی کردووە •

## کۆمەڵێك لە شێخەکانی سلێمانی :

(سالم ١٨٤٥ـ١٩٠٩)[٢٨] کە هاواری بوو لە دەست ناخۆشیی ژیان لەم‌جیهان‌و سەرزەویەدا • هەروەها (مەحوی ١٨٣٠ـ١٩٠٤) کەسۆفیەکی نەقشبەندی بووەو تیورەکانی سۆفییەتی دەرخستووە، حەریقیش Heria یاخود مـەلا صالح ١٨٥١ ـ ١٩٠٤ لەوەدا هەر لاسایی کردۆتەوە •

لە ئێرانیش تا بڵێی شاعیری چاك هەیە وەکو :

(سەی یاقو ١٨٠٨ـــ١٨٨١) کـە (٢٠ر٠٠٠) هەزار دێرە هەڵبەسـتی هەیـەو لـەو نووسەرانەیـە کە بـە زمانێـك زیاتر نووسیویێتی • (مەلا فەتاحی جەبـاری ١٨٠٦ـ١٨٧٦) هەڵبەستی بە چوار زمان داناوە : کوردی ، عەرەبی ، تورکی ، فارسی • لە داهێنەرەکانیش ، (مەولەوی) ، کە (مەلا عبدالرحیمی تاوگۆزیەو ١٨٠٦ـ١٨٨٢ بـیری تازەی هێناوەتـە کایەوەو شـیعرەکانی بە کێشی برِبرِ دانـاوە ، لە کۆتاییدا لـە سۆفی ناو حەقـەکان باسی

(٢٨) ڕاستیەکەی (١٨٠٥ـ١٨٦٩)یە نەك ئەوەی سەرەوە •

(تەیمور قولی) ئەکەین کە لە سالی (١٨٥٢)دا کۆچی دوایی کردووەو دوای ئەویش (تەیفور)و (دەروێش نەورۆز) لە دەوروبەری ١٨٧٥دا ٠

(مەلا ولدخان) چیرۆکی (لەیلو مەجنوون)ی* کوردیی داناوە لە ١٨٧٦ــ١٨٨٥ ، (ئەحمەد بەگی کۆماسیش ١٧٩٥ــ١٨٧٦) بە بۆنەی مردنی ژنەکەیەوە لاوانەوەیەکی کاریگەری داناوە* ٠

ئینجا تەوژمی دووەم کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوت :

**شیعری گـۆرانی بڵاو بووەوەو نیشتمان پـەروەریو چاکە کردن پەرەی سەندو تێمەش بە کورتی باسی ئەو کەسانە ئەکەین کە هاوبەشییان کردووە :**

**شا پرتەوی هەکاری ١٨١٠ ، محمد ئاغای جاف ، کە هەر لەو سەردەمەدا بـووەو بـە لاوانـەوەی خۆشەویسـتیو دۆستایەتی ناسراوە ٠**

**موستەفا بەگی ساحێبقەران کە بە (کوردی) ناسراوە ١٨٠٩ ــ١٨٤٩[٢٩] ٠ (سالم) کە عەبدولرەحمانی ساحێبقەرانە ١٨٠٠ــ ١٨٦٦[٣٠] ، (موفتی زەهاوی١٧٩٢ــ١٨٩٠) کە لە هەموو شتێکدا زانا بووە ٠ (وەفایی) کە میرزا عبدالرحیمە (١٨٣٦ــ١٨٩٢) ، (عبدالله بـەگی مصـباح ١٨٥٩ــ١٩١٢)* بە شـیعری گۆرانیو سۆفییەتیو نیشتمانپەروەری بەناوبانگە ٠**

---

★ یەکەمین شاعیر کە لەیلو مەجنوونی لـە ڕۆژهەلاتدا نووسـیوەتەوە (نظامی گەنجوی)یە بە فارسیو (فضولی بەغدادی)یە بە تورکیو گەلێ شاعیری فارسو تورکیی تـریش لاسـاییان کردوونەتـەوە ، (احمـد شوقی)ش بـە عەرەبی نووسیویەتی ٠

★ ڕەنگە مەبەست لەم لاوانەوەیە [گلکۆی تازەی لەیل] بێت ٠

(٢٩) ڕاستییەکەی ١٨١٢ــ١٨٥٠یە ٠

(٣٠) ڕاستییەکەی ١٨٠٥ــ١٨٦٩یە ٠

★ ئەمە عبداللە بەگی ساحێبقرانەو بە (مصباح الدیوان) بەناوبانگە ٠

(نالی) ئەمیش مەلا خـدری شارەزووریيە ١٧٩٧ـ١٨٥٥(٣١)
نیشتمانی کوردستانی گەلێك گەورە کردووە ٠

(حاجی قادر کـۆیی) ١٨١٥ ــ ١٨٩٢(٣٢) کـە پشـتیوانی ئاینی (اللاارادی) کردووەو ئاینەکەشی پڕی بووە لەهاندانی پێشخستنی ئەو زانیاریانەی کە دژی بێ‌ئاگایی‌و نەهاتنە کایەی ژیانی تازەی مەلاو شێخەکانەوە بوەو ئەم بەخۆپەرستو تەمەڵی ژیریی داەنان چونکە ئەم شتانە بوو بوون بەگیروگرفت لەرێگای ڕزگاری بیرو هۆشدا ٠

هەتا ئێستاش شیعرە نیشتمانیەکانی هـەر گەنجـە دڵ گەرمەکان ئەوروژێنێ‌و بەهۆی فەلسـەفە مادیەکەیەوە کـاری کردۆتە سەر بەشی زۆری شاعیرەکانی ئەمڕۆش ٠

بێ‌گومان ئەبێ بە تەنها باسی شێخ ڕەزای تالەبانی بکـەین ١٨٣٥ ــ ١٩١٠(٣٣) ، ئەمیش شەخسیەتێکی سەیری هەیەو حەز لە ئاینی (لا ارادی) ئەکات بـەڵام زۆر دڵگەرم بووە ٠ هەروەها هونەری (وتاردانی‌لەبەری) زۆر چاك زانیوە ، نەك تەنها لەزمانی کوردیدا بەڵکو لەزمـانی فارسیشدا ، شیعرە جنێویە کـورتەکانی زۆر بە تامن‌و زۆر جار قوڵی کردۆتەوەو ویستویەتی ڕەوشت چاك بکات بەڵام هەندێ جار توندی‌و خراپی‌ی بەکار هێناوە ٠ لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ئەمڕۆش یەکێکە لەو شـاعیرانەی کە لە عێراقدا جەماوەرێکی زۆری هەیە ٠

سەردەمی تازە : ــ لەساڵی ١٩٢٠ وەهەتا ئەمڕۆ ٠

کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی بوە هۆی گۆڕانێکی زۆر لەڕۆژهەڵاتی نزم‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتدا ، چونکە بوە هۆی

---

(٣١) ڕاستی‌یەکەی (١٨٠٠ـ١٨٥٦)ە ٠
(٣٢) ڕاستییەکەی ١٨١٥ـ١٨٩٧ ە ، کورتەی ئەو ئاینەش ئەوەیە کە ئەڵێ زیری [عەقل] هەموو شت نازانێ ٠
(٣٣) ڕاستییەکەی ١٨٤٢ـ١٩١٠یە ٠

دامەزراندنی چەنددەولەتێکی تازەو جیابونەوەیانلەئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەڵوەشاو ئەمە کارێکی کەمی نەکردۆتە سەر ئەدەبی کوردی • لەو کاتەدا قوستەنتینیە بنکەی ڕۆشنبیری کـوردەکان بووە،گەلێ ڕۆشنبیری تیاکۆبۆتەوەو ویستویانە کە نوسراوەکانیان لەوێ چاپ بکەن • لەدواییدا عیراق‌و بەتایبەتی لەپایتەختــدا کە بەغداد بوە بوەتە جێگای گــرنگی ئەوانە ، بەڵام نەك تەنهــا بۆ ئەدەبی کوردی •

ئەگەر تێکۆشانی دلسۆزانەی ئەو کەسانە نەبوایە کە گۆڤارە کوردیەکانیان دەر ئەکــرد ئەدەبی کوردی بــەرز نەئەبوەوەو دەر نەئەکەوت •

چونکە نوسینی شاعیرە کۆنەکان بڵاو کرانەوەو گەنجەکانیش توانیان ئارەزوەکانیان دەر بخــەن • لەکۆتایی دوژمنــایەتیدا ، ڕۆژنامەگەری‌و گۆڤارە کــوردیەکان زۆر بە ئاســانی لەعێراقدا توانیان کە دەســتێك بە خۆیاندا بهێنن ، بنکەکانیشــیان بەغداو سلیمانی بوە بەتایبەتی کە سلیمانی بنکەی نەتەوایەتیان بووە ، هەروەها ڕەواندزو هەولێریش • داخەکەم کە بە تەواوی ناتوانرێ لیستەی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە بنوسرێت چونکە بە بەردەوامی نەبوون • بەڵام بەهۆی نرخی ئەدەبو کۆمەڵایەتیانەوە ناتوانین هەروا بە سەریاندا تێپەڕین •

(ژین)* ڕۆژنامــەیەکی هەفتانەیەو هەر لەســاڵی ۱۹۲٤ وە بەردەوام لەسلیمانی دەرئەچێت •

(گەلاوێژ) لەســاڵی ۱۹۳۹ وە هەتا ساڵی ۱۹٤۹ لەبەغــداد دەرچوە • (هەتاو) لەساڵی ۱۹٥٤ ەوە لەهەولێر دەرچوە •

---

★ ڕۆژنامەی [ژین] بەردەوام بوو هەتا ساڵی ۱۹۷۲ ، بەڵام لەوە بەدواوە لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی وەستا • لێرەشدا ئەڵێم نازانم نوسەر بۆچی باسی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان)ی نەکردووە کە لە ۲۲ی نیســانی ساڵی ۱۸۹۸ لە قاهیرە دەرچووە •

له یەریڤان له ئەرمینیای سـۆڤیەتی ڕۆژنامەی (ریاتازه) له ساڵی ۱۹۲۹ وه دەرچوه •

(کوردستان) لەساڵی ۱۹۵۹ وه هەتا ساڵی ۱۹٦۳ له ئێران دەرچوه •

برایانی بەدرخان لەدیمەشق لەساڵی ۱۹۳۲ وه وه هەتا ساڵی ۱۹۳۵ (هاوار)و لەساڵی ۱۹٤۱ وه هەتا ساڵی ۱۹٤۳ روناهیان دەرکردوه •

(ڕۆژی نوێ) لەساڵی ۱۹٤۳ وه هەتا ساڵی ۱۹٤٦ لەبەیروت دەرچوه •

پارتی دیموکراتی کوردی(۲٤) له عیراق هەر لەساڵی ۱۹٥۸ەوه ناو به ناو ڕۆژنامەی (خەبـات)ی بڵاو کردۆتەوه لەم کاتەشـدا ئەدەبی کوردی سەربەست نیه تەنها له عێراقو یەکیەتی سۆڤیەت نەبێت ، با بزانین لەو دوو وڵاتەدا لەچیدایه •

---

(۲٤) مەبەستی له (پارتی دیموکراتی کوردستان)ه •

★ ئێستا له عێراق ئەم گۆڤارو ڕۆژنامه کوردییانه دەرئەچن :
۱ ــ ڕۆژنامەی هاوکاری ــ هەفتانەیه •
۲ ــ گۆفاری بەیان ــ مانگانەیه •
۳ ــ گۆفاری ڕۆشنبیری نوێ ــ مانگانەیه •
٤ ــ پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق ــ مانگانەیه •
٥ ــ گۆفاری نۆتۆ زمی ــ ناوبەناوه •
٦ ــ گۆفاری هۆشـیاری کرێـکار ــ چوار تا شەش لاپـەڕەی به کوردییه ــ هەفتانەیه •
۷ ــ ڕۆژنامەی دەنگی جوتیار ــ یەك تا دوو لاپەڕەی کوردییه ــ هەفتانەیه •
۸ ــ پاشکۆی بیری نوێ ــ هەفتانەیه •
۹ ــ گۆفاری ئاسۆی زانکۆیی ــ کوردیو عەرەبی‌یه ــ مانگانەیه •
۱۰ــ گۆفاری ڕۆژی کوردستان ــ ناوبەناوه •
۱۱ــ گۆفاری شۆڕشی کشتوکاڵ ــ ناوبەناوه •
۱۲ــ گۆفاری کۆلێجی ئاداب بەشی کوردی له بەغدا ــ ساڵانەیه •
۱۳ــ گۆفاری کۆڕی زانیاری کورد ــ ناوبەناوه •
۱٤ــ گۆفاری ڕەنجی کرێکار ــ ناوبەناوه •

## ١ ـ پەخشـــان :

ماوەیەکی زۆر پەخشان بەدەستی هەژارییەوە ئەینالآنو هەتا دوای شەڕی یەکەمی جیهانیش هەر چاك نەبوو • ئەمەش بەهۆی تێکەڵاوبوونییەوە بوو لەگەڵ ئەدەبی بێگانەدا • بەڵام لێرەوە کەلێك وەرگێڕان بە زمانی کوردی دەستی پێکردو بووە هۆی بووژانەوەو تازە بوونەوەو دەوڵەمەند بوونی موفرەداتی زمانی کوردی •

نووسینو بەسەرهاتی ڕۆژهەڵات ناسەکان دەربارەی کوردستان کەوتە دەستی خوێنەواری کوردو لەم نووسەرانەش :

| | |
|---|---|
| لۆرد کۆزن | Lord Gurzon |
| هۆبارد | Hobbard |
| میلینجن | Millignen |
| ریچ | Rich |
| فریا ستارك | Freya Stark |

ئەمانەو کەلێکیتریش •

هەروەها وتاری زانیاریو کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی تایبەتی زانیاریی پزیشکایەتیو هەروەها کەلێ لایەنی لاپەڕە گرنگو دەرکەوتووەکانی ئەدەبی جیهانی •

لەناو سۆڤیەتییەکاندا تەنها وەرگێڕانی ڕووسیو ئەرمەنی ماوەتەوە بەتایبەتی لە هەندێ بابەتی گرنگدا کە پەیوەندیی هەبێت بەکارل مارکسو لینینو ستالینەوە•• لەگەڵ هەندێ لاپەڕەی تردا کە هی پۆشکینو لیرمنتۆڤو تۆلستۆیو غۆرکی ، یاخود توامانیان ، هەروەها ئەبۆ لیانو کەلێ نووسەری ڕووسی یاخود

سۆڤیەتیی‌تر کە لە جۆرەها نەتەوەی‌تر بوون •

لە لوبنانیشـــدا هەندێ لـــە نووسراوەکانی ڤیکتـــۆر هۆگۆو دودیەو لامینە هەن‌و لە عێراقیش گەلێ بابەتی عەرەبی‌و ئینگلیزی وەرگێڕراون ، بەلاّم وەرگێڕەکان ئازایەتی‌و لێهاتوویی تەواویان نەبووەو هەمیشە لە کورتی بڕیویانەتەوە • لەڕاستیشدا ئەمانە بۆ وەرگێڕانی تـــەواو هیچ دووودڵییـــان نەکـــردووە ، بـــۆ نموونە (ڕەشەبا)ی شەکسپـــیرو (ڕاستگۆ)ی فۆلتێـــرو (پاڵتۆ)ی گۆگـــۆڵو (ژیانی سەلاحەدین)ی جـــۆرجی زیدان کە ئاساییشـــە ، ئەمەیان خۆشی‌و گرنگیی لەوانی‌تر زۆرترە • کوردەکان هەمیشە لەپاڵەکی مێژوودا خـــۆشی‌و ئاســـانی بـــەدی ئەکـــەن‌و لـــە مێـــژوونووســـە پێشینەکانیان (ابن اثیر الجـــزیری ۱۱٦۰ــ۱۲۳٤)و (ابن خلکان ۱۲۰۹ــ۱۲۸۲)لە هەولێرو (ابو الفدا ۱۲۷۳ــ۱۳۳۱) لەخێزانی سەلاحەدین بـــووە • ئەمانە هەموویان بەرهەمەکانیـــان دەربارەی مێژووی گشتی‌و بەزمانی عەرەبی نووسیویانە• لەساڵی۱۹٥٦داو بە زمانی فارسی (شەرەفخـــانی بەتلیسی) شەرەفنامەی داناوە کە مێژووی کوردە • ئـــەم بەرهەمە ڕەســـەنە وەرنەگێڕرا بـــۆ زمانی عەرەبی لەم دواییەدا نـــەبێ [مەلا جەمیل بەندی ڕۆژبـــەیانی]* لە بەغدا کردوویە بە عەرەبی‌و ساڵی ۱۹٥۳ چاپکراوە •

هەروەها لە ساڵی ۱۰٥۸ــ۱۹٦۲دا* لە قاهیرە (محمد عەلی عەونی ۱۸۹۲ــ۱۹٥۱)* وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی •

هەر محمد عەلی عەونی چەند بەرهەمێکی مێژوویی کوردیی تری کردووە بە عەرەبی‌و هەروەها بە شێوەیەکی گشتی کوردەکان

---

★ ساڵی ۱۹۱۲ لە گوندی (لورقان) لە کەرکووك هاتۆتە دنیاوە •

★ ئەم مێژووە وا نیە بەلکو (۱۹٥۸ــ۱۹٦۲)، چونکە بە گوێرەی ڕای مامۆستا هەژار لە شەرەفنامەدا ئەلێ ساڵی ۱۹٥۸ وەزارەتی پەروەردەی میسر چاپی کردووە •

★ ڕاستی‌یەکەی ۱۸۹۷ ــ تا ۱۱/تەموزی/۱۹٥۲ لە قاهیرە مردووە •

ئەم پاشماوە زانیارییە مێژووییەی خۆیانیان پشتگوێ نەخستووە* ۰

سێ نووسەری ... ... ... ئەکەین ، کە ئیشە گرنگەکانیان مێژووی کوردو کوردستانیان ڕووناك کردۆتەوە :

۱ ــ حسین حوزنی موکریانی ۱۸۸٦ــ۱۹٤۷ ۰

۲ ــ ئەمین زەکی ۱۸۸۰ــ۱۹٤۸ ۰

۳ ــ ڕەفیق حیلمی (۱۹٦۱)(۳۵) شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی گێڕاوەتەوە ۰

لە سالّی ۱۹۵۲دا دکتۆر نوری دەرسیمیو کولۆنێل عبدالعزیز یاملکی بە زمانی تورکی مێژووی دەرسیمیان نووسیوە ، هەروەها سالّی ۱۹۵۷یش باسی شۆڕشەکانی کوردیان کردووە ۰

بەلاّم محەممەد برێفکانی لە سالّی ۱۹۵۳داو مەعرووف چیاووك لە سالّی ۱۵۹٤داو ئیحسان مستەفا لە سالّی ۱۹٦۳دا دەربارەی جوولاّنەوەکانی بەرزانیان نووسیوە ۰

لە ئێرانیش مێژوونووسانی کورد (ڕەشید یاسەمی ۱۹٤۰)و (ئیحسان نوری ۱۹۵۵)و (محەممەد مەردۆخ کوردستانی) ئیشە مێژووییەکانی خۆیانیان بە زمانی فارسی نووسیوەتەوە ، ئەم بەرهەمانەش وەرنەگێراون هەتا لەم دواییەدا نەبێت کە دکتۆر موفتیزادە بەرهەمەکانی ڕەشید یاسەمیو ئیحسان نوریی کردووە

---

★ مامۆستا هەژار موکریانیش لە سالّی ۱۹۷۰دا شەرەفنامەی کردووە بە کوردیو سالّی ۱۹۷۲ کۆڕی زانیاری کورد چاپی کردووە ۰

(۳۵) ۱۸۹۸ــ۱۹٦۰ ڕاستییەکەیەتی ۰

به کـوردیو* له ســاڵی ۱۹۵۸دا محەممەد ﻧیـدا بەرهەمەکانی محەممەد مەردۆخ کوردستانیی کردووه به عەرەبی ٠

له ســاڵی ۱۹۵۹دا له یەریڤان [ن٠ محمود دوف] بـه زمانی ئەرمەنی پەڕاوێکی دەربارەی گەلی کورد چاپکردووه ٠

هەروەها ئەبێ باسی لێکۆڵینەوه ئاینیو کۆمەڵایەتیەکانی محەممەد موکری بکەین که به زمانی فەرەنسی دەربارەی حەقەکانی نووسیوه ٠

هەندێ لـه کوردەکان لەناوجـەرگەی کوردســتاندا گەشتو گەڕانیان کردووەو له گەڕانەوەیاندا لێکۆڵینەوەکانیان به دەست هێناوەو سەرگورشتەکانیان بـڵاو کردۆتەوه ، وەکو (عەلی سیدو لگۆرانی) له ساڵی ۱۹۳۹دا بەزمانی عەرەبیو (عەلادین سەجادی) له ساڵی ۱۹۵٦ بـه زمـانی کـوردی سەرگورشـتەکانیان بـڵاو کردۆتەوه ٠

بەڵام گۆران سەرگورشتەکەی خۆی دەربارەی گەشتەکەی به هەوراماندا‌و له ساڵی (۱۹۳۳)دا به شیعر بڵاو کردۆتەوه(٣٦) ٠

له ئەرمینیـای سۆڤیەتیش ، تەنهـا دوو نووسەر بـه نیازی بێدەنگییەوه هـەر بۆ پڕوپاگەندە ژیانی خۆیان نووسـیوه ، که گەلێ ڕێكوپێكو جوان بوون ٠ لەساڵی ۱۹۳۵دا (عەرەبی شەمۆ) شوانی کوردی داناوەو له (بەربانگدا Berbang ) کـه مـانای (الفجر)ە* بایەخێکی زۆری داوه بـه بیرو بڕوای شیوعیەت ٠ له

---

★ شاعیری کوردی بەناوبانگ مامۆستا قانعو مامۆستا کەریم زەند لەم دواییەدا [نەژادو پەیوەستەگی کورد]یان له فارسییەوه کردووه به کوردیو ساڵی ۹٦۹ له چاپخانـەی کامەرا ی لـه سلێمانی چابکـراوەو ئەمیش لـه نووسینەکانی ڕەشید یاسەمی‌یه ٠

(٣٦) ئەمەش پارچه شیعرێکی درێژه ٠

★ بەربانگ مانـای (الفجر) نیه ، بەڵکو بەو کاته ئەوترێت که لـه ڕەمەزاندا ڕۆژو ئەشـکێنن ، یاخود لـه کوردەواریـدا وا ڕاهاتـووه که بـه کاتی نان خواردنی ئێوارانی ڕەمەزان بوترێت بەربانگ ٠

سالی ۱۹۵۹دا ژیانی کامەرانی (الحیاه السعیده)ی نووسیوه که له ژێر دەسەلاتی سۆڤیەتیدا دەستی پێکردووە ۰

[وەزیر نادر] که له سالی ۱۹٤۷دا کۆچی دوایی کردووه (المثقف النمس)ی داناوه ۰ بەلام (ئەمین عەبدال) لەسالی ۱۹۵۷دا بە زمانی ئەرمەنی باسی خوو ڕەوشتی کوردەکانی قەفقاسی کردووه ۰

ڕەخنەی ئەدەبی هەر له نزیکەوه مێژووی ئەدەبیشی گرتۆتەوه۰ زۆر جاریش هەیە کە نووسین‌و ڕاپۆرتی سادەمان بەرچاو ئەکەوێ‌و کەچی هەر نرخی ئەدەبی خۆشیان هەیه ، لەوەی که (جەلادەت بەدرخان ۱۸۹۳ــ۱۹۵۱)، یونس رەوف دلدار ۱۹۱۷ ــ۱۹٤۳(۳۷) ، (جەمیل ڕۆژبەیانی) لێیان نووسیوه ۰ ئەوەی شایانی باسه (جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی) به شێوەیەکی تایبەتی گرنگی داوه بە شاعیرو نووسەرەکانی (زەنگەنەو کەللوڕ)و هۆزەکانی تری ئەو دەورو بەره ۰ (مەعرووف خەزنەداریش) پێشەکیی بۆ گەلێك نووسراوی شیعری نووسیوەو دەربارەی شیعری کوردیش لێکۆلینەوەیەکی باشی بلاو کردۆتەوه ۰

له ئەرمینیای سۆڤیەتی دوو ڕەخنەگری گەنج دەرکەوتن کە (عمریك سەردار)و (ئوردوخان جەلیل)و لەم ڕووەوه لەسەر ئەوه ڕێککەوتوون کە لایەنی سەرکەوتوویی بدەن بەنووسەری کوردی عێراقی عەلائەلدین سەجادی کە لە پێشەوه لەگەل کتێبه بەنرخەکەیدا (مێژووی ئەدەبی کوردی) سالی ۱۹۵۲ باسمانکرد، کە ئەمە پاشماوەیەکی ڕاستەقینەی زانیاریی ڕۆشنبیرییه ۰ ڕاستیشە کە پەڕاوەکە بێلەکەو کەموکووڕی نیه ، بەلام هەر ڕێگە ڕووناککەرەوەیەو به گوێرەی خۆی کۆمەلێك زانیاریی به

---

(۳۷) ڕاستییەکەی ۱۹۱۸ ــ ۱۹٤۹یە نەك ئەوەی سەرەوه ۰

نرخی تیایه • ئەمەش شێوەی نووسینی دانەرەکەیەتی :

لە سـەرەتادا ستایشی ئەو شاعیرە ئەکات کە ئەیـەوێ باسی بکات ، دوای ئـەوە کورتەیەکی ژیانی کە مێژوو ساڵەکانی تیا دیاری ئەکات بە جـۆرێ کە کاتو شوێنیان ڕوون ئەکاتـەوەو بە شێوەیەکی سادەیی بە بەرهەمەکانیان پاڵپشتی نوسینەکانی ئەکات، بە تایبەتی ئەوانەی کە هەتا ئێستا چاپ نەکراون • هەروەهـا هەریەکەیان بە جیا لێك ئەداتەوە ، ئیتـر زۆر جار هەر ئەمانـە خۆیـان وەرگێڕانێـکی ڕاسـتەقینەن ئەگـەر شـێوە زمـانی شـیعرەکان لە عیراقـدا زۆر زانـراو نـەبێت ، وەکو شێوە زمانی گۆرانی ، دوای ئەوە قۆناغە جۆراوجـۆرەکا ن لە بەرهەمی ئەدیبە باسکراوەکاندا باس ئەکات • ئێستا دێ نیە لە سەرباسی بەرهەمە ئەدەبیە ڕاستەقینەکان لە پەخشانو سەرگورشتەو چیرۆكو گێـڕاوە کورتەکاندا نەبێت • ئەمانەش هەتـا بڵێی زۆرنو بەشیزۆریشیان لەگۆڤاری جۆراوجۆردا بڵاو کراونەتەوەو لێرەدا گەنجەکان توانای هونەری خۆیان دەرخستوە • کوردەکان بە تەواوی دەستی باڵایان لەداستانی کورتو سەرگورشتەدا هەیە • ئیتر پێویستیش ناکات کە لیسـتەی ناوەکانیان بنوسـین چونکە زۆریان ناناسم • بەڵام لەوانەش وەکو : لەکوردەکانی عێراق :ــ (م • م • ئەمین)و(م • ت • وەردی)و(ك • أ • بابان)و(ج نەبەز) کە وەرگێڕێکی زۆر باشیشە ، هەروەها کەمێکیش لەوانە ئەناسم کە لە کۆنەوە لەو گۆڤارە کوردیانـەدا هاوبەشیان کردوە کە لـە ڕۆژهەڵاتدا دەرکەوتوون • وەکو (م• ئەی• بوتی) کە دەربارەی گیانلەبەر سەرگورشتەی جوان جوانی هەیەو هەموشیان پەندیان

لێوەر ئەگیرێت • هەروەها(قەدری جان*)کە هەستی خوێنەرەکانی ئەجوڵێنێو وایان لێ ئەکات کە بیروڕای تازە بابەت لەباسەکانی ئەمەوە وەربگرن • (دکتور نورالدین یوسف زازا )ش لە لۆزان باسێکی دکتۆرای دەربارەی شەخسیەتی موینیە Mounier پێش کەش کردو هەمیشەش سەرگورشتەکانی بۆنی نیشتمانپەروەری لێ هاتوە •

هەروەها بەتایبەتی باسی (عوسمان سەبری)ش ئەکەین کە هەندێ نوسینی مێژوویی دەربارەی ناپلیۆنو سەلاحەدین نوسیوە • بەڵام ئەمیش لەچیرۆکی شەڕو شۆڕدا زۆر چابوك بووە ، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە خوو ڕەوشتی هاولاتی یەکانی خۆی باس ئەکات • چیرۆکەکانی دەربارەی ڕاوکردن زۆر خۆشن ، چونکە شێوەی گێڕانەوەکەی سادەیەو ڕاستەو خۆ بیرەکانی دەرئەخاتو وا ئەزانێ کە بە سەرهاتەکان لەبەردەمانا ڕوئەدەنو من بە باشترین نوبەری ئێستای دائەنێم •

(جگەرخوێن)ی* شاعیریش لەسالی ١٩٤٦دا سەرگورشتەیەکی درێژی بلاو کردۆتەوە کە بەسەرهاتی هیچو پوچی نێوان ژنو مێردێکی گەنجی تیا گێڕاوەتەوە کە (ژینو گوڵپەری) بوون (Jin — GulPeri) ، لەوەدا کە ئەوەی بە سەرگورشتە داناوە بە هەڵەدا چوە •

بەڵام بە داخەوە لە ئەرمینیای سۆڤیەتی بە هیچ جۆرێك حەزیان لەپەخشان نەکردوە* لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر باسی حاجی

---

★ قەدری جان سالی ١٩١٦ لە دێیەك لە کوردستانی تورکیا لە دایك بووەو لە ئابی ١٩٧٤دا کۆچی دوایی کردووە •

★ لە گوندی (حەسار) لە سوریا لەدایك بووەو لەم سالانەی دواییدا کۆچی دوایی کردووە •

★ بۆیە حەزیان لە پەخشان نەکردووە چونکە خوێندەواری زۆر کەم تیابووە •

جندی ئەکەین کە لەساڵی ١٩٤٧دا (چرای تازە)و لەساڵی ١٩٥٩دا (چیرۆك دەربارەی گەلی کورد)ی نوسیوە •

بەڵام عەلی عەبدولڕەحمان لەساڵی ١٩٥٩دا (خاتو خاتێ)ی نوسیوەو لەوانەشە ساڵی ٩٦٠ بوبێ کە (ڕاپەڕینی) نوسیبێ •
هەروەکو شتێکی جوانو بەنرخ کە هەتا ئێستا وێنەی نیە باسی (ڕشتەی مرواری) ئەکەین کە لە بەرهەمەکانی نوسەری بەناوبانگ عەلادین سەجادیە کە لە(٣)* بەشدا (١٩٥٧ـ١٩٥٨) بابەتی داستانی ئەدەبیو سەرگورشتەو چیرۆکی کورت کورتمان ئەداتێ کە فەلسەفەو بیرو باوەڕو مێژووی تیا تێکەڵ کردون •

لەمانە هەموویاندا کە باسمان کردن ، بەوپەڕی سەلماندنەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە : ڕۆمانی ڕاستەقینە لە ئەدەبی کوردیدا نیە ، هەرچەندە هەندێ بەرهەمی جوانو گرنگیشیان هەیە ، هەروەها ئەبینین کە هەتا ئێستا شانۆشیان نیە ، هەرچەندە لەم ڕووەوە هەندێ هەوڵیان لەشێوەی پاراستنو بەخێو کردندا داوە ، بەڵام ئەوەش هەر قۆناغێکی باشی نەبڕیوە لەگەڵ ئەوەشدا کە بابەتی چیرۆكو شانۆگەریەکانیش کەم نەبوونو ئەتوانرێ کە لە مێژووی کوردا ڕەچاو بکرێن • بەتایبەتی هەر لە داستانو سەرگورشتەو ڕەخنە لە خورڕەوشتەکانیان وەکو ڕژێمە دەرەبەگایەتیەکانو مارەییو حاڵەتی ویژدانیو خۆشەویستیتر کە ئەتوانێ هەڵوێستی دەروونی تازە یاخود هەڵوێستی کۆمەڵایەتی دروست بکات • بەڵام ئەم گۆڕانە لە کردەوە ڕاستەقینەکانیاندا یاخود لە ئەفسانەکانیانداو لەڕاهاتنی عەقڵی لە ماوەی داهێنانی هونەری وێنەییدا هەوڵێکی زۆر تری پێویستەو ئەبێ دانەر زیاتر خۆی بۆ هیلاك بکاتو شارەزایی هەبێت لە

* تاکو ئێستا مامۆستا عەلادین سەجادی(٧)بەشی لەڕشتەی مرواری بڵاوکردۆتەوە

زانیاری دەرونو هونەری تەکنیکدا وەك لەوەی کە چوارینەیەك شیعر دابنێتو هەر ئەمەشە کە لەم کاتەدا کەمو کوڕی دروست ئەکاتو دەربارەی شانۆی عەرەبیش ئەتوانرێ هەر ئەم تێبینیانە تۆمار بکرێن ٠

۲ ـ شیعر : ـ

ئەو بیرو ڕایەی کە وا ئەزانێ شیعر بەرەو نەمان ئەچێت ، چونکە پەخشان نوسەکان مەیدانی ئەدەبی کوردیان داگیر کردوە هەڵەیە ٠ چونکە شێخەکان بەردەوام بوون لەدانانی شیعرە سۆفیانەکانیانداو زاناکانی تریش هەر بیروڕای تریان پێشکەش کردوە ٠ لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۲۰ وە هەتا ۱۹۳۹ بە تایبەتی لە عێراقدا بەرهەمی شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەهەم چاپ کران ، کە بەشی زۆریان دەستخەت بون ٠ هەروەها نووسینەکانی (مەحوی) ۱۹۲۲ ،(نالی ۱۹۳۱)،(کوردی)(۳۸)،(حاجیقادری کۆیی ۱۹۳۱)(۳۹)، (سالم) ۱۹۳۳ ، (تاڵەبانی) ۱۹۳۵ ، ئەدیب ۱۹۳٦ ، (حەریق)و (مەولەوی) ۱۹۳۸ هەر لێیان بلاو کرایەوە : وا دەرئەکەوێت کە شاعیرە کوردەکان حەزیان لەناز ناوی ماندار کردوە ٠

هەر لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك شیعری شاعیرە پێشینەکان بەهۆی (ئەمین فەیزی) ۱۹۲۰و (عەلی کەمال باپیر) ۱۹۳۸ و (مەلا عەبدولکەریم هەکزی) ۱۹۳۸و (ڕەفیق حیلمی) ۱۹٤۱ ـ ۱۹۵٦ وە بلاوکراونەتەوە ٠بەلام هەروەکو (مەعروف خەزنەدار) لەساڵی ۱۹٦۳ دا لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی خستینە بەردەست ، گۆڕان لەشیعری کوردیدا هەر سورە لەسەر کێشو قافیە ٠ وە شێوەی شیعری کۆن کە لەسەر یاسا گرێیاویەکانی شیعریعەرەبیو فارسی کۆنن بەرانبەر ئەکات لەگەڵ شیعری تازەدا کە لەڕوی

---

(۳۸) کوردی ۱۹۳۱ ٠

(۳۹) حاجی قادری کۆیی ۱۹۲۵ ٠

کێشی شیعری‌و نیوە شیعرو قافیەوە سەربەستی زیاتری تیایەو گەنجەکانیش ئەم شێوە تازەیان لا باشترە ٠

هەرچۆن بێت ، ئەگەر هاتو نوسینە هێمایییەکان سەراپا زۆر کەم دەست بکەون ، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر ون نابن‌و ناشارێنەوە ، هەتا ئێستاش کاکە حەمەی ناری (١٨٧٤ ـ ١٩٤٤) هەر بە خۆشەویستی‌و تەنهایی خوادا هەڵ ئەدات،سەرەڕای ئەوەش شاعیرەکان چی لەعێراق‌و سوریاو وڵاتی سۆڤیەت هەموویان لە سەر یەك ڕێ‌ڕەو نین ٠ ئەمانە لەشیعرەکانیاندا جاری وا هەیە گۆرانی ئەڵێن‌و جاری واش هەیە نیشتمانپەروەری تیا دەرئەبڕن، کەواتە جیا کردنەوەو بەش‌کردنیان ئاسان نیە ٠

پێش تۆزێك باسی مامۆستاکانم کرد ، کە بەشی زۆریان هەمیشە بەرهەمی فێرکردن لەشێوەی چیرۆکی گیان‌لەبەردا ئەنوسن ئەمەش لەسوریا عوسمان سەبری کردویەتی (کە خۆشی مامۆستا نەبووە) بەتایبەتیش لەناو دەستەی شاعیرە گەنجە تازەکانی سۆڤیەتدا ئوردخان جەلیل‌و ئازادو کارلین چاچانی بۆ قوتابیان ئەنوسن‌و لەناوەرۆکی نوسینەکانیاندا باسی خووڕەوشت ئەکەن ٠

شاعیرە ڕاستەقینەکان بەرهەمی شیعری گۆرانیان هەیەو گۆرانی بۆ خۆشەویستی‌و خێزان‌و جوانی سروشت‌و ئیشوکاری ڕۆژانە ئەڵێن ٠

لەسەرەوەی لیستەی شاعیرەکانی عێراقدا (پیرەمێرد)دێت کە کە (حاجی توفیق)ە (١٨٦٨ ـ ١٩٥٠) کە لە دەرونی گەنج‌و لاوەکاندا جێگای خۆی کردۆتەوەو خۆشەویستی خۆی بۆ جوانی نیشتمان‌و مێژووی کورد تەرخان کردووە ٠

هەروەها (زێوەر) کە [عبـدالله محمد]ەو (١٨٧٥ـ١٩٤٨) ئەمیش یەکێکی ترە کە گرنگیی بە لاوان داوە ، شیعرەکانیشی لە کاتێکدا کە ستایشی جوانیی سروشتو خاکی نیشتمان ئەکەن زۆر کاریگەرن ٠

بەلام [قانع]* کە (محمد شێخ عبدالقادر)ەو لەساڵی ١٩٠٠دا لەدایك بووە ئەمیش بەهەزارەها شێوەو لەپەراوی بچووكبچووكدا دیمەنە جوانەکانی نیشتمان باس ئەکات ، بە جۆرێك کە هەر لە ناوونیشانی بەرهەمەکانیدا پـاکیی دڵو دەروونی دەرئەکەوێت وەکـو : (گولاڵـەی مەریـوان ١٩٥١) ، (باخچـەی کوردســتان ١٩٥٢) ، (چواربـاخی پێنجـوێن ١٩٥٣) ، (شــاخی هەورامان ١٩٥٤) ، (دەشتی گەرمیان ١٩٥٥) ٠

شەخسیەتێکی تریش کە بە تەواوی جیاوازەو ناوی پێکەسەو (فائق عبدالله)یەو لە ساڵی (١٩٥٠ـ١٩٤٨) پیاوێکی ئازاراویو کلۆڵ بـووە هەروەکـو (ڤیرلـین)(٤٠) تەنهـا بـۆ شیعر ژیـاوە ، سەرەڕای کلۆڵیـەکەی لە ڕووی ســامانو ژیانەوە ، هــەر وازی نەهێناوە لە هوشیار کردنەوەو هاندانی لاوەکان بۆ تێکۆشان لە پێناوی دادپـەروەریو چاکـەو نیشــتماندا ، زۆر لـە شــاعیرە گەنجەکان بـە دڵگەرمییەوە لەســەر ڕێو شوێنی ئـەم پێشینانە ئەڕۆن ٠

---

★ لە ڕاستیدا قانع لە ساڵی ١٨٩٨داو لە دێی [ ڕیشێن ] لە بناری شارەزوور لە دایك بووەو لە ٧ـ٥ـ١٩٦٥دا لە دێی [لەنگەدێ]ی شلێری ناوچەی پێنجوێن کۆچی دوایی کردووە ٠

کۆچی دوایی کـردووە ، لەم ساڵانەی دواییشدا کـوڕەکانی (باشـەرگەی قانع‌و نامەی قانع‌و دیوانی قانع(یان لە بەرهەمەکانی چاپ‌و بلاوکردەوە ٠

(٤٠) ئەمە شاعیرێکی فەرەنسیی بەناوبانگەو عادەتا لەگەڵ (ڕامبۆ)ی شاعیردا باسی ئەکرێت ٠

هەروەها (شاکر فەتاح)* ، «نەریمـان» کە (مصطفی سعید حمد)ەو لە ساڵی ١٩٢٤ لە کفری لەدایك بووە ، (ڕەسوڵ بێزار گەردی)(٤١) کەساڵی ١٩٢٦ لەدایكبووە، هەروەها(کامەران)یش* هەر نووسەرو شاعیرن •

لە ئەرمینیای سۆڤیەتی کۆمەڵێکی باش هەن کە پێش ئەوەی بچنە ناو داتانو نووسینی بەرهەمی چاکەوە هەرچی داستانی کۆن هەیە نووسیویانەتەوە بۆ قوتابیان وەکو : (حاجی جندی) کە ساڵی ١٩٠٦ لەدایك بووە ، (ئەمین عەبداڵ) کە ساڵی ١٩١٠ لە دایك بووەو هەردووکیان مامۆستا بوونو هەمیشە شیعرەکانیان بابەتی قوتابخانەیان تیابـووە • بـەڵام لاموایـە کە (میکائیـل رەشید) گەنجترەو شیعرەکانیشی : (دڵم) لەساڵی ١٩٦٠دا زۆر ناسکن • لە ڕاستیشدا شیعرەکانی گەلێ ئاوازی جۆراوجۆری تیایەو پارچە شیعرە جوانە شەش خشتەکیەکانی پڕن لە تامو ناسکی • بەڵام بە شێوەیەکی گشتی شـیعرە ڕۆژهەڵاتیـەکانی تا ڕادەیـەك پڕن لە پەندی شوێمییەت •

(جاسم جەلیـل) کە ساڵی ١٩٠٨ لەدایك بـووەو نووسەیر ڕۆژنامـەی (Almanachs) بـووەو مانـای (کۆمەڵـە شیعری نووسەرە کوردەکانی سۆڤیەتە) ، بەرهەمە تایبەتیەکانی هەمیشە جێگای خۆیان کردۆتەوە ، لە دیوانێکی شیعری زیاتری هەیە وەکو (ئالەگەز Alagöz ) ساڵی ١٩٥٤ ، (ئەیامی) ساڵی ١٩٦٠ ، ئەمانە لە ڕووی بـەراورد کـردنی چاپـە جیاوازەکانـەوە زۆر

---

★ شاکر فەتاح لە ساڵی ١٩١٧دا لە شاری سلێمانی لەدایك بووەو ئێستاش هەر لە زیاندایەو ساڵی ١٩٧٧ لە دووەم دەورەی ئەنجومەنی پاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا بوو بە ئەندامو بوو بە جێگری سەرۆکی ئەو ئەنجوومەنەو ئێستا لە هەولێر دانەنیشێ •

(٤١) ڕەسوول بێزار گەردی ئەدیب نیە بەڵکو گۆرانی بێژێکی میللی بەناوبانگە •

★ کامەران لە شاری سلێمانی‌و لە ساڵی ١٩٢٩دا لەدایكبووەو ئێستا مامۆستایە لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی سلێمانی ــ بەشی کوردی •

قورس ، ئەمــەش بەهۆی ئەو پیاچوونانەوەیە کە هەمــوو جارێ دووبارەیان ئەکاتەوە ، جاری واهەیە بیستجار ئەیاننووسێتەوە، ئەمەش نیشــانەی ئەوەیــە کە هەســتێکی چاکی بــە لێپرسینەوە کردووە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەمیشــە ئاوازو کێشی شیعری لەو دووبەشەی دواییدا تەواو نین ئەو هەر لە پێناوی هەستی شاعیریدا کە بە شــێوەیەکی ئاسان دەری‌بهێنێ شتی وای دەرهێنــاوە کە تا رادەیەك باش‌نین هەر وەك ئەم وتەیەی کە لەدەستگیرانەکەیەوەیە:

من گوڵێکی کێویم ، هێشتا غونچەی نەکراوەم
ڕۆژو شەونم پاکیی خۆیانم لێ‌ئەدەن
ئەگەر تۆ دەستم لێ‌نەدەی
ئەوا من هەرگیز ناکرێمەوە
ئەگەر دەستم لێ‌نەدەی
ئەوا ئیتر من گوڵاو نارێژم
من گوڵێکی کێویم ، من گوڵێکی شاخاویم
دوور لە تۆ !
خۆشەویستی بە لێك‌نزیك‌بوونەوە ئەکرێتەوە
خاکی ڕەگ‌وڕیشەم بە خۆشەویستی نەرم بکە
ئەگەر دەستم لێ‌نەدەی
ئەوا ئیتر ناکرێمەوە
ئەگەر دەستم لێ‌نەدەی
ئەوا ئیتر من گوڵاو نارێژم
من گوڵێکی کێویم ، من گوڵێکی شاخاویم
دوور لە تۆ !
ئەی باخەوانی چالاك ، ئەی گوڵ خۆشەویست
وەرە بمکەرەوەو بمبە بۆ سەر شاخ

ئەگەر ئازایت دنیتو ئەمبەیت
ئەوا ئیتر من وەکو ژنێکی تازە بۆت پێئەکەنم •

هەروەها ئەمیر کامەران بەدرخان ، سەرەڕای بەرهەمەکانی لە زمانەوانیو ئیشوکاری سیاسیدا ، لە شیعریشدا هەر دەستی هەبوەو گەلێك دیوانی لەچاپ داوە وەکو :

(قلب الاطفال) ١٩٣٣ کە بۆئەوەی داناوە قوتابیانی قوتابخانەکان کەلکی لێوەربگرن • (جلید النور) ١٩٣٥ ئەمیش کراوە بە فەرەنسیو ئەڵمانی • (رباعیات خیام) ١٩٣٨ کە پێکەنینی زۆری تیایە • هەروەها ئەو شیعرە ئاوازییانەی کە باسی خۆشەویستی ئەکەن • زۆر بە ناسکی لە هەستاو ، ڕەسەنایەتی لە تێڕوانینو بەختیاریش لە لێکدانەوەدا دایناوون • بەڵام لەپاڵ ئەم هۆنراوانەیشدا کە بە شێوەی هەڵبەستی گۆرانی دائەنرێنو پاسایەکی تایبەتی خۆی هەیە ، پێویست ناکات سەرمان سوڕبمێنێ ئەگەر بەرهەمی ترمان بینی بەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە بەسترابێت •

هەموو کاتێك هەر شاعیر پەیامبەری ڕاستەقینە بووە بۆ مژدە دان بە تازە بونەوەو هەر ئەو ڕەخنەی لەچەوسانەوەی کۆن گرتوەو هەوڵی بەختیاری پاشەڕۆژی داوە •

ئەو لێکۆڵینەوە داهاتوانەی ناو سۆڤیەتیەکان بە زۆری ئەوەیان ڕەچاو کردوە کە لەپێش هەموو شتێکدا ئەبێ ئافرەت ڕزگار بکرێتو ڕادەیەك بۆ دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی دابنرێتو هەوڵ بدرێت کە بیرو بڕواو کرداره ئاینیەکان لەناو ببرێن ، ئەمانە هیچ دیوانێکی شیعریان نیە ، کە نیشانە بێت بۆ سوری نوسەرەکان لەسەر ئەم بابەتە جۆراو جۆرانە •

لەچوار خشتەکیەکانی(عەتار شرۆ)دا (Etar charo) چارەسەری هەڵوێستە کۆنەکانی کوردەکان کراوە • وەکو نەزانی ، ناڕەحەتی زۆرداریو گەلێك جاریش گەڕانەوە بۆ مارەیی ، نیشانەکانی

بەندایەتی کە ئەبێ نەهێلرێت ، هەروەهـــا ئەمەش پیاهەلداتێکی ترە کە لای هەندێ لەشاعیرەکانی تردا هەیەو ماوەش ئەدەن بەوەی وا دابنرێت کە لابردنیو نەهێشتنی خوورەوشت شتێکی قورسو گرانە ٠

هەروەهـــا (یوسف بەکۆ)ی (Usiv Beko) شـــاعیریش لە شیعرەکەیدا بە ناوی (بەختیاری) شێوەی نزم بونەوەو نالەباری هەلویستی کۆمەلایەتی کە قوربـــانی هەتا هەتایی هەژاری رون کردۆتەوە٠ بێ ئەوەی بەرەو ڕوو لەبەردەم زۆرداریی دەولەمەندو بازرگانیدا هیچ بەرگریەك بکات ٠

(حاجی جندی ـ ) شاعیری بیروڕای دژایەتی چینایەتی لەدژی زۆرداریو دەرەبەگایەتی کە سنوری نیە پێشنیـار ئەکات ، کە ئالۆزانی بەرگری کـــردن لەلایەن زۆر لێکـــراوەوە کۆتایی دێت ٠ بابەتی هەلبەستە درێژەکەشی بەناوی (گولی زەر Gulizer )هەر ئەوەیە ٠

بـــەلام خۆشەویســـتیەکەی بە بەرگە گرتنی داگیرکـــەرانو دەرەبەگایەتیو تۆلەســـەندنی هۆزەکانو داخوازیەکانی مارەییو ستایش کردنی جەنگە نەتەوەییو ئازادی خوازەکان کۆتایی دێت٠ هەروەکو (وەزیر نادر) لەشەڕو شۆڕەکاری گەرەکەی (نادو گولی زەر)دا بە گۆرانی ئەیلێت ٠

لەعێراقدا (گۆران) عبدالله سلێمان ١٩٠٤ ـ ١٩٦٢ شێوەی شـــیعری کۆڕیو داهێنـــەرو بلاوکەرەوەی شیعری (حور) بووە ، هەروەها لە پالپشتەکانی سەربەستی بیرو ژیان بووە* ، هەر ئەم

* گۆران هـــەروەکو شیعری (حر)ی وتـــووە شیعری کلاسیکیشی هـــەر وتووەو رابەری دوو قوتابخانەی شیعری بووە ، رۆمانتیکیو ریالیزمی ٠

بووه که گەلێ گۆڕینی کۆمەڵایەتی بە لای چاکەدا داهێناوەو هەر ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی گەلی کورد وا لێبکات کە سەربەستانە بیر بکەنەوەو هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵبنێن • نرخی ئەم باسەشی لە بەندیخانەکانی بەغدادا داوەتەوەو هەر لەوێش شیعرێکی بە ناوی ١٤ی گەلاوێژ داناوەو شیعرەکەشی لەسەر خۆپیشاندانە میللیەکان داناوە کە بەهۆی ئەو ڕۆژە مێژوویییەوە ئەیان کردو ئەو ڕۆژەش بوە کە چەرخێکی تازەی بۆ کوردەکان هێناوەتە کایەوە •

(جگەر خوێن*) کە (شێخ موسا حسن)ەو لەساڵی ١٩٠٣دا لەدایك بووە سەرۆکایەتی کاروانی شاعیرانی کرمانجی ژووروی کردووەو هەر بیرو ڕاکانی گۆرانی هەبووە ، بەڵام ئەو پەڕی گرتوە ، وەك لەدیوانەکەیدا لەساڵی ١٩٥٤ بە ناوی (شۆڕشی سەربەستی) بـە باوەڕەوە هاوار ئەکاتو ئەڵێ :ــ ڕزگار نابین هەتا لە باکورەوەو بە ئاگـاداریی سـۆڤیەت دەست پێنـەکەین ، هەروەهـا ئەمیش ئازاری بەندیخانەکانی سوریای چێشتووە •

ئایا ئەبێ باسی شیعرە نیشتمانیەکان بکەین ، ئەمانە زۆرنو لە ژمارە نایەن ، بەڵام تێکەڵوپێکەڵن ، چونکە لاسایی شیعرەکانی (میریلتون Miriliton )و (دیرۆلید Deroulede ) ئەکەنەوە • هەمیشەش لە هەڵبەستە گڕاویەکانی (ڤیکتۆر هۆگۆ V. Hugo) ئاسانترن •

شیعری خۆشەویستیو نیشتمانپەروەری ، شیعری کوردستان پەرستن هەر لە کۆنەوە ڕەوشتی خانەدانییان تیابووە ، تەنانەت هەر لەسەردەمی (ئەحمەدی خانی) خۆیەوە شێوەکەشی لەشیعرە دڵ

* جگەرخوێن لە سوریاو قەدریجان لە تورکیاو قانع لە عێراق بە شاعیری ناو گەلو میللیو چەوساوەکان ئەناسرێنو هەرسێکیان بەرانبەر یەك ئەوەستنەوە

گەرمیەکانی «نالیو حاجی قادری کۆیی»دا چەسپێنراوە لە عێراقدا پارێزگاری جیهانی ئەو جۆرە شیعرە کلاسیکیانە کراوە بەپارمەتی (مەلا حەمدیی ساحبقـەران ١٨٧٦ـ١٩٣٦)و (ئەحمەد موختار ١٨٩٧ـ١٩٣٥) کە هەنگاوو ڕێڕەوی هەموو گەنجەکانی لەسەر ڕۆیشتووە .



# دوواوشەی وەرگێڕ بۆ عەرەبی

## دوا وشەی وەرگێر بۆ عەرەبی

ئاشکرایە کە هەموو بەرهەمێکی ئاکادیمی هەرچەندە بگاتە ئەوپەڕی تەواوی‌و ڕێك‌وپێکی هەر ناتەواویی تیایە . ئەم باسەش سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی کە دانەری بەڕێز بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستنی بابەتەکان داویەتی‌و هەروەها هەوڵی دڵسۆزانەی بۆ بەدەستهێنانی ئەو زانیاریانەی کە ڕێگای خوێنەری بەڕێز ڕوون ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بە باشترین زانیارییەوە ئەم پەراوەیان پێشکەش بکات کە هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەو گەلەی تیابێت کە لە دواڕۆژدا هاوبەشە لەگەڵیداو لەوانەشە کە هەر نەزانراوبێت یاخود لە شێوە ڕاستیەکەیدا نەناسرابێت ، بەڵام هێشتا هەر ناتەواوەو زانیاریی بەنرخی کەمە ، با ئیتر هەڵەی نووسەر خۆیشی لەولاوە بوەستێ ، ئەمەش لە گرنگی‌و هەوڵی ڕۆژهەڵاتناسەکان کە لەم مەیدانەدا ئەیدەن کەم ناکاتەوە ، هەر ئەمەش ڕێگای ئەوەمان لێ ناگرێت کە ڕەخنەیان لێ بگرین‌و هەڵەکان ڕاست بکەینەوەو بڕوا بە ناڕاستەکان نەکەین .

لە ڕاستیدا ئەم پەڕاوە لەخۆیدا کارێکی گاڵتە پێ نەکراوە ، چونکە بەرهەمی بەکەڵکی نووسەرێکی تیایە کە هەر لەسەرەتاوەو

بە شێوەیـەکی تایبەتی گرنگیی بە گەلی کورد داوەو گـەلێ باسی دەربارەی زمانو ئەدەبو مێژوو و ئایینو ڕەوشتی تایبەتیان لە گۆڤارەکانی ڕۆژھەڵاتدا بڵاو کردۆتەوەو ھەر لە ساڵی ١٩٢٧ەوە کە نێرراوە بۆ ڕۆژھەڵات ئیتر دەستی پێکردووە ٠

ئەو ھەوڵـەش کە بۆ وەرگێڕانی ئەم پەراوە داومـە لەپێش ھەمووشتێکدا ئەرکی سەرشانی خۆم بووە بەرانبەر بە ڕۆڵەکانی نیشتمانەکەم ، لەکاتێکدا کە زانیومە پڕیەتی لە زانیاریی بەکەڵك بەڵام شـانازیشم ئەوەیە کە ئیشـێکە شایانی ھـەوڵو خۆھیلاك کردنە ٠

لێرەشدا ئەوەم لەبیر ناچێت کە سوپاسی ئەو بەڕێزانە بکەم کە لەم ھەولەمدا یارمەتییان داومو بەتایبەتی بەڕێز بەڕێوەبەری گشتیی ڕۆشنبیری کوردی ٠

ئــاواز



# ناوەرۆك

